# کورد

## لێکۆڵینەوەیەک
## لە کەلتووری ماددی سەردەمدا

عەبدوللا غەفور

هەولێر - ٢٠١١

# کورد

## لێکۆڵینەوە لە کولتووری مادی سەردەم

دکتۆر عەبدوڵلا غەفور

هەولێر - ٢٠١١

* ناوی کتێب: کورد لێکۆڵینەوە لە کولتووری مادی سەردەم.

* نووسین: دکتۆر عەبدوڵڵا غەفور.

* تایب: نووسەر.

* نەخشەسازی بەرگ: عوسمان پیرداود .

* دیزاین: عیسام موحسن.

* بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، ژمارە(١٢٩).

* چاپخانەی حاجی هاشم – هەولێر.

* تیراژ: ٥٠٠ دانە.

* لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی(      )ی ساڵی ٢٠١١ی پێدراوە.

# ناواخن

**وێنەکانی بابەتی سێیەم**

**وێنەکانی بابەتی پێنجەم**



**وێنەکانی بابەتی شەشەم**

## بەرایی

کاری بەردەست، لێکۆڵینەوەیێکی مەیدانیییە لە کولتووری مادی کورد لە رۆژی ئەورۆدا. واتە گشت زانیاریەکان ئەوانەن کە خۆم، لە شوباتی ساڵی دوو هەزار دە بۆ شوباتی دوو هەزار یازدە لە شوێن (شار و گوند. دەشت و چیا) و خەڵکی ( ڕەوەند. فەلاح. وەستا) جوداجودا بینیومن و بیستوومن و نووسیومنەتەوە.

ئامانج لە نووسینی ئەم کارە زانیستییە مەیدانیییە خۆی لە چەند خاڵ دەبینیتەوە: پاراستنی ئەوەندە کولتوورە مادییەی کە تاکو ئەورۆ، لێرە و لەوێ، ماون. ئاشناکردنی کورد بە کولتووری مادی نێوچەکانی دیکە. بە نموونە، هی گەرمیانییەکان بە سۆرانییەکان و بادینییەکان و هی ئەمانەش بە ئەوان. زیندووکردنەوەی، ئەوانەی ساڵانێکە، لە ئاخەفتندا بەکار نایێن. ئاشناکردنی نەوەی ئێستا و ئەوانەی بە دواوەیان دێن بە کولتووری مادی باوباپیرانییان. بەکارهێنانی زاراوەکانی کولتووری مادی بۆئامرازەکانی تەکنیکی سەردەم. ڕاستکردنەوەی ئەو بیروبۆچوونە هەڵانەی کە لە لیتراتوورەی خۆمانی و بیانی بەر چاو دەکەون. ئەنجامدانی توێژینەوەیێکی کۆمپلێکسی لە لایەن کوردەوە. بۆ ئەوەی چیتر، بۆ شیکردنەوەیێکی دیاردەیێکی کولتووری، ئاماژە بە بیروبۆچوونی غەیرە کورد نەکرێت.

لێکۆڵینەوە لە کولتووری مادی کورد، وەلێ هەندێک بابەت تێروتەسەلتر لە هەندێکی دیکە، لەسەری نووسراوە، یەکێکە لەو بابەتە زانستیانەی، کە دەمێکە سەرنجی نووسەر و توێژەرانی کوردستانی وەکو علادین سجادی (رشتەی مرواری) و غەیرە کوردستانی وەکو: شاکر خصباك (الاکراد دراسة جغرافیة ـ اثنوغرافیە) مینۆرسکی ڤ. (کورد تێبینی وردبوونەوە). نیکیتین ڤ. (کورد و کوردستان توێژینەوەیێکی سۆسیۆلۆژی مێژوویی). ئاریستۆڤا ت. ف. (کولتووری مادی و گیانی کورد) بۆ لای خۆی

باڵکیش کردووه. له ئەنجامی کارەکانییاندا، هەندێک زانیاری کۆکراونەتەوه و شیکراونەتەوه به شێوەی کتێب یان وتار له کوردستان و وڵاتانی دیکه بڵاوکراونەتەوه. هەر یەک لەو کارانه، بۆ کاتی خۆیان و له شوێنی خۆیان، بایەخی زانستی خۆیان هەبووه. وەلێ، لەبەر ئەوەی له رێگەی زمانزانەوه کارەکەیان نووسیووه، هەندێ هەڵه له ناوی جوگرافی و ئامێر و کەرسته و شتمەک، رووی داوه. چەند جار، لەگەڵ ئەوەی به کوردی دەپرسم و به کوردیش وەڵام دەدرێمەوه، هەڵەم کردووه.

کولتووری مادی، هەندێ بابەتی زیاتر له بابەتی دیکه، به نموونه کەرستەی جۆت و خشڵ و ئارایش، باسی لێوەکراوه. ئەو بابەتانه، وەکو پێدەچیت، زیاتر له هیدیکه لەبەر دەست دانن و ماندووبوونیشیان کەمتر بوێت.

کولتووری مادی کورد، تاکو ئەو کاتەی لێی نەکۆڵدراوەتەوه، به کارێکی ئاسان دێته بەرچاو. وەلێ که دەستی پێکرا ئەوجا روون دەبێتەوه که توێژەر رووبەرووی چ کارێکی سەخت و ئاڵۆز و دەوڵەمەند و شاراوه بووەتەوه. ئەگەر تەنیا باسی زاراوەکان بکرێت، ئەوه دەگوترێت جیاوازییان له جیاوازی نێوچەکان کەمتر نییه. به نموونه، فەرشه(له هەولێر) = پنه (له سلێمانی) = خانک(له نێوچەی مزوری). تەشتی هەویر(له هەولێر) = شکەف(له نێوچەی مزوری).

ناوی شته مادییەکان و ئاژەڵەکانم به شێوەی هەولێر نووسیووه. وەلێ ناوی شوێنەیکانی دیکەم، هەڵبەته ئەوانەی زانیومن، پشتگوێ نەخستووه. به نموونه، فەرشه(پنه). کێشکه (چۆلەگه. پاساری). کودی (کودو. کولەکه) ئیتر بەو شێوه چوومەته دووێ.

کارەکەم بەو زمانه نووسیوه که شته مادییەکانی پێ باسدەکرێت. ئەوەش، بۆ خۆشتر و ئاسانتر له شتەکان گەیشتن و پاراستنی زمانی کولتووری مادی بووه.

بەمەبەستی خۆ له نووسینی ساڵ به دوورگرتن له جیاتی دوو هەزار و ده پار نووسراوه و له شوێنی دوو هەزار و یازده ئەمساڵ نووسراوه.

کاری بەردەست لە شوباتی دوو هەزار و دە وەکو پرۆژەیێکی زانستیی، لە لایەن منەوە، بە مەبەستی پشتگیری کردنی مادی، بە ئەکادیمیای کورد دراوە. ئەوانیش دوای دوو سێ حەوتە، وەکو پرۆژەکە "ئاسوورییەکانی باشووری کوردستان لێکۆڵینەوەیێکی ئەتنۆ- جوگرافی" ی پارم پەسندیان کرد و بە گشت مەرجەکانم رازی بوون.

ئەکادیمیای کورد بە سەرۆک (دکتۆر شەفیق قەزا) و جێگری سەرۆک (مامۆستا رشید فندی) و سکرتێری ئەکادیمیا (دکتۆر ئازاد احمد) وە، ئەوەندە پارەی بۆ تەواوکردنی کارەکەم پێویست بوو لەبەر دەستییان نام. ریزم بۆیان هەیە.

**دکتۆر عەبدوللا غەفور**
**مامۆستا لە زانکۆی سەلاحەدین - هەولێر**
**٢٠١١/١٢/ ٥**

# سەربابەتی یەکەم
## فەلاحەتی

بەر لە باسکردنی کشتوکاڵ، بە مەبەستی روونکردنەوە و ئاشنا بوون، بە باشی دەزانم، هەندێک لە زاراوە کشتوکاڵییەکان ، کە ئەورۆ بەکار دەهێندرێن، روون بکەمەوە.

**خاوەن موڵک**

کەسێکە تاپۆی پارچە زەوییێکی، لە فەرمانگەییێکی دەوڵەت، بە ناوە. بە ئارەزووی خۆی تێکەولێکەی وەکو چاندن و بە ئیجاردان و بەنیوەیی و هێشتنەوەی بە بەیار و فرۆشتن و لەقەبەڵکردن و بەشینەوە بە زەوییەکەی دەکات.

**فەلاح(جوتیار. کشتکار)**

کەسێکە کشتوکاڵ، لە زەوی خۆی یان لە هی کەسانێکی دیکە بە ئیجار یان بە بەش یان تاپۆ، بکات.

**کرێکاری کشتوکاڵ**

کەسێکە، بە مانگانە، کاری وەکو ئاودان وباخچە بەرهەمهێنان و بێستان کردن و داچاندنی تەماتە و باینجان، بۆ خاوەن موڵک بکات.

هەندێک لەو کەسانەی کە سی ساڵیک بەر لە ئەورۆ کاریان لە کشتوکالدا دەکرد ئەمانەبوون: کیشەکەر. جوتیار. سەپان. پاڵە. شەغرەکیش. جەنجەروان.

**زەوی کێڵان**

زەوی بۆ ئەوەی کشتوکاڵی لێ بکرێت، بەر لە تۆدان یان چەقاندن یان پێوەکردن، دەکێڵدرێت. ئەوەش بۆ ئەوەیە تاکو رووەکەکە، دوای شین بوون، بە ئاسانی رێشە دابوکتی و کاتی باران بارین یان ئاودان ئاو بخواتەوە.

زەوی بەیار سەرەتا شۆ(خرتە) دەکرێت. پاشان تۆ دەدرێت. ئینجا وەرد دەدرێتەوە.

زەوی کێلان، لە رووی بەکارهێنانی کەرستە و ماوەی کێلانی یەک دۆنم زەوی و ماندووبوون، بە دوو شێواز ئەنجام دەدرێت.

**یەکەم . شێوازی ترادیسیۆنی**

جوتیارەکان بە هێستر و کەر و گا جۆت دەکەن. بەکارهێنانی هەر یەک لەوانە، بەندە بە چەشنی زەوی (بەردەلان، تەخت، ڕک) و رووپێو (کەم و زۆر) و موڵک و هەبوونی(دەست ڕۆیی) ی موڵکدار و ئەزموونی مێژوویی و... هتد

**زەوی کێڵان بە هێستر(ئێستر)**

بە کارهینانی هێستر بۆ جۆتکردن، لەبەر فرەوانی رووپێو و تەختی زەوی، لە نێوچە دەشتاییەکاندا، چەند ساڵێک لەمەو بەر دیاردەییێکی ئاسایی بوو. وەلێ ئەوڕۆ، لەبەر پەیدابوونی تراکتۆر و سیستی هێستر، رەنگە نەمابێت. لە هیچ شوێنێکیش بەر چاوم نەکەوتووە.

جۆتە هێسترێک لە رۆژێکدا، دوو سێ ئەوەندەی جۆتە کەرێک، زەوی جۆت و خەتەکانیش قولتر دەکات. جوتیار، لەبەر ئەوەی ماچە لە نێرەکی بە تاقەت تر و بڕترە، کەمتر نێرەکی لە جۆتکردندا، بەکار دەینیت.

**زەوی کێڵان بە کەر**

بەکارهێنانی کەر بۆ جۆتکردن، لەبەر بچووکی و ڕکی و بەردەلانی زەوی بە کەر، لە نێوچە شاخاوەیەکاندا، بۆ خەڵکەکە کارێکی ئاساییە(وێنەی ١).

جوتیارەکان،لە جیاتی جۆتە کەرێک، یەک کەر ڕادەگرن. کاتی جۆتکردنیش ئەم لەو و ئەو لەم دەخوازیتەوە. ئەوە لە دوو سەرەوە بۆ جوتیار قازانجە، یەکەکییان دەست بە پارەگرتنە و ئەوی دیکەیان شوێنیکی بچووک و کەمتر ئالێک و ئاودان و گواستنەوە لە شوێنێک بۆ شوێنێکی دیکەیە. جۆتکردن بە نێرەکەر، لەبەر ئەوەی لە ماکەر بەتاقەت ترە، دەکرێت. ماکەر، ئەگەر چارە نەبێت، دەنا جۆتی نە بەتەنیا و نە لەگەڵ نیرەکەر پێ ناکرێت. ئەو جارانەش کە پێی دەکەرێت، لە رووی کۆمەڵایەتییەوە، بە گران لەسەر خاوەنەکەی دەکەویتەوە.

**زەوی کێڵان بە گا**

جوتیارەکانی گوندەکانی نێوچە شاخاوییەکان، بە تایبەتی ئەوانەی دۆڵی سمیلان و شارۆش و باڵەیی و جافاتی، لەبەر بچووکی و سەختی موڵکەکانییان، جۆتی بە جۆتە گایێکی هاوتەمەن یان کەمیک لێک بچووکتر یان گەورەتر(گایەکانی جوتیارێکی گوندی هەرتەل هەشت بە چوار ساڵ بوون) دەکەن(وێنەی ٢).

جۆتکردن، هەر ئەوە نییە، گایەکان دابەستی و جۆتییان پێ بکەیت. جوتیار دەبێت ئاگای لە گایەکان بێت گاسن لە پێییان نەدات. خەتەکان، چەندی بکرێت، ڕاست بن. کاتی بادانەوە بە دەنگی بیستن هۆ هۆ ئۆحە لە گایەکان بکات. کاتی گای سەر عەردی نەکێڵدراو دێتە ناو عەردی گێڵدراو پشت پشتی لێ بکات.

**زەوی کێڵان بە هێستر و کەر**

جوتیارەکان، چی ئەوانەی نێوچە شاخاویەکان و چی ئەوانەی دەشتاییەکان، ئەو جارانەی جۆتە هێسترێکی پێ پەیدا نابێت و جۆتەکەش دەبێت بکرێت، هێسترێک و کەرەکی، لە چۆتی دەکات.

**زەوی کێڵان بە پێمەڕە و پاچ**

جوتیارەکان، ئەوانەی زەوییەکانییان لە شوێنێکی سەختدان یان گاشە بەردیان تێدایە یان ئەوەندە نییە بۆ جۆتکردن بشێت، بە ئامرازی دەستی وەکو پێمەڕە و پاچ زەوییەکانییان دەکێڵن. ژنان هاوبەشی لەو جۆرە جۆتکردنە دەکەن. هەندێ کەرەت هەر ئەوان کارەکەی ئەنجام دەدەن.

**دووەم. شێوازی سەردەمیانە**

جوتیار زەوییەکانی، لە باتی هێستر و کەر و گا، بە مەکینە دەکێڵێت. تراکتۆر، وەکو ئامرازی کێڵان، لە پەنجایەکان زەوی جوتیارەکانی دیبەگەی کێڵاوە.

زەوی کشتوکاڵی، ئەگەر رووپێوەکەی گەورە بێت، بۆ ئەوەی بە رێکوپێکی تۆ بکرێت بۆ لات دابەش دەکرێت. پانی لات لە گوندیک بۆگوندێکی دیکە وەکو یەک نییە. بە نموونە، لە گوندی جولحان سێ خەرماشە و نیوی نۆ گاسنیە. جوتیار بە دوو شێوە تۆیەکەی تۆ دەدات:

**ترادیسیۆنی** ـ هەمان ئەو شێوازەیە کە بەر لە سەدان ساڵ لای باوباپیران باو بووە. تۆدەرەکان تۆی لە ئامرازی جودا دەکەن. بە نموونە، ئەوانەی لە گوندان بینیومن ئەمانە بوون:

**توورەگە** ـ بریتییە لە جۆرکێک( شێست و پێنج بە شێست سم) ی لە گوشی نایلۆن دووررواوە. پارچە کندرێکی(سەرێک لەم لا و سەرێکی لەو لا) لە دەوەکەی دووررواوە. تۆدەر، تۆی(گەنم . جۆ) تێدەکات و لە ملی دەکات. دەستی لە توورەگەکە ڕادەکات چەنگە تۆیەکی دەردەێنێ و بە رۆیشتنەوە، هەڵیداوێت. ئەو کارە دووبارە دەبێتەوە تاکو تۆیەکە تەواو دەبێت.

**بەرامپیل** ـ بریتییە لە پارچە قوماشێکی لاکێش( هەشتا بە حەفتا سمانتیمەتر) ی. تۆدەر، دوو لچکان( لای سەرێی یان لای خوارێی) لە پشت ملی گرێدەدات. دوو لچکەکەشی دیکەش بە دەستی چەپ دەگرێت. تۆدەر، تۆی لە بەرامپیلەکە دەکات و دەستی تێڕادەکات. چەنگە تۆیەکی دەردەێنێ و بە رۆیشتنەوە، هەڵیداوێت. تۆدەر کاتی تۆدان لاقەکانی یەک بۆ پێشەوە و یەک بۆ پاشەوە لێک دەکاتەوە، بۆ ئەوەی سنووری تۆیەکەی لێ تێک نەچیت، تەماشای پێش و پاشی خۆی دەکات. ئەو کارە دووبارە دەبێتەوە تاکو تۆیەکە تەواو دەبێت.

**مۆدێرن** ـ تۆ لە کۆلی تۆدەری مەکینە(بەزارە) دەکرێت. تۆدەر لە پشتی تراکتۆر دەخرێت. تراکتۆر، تۆدەرەکەی لە دووخۆ، بە ناو لاتەکان، ڕادەکێشیت.

**دروێنەی**

گەنم و جۆ و برنج و دانەوێڵەی دیکەی لەو چەشنانە، دوای زەرد بوون بیان(پێگەیشتنییان)، لە مایس بە دواوە، بە شێوازی جودا، دروێنەی دەکرێت.

**دروێنەی بەداس** ـ جوتیارەکانی نێوچە شاخاویەکان، بە نموونە ئەوانەی گوندی کۆیلێ، لەبەر ئەوەی رووپێوی زەوی چێندراویان بە دانەوێڵە زۆر نییە و کۆمباینیان بۆ ناچێت، بە داس گەنم و جۆیەکانیان دروێنەی دەکەن.

جاران جوتیارەکان کە دروێنەیان بە داس دەکرد، بۆ ئەوەی پەنجەکانیان نەکەونە بەر دەمی داس و بیان بڕێت و سوارە گەورەتر بێت قەیناغیان (چوار کیفکی تەنەگەی سەر بە نووک) لە پەنجەکان دەکرد یان بە هەمان مەبەست پەنجەی بابەلیجە و لەندەهۆریان لە تەختە(تەختۆکە) هەڵدەکێشاو دورنەیان دەکرد.

**دروێنەی بە مالاغان** ـ جوتیارەکانی نێوچە شاخاویەکان، بە نموونە ئەوانەی گوندی بارێی بچووک، لەبەر ئەوەی رووپێوی زەوی چێندراویان بە دانەوێڵە زۆر نییە و کۆمباینیان بۆ ناچێت، بە مالاغان جۆ و گەنمەکانیان دروێنەی دەکەن.

**زبارە (دەستەوا. هەرەوەز)**

دروێنەی ئەو کاتانەی بە داس یان مالاغان دەکرێت، لە ناوچە شاخاوییەکاندا( دۆڵی سمیلان. دۆڵی باڵەییان. گوندی ولیان. گوندی هەرتەل) بۆ ئەوەی خێراتر تەواو ببێت، زبارەی بۆ دەکرێت(وێنەی٣).

یەک دوو رۆژ پێش دروێنەیکردن، خاوەن تەبارە، داوا لە گەنجانی گوندی دەکات زبارەی بۆ بکەن. ئەوانیش، سەر لە بەیانییەکەی، لە شوێنی دیاریکراودا ئامادە دەبن. پێش دەست بە دروێنەیکردن ئەوانە دەکەن.

ـ کەسێکی بە ئەزموون و بە پشوو، بۆ سەرپاڵە، دەست نیشان دەکەن. ئەو لاییێکەوە دەست بە دروێنەی دەکات و ئەوانی دیکەش چاوی لێ دەکەن.

تەنیشت تەبارە، شوێنی سەرپاڵەیە، ئەوانی دیکە بۆیان نییە(یاسای زبارە وایە) لەو شوێنەی دروێنەی بکەن.
ـ داسان، دوای ئەوەی بە زەیت چەوریان دەکەن، بۆ ئەوەی دەغڵی بە ئاسانی ببڕێت، هەسانی، بۆ ئەوەی تیژ بێت، لێ دەسوون.
ـ یەک دووانیان، بێ تاقەت و لە دروێنەی نەزان، دەکەن بە باقبێن. ئەوەیان سەری دوو بنە گەنمان لێک دەبەستیت. پاشان دەیخاتە ژێر باقەی گەنمی دووروراو و، لەناو قەدرا، پێی دەبەستیت.

خاوەن زبارە، تەدارکی چای(شەکری ورد. کەڵبەشەکر، تۆ چا. پیارە. کتلی) و کابان(ناجیە ابراهیم لە گوندی کۆیلێ کابانی باوکی بوو) و ئاوی خواردنەوەی لەگەڵ خۆی هینابوو. کابان ئاوی بۆ پاڵە تێنوەکان دەبات(لە ناوچەی چۆمان پاڵە ئاوی دەستی کابانی کچ نەبێت ناخواتەوە) و چایان بۆ لێ دەنێت و کاتی پشوودان، بۆیان لە پیاڵە دەکات و لە پێشیان دادەنێت. ژەمی نیمەڕۆ(برنج . مریشک . شلەی بە تەماتە و کودو و باینجان و بامیە و پەتاتە) لە ماڵی خاوەن زبارە دەخورێت.

پاڵە، ئەوانەی بە تەمەنن، بۆ ئەوەی هەست بە شەکەتی و ماندووبوون نەکەن و دروێنەیکە بە ئاسانی تەواو بکەن یەکێک بە دەم دروێنەیکردنەوە، بە دەنگی گەورەوە، گۆرانی دەڵێت. پاڵەکی گوندی ئێنێ(رسول کریم) دانیشتووی چۆمان ئەوانەی بۆ گوتووم.

**بەژنۆکەت دارەدارە**
**دارێ سەرکەندە شینی**
**بای لە پەرچەمان دەدا**
**لە خەزێمێی دەئاڵێنی**
**ماچەکم لە گەردەنی کرد**
**ئاکرێ و ئامێدیان دێنی**
**بەژنۆکەت دارەدارە**
**دارێ سەرچیلە و چۆمان**

**کەزیلەت ماری ڕەشە**
**زینگوڵان دەدا لە گۆمان**
**سەبارەت بە چاوی توو**
**کەتمە بن باری لۆمان**
گۆرانییێکی دیکە
**فاتمیلێ هێرمیلی**
**چەند بە چۆمان هاتم**
**شاختێ پایزێ هەنگاوتم**
**میوان مەمانت هاتم**
**فاتمیلی هێرمیلی**
**گوێستانن کاڵە شینە**
**بەفرن کەوی کەوێنەیی**
**سینگێت شانە هەنگوێنەیی**
**گۆرانییێکی بەر لە تەواوبوونی دروێنەی**
**ئەی حەبیبی هەی ئەکبەری**
**تا دونیا دەچتە سەری**
**نابڕێ مەحەت و سەنای پێغەمبەری**
**سەیدی حالەم سەلەوات**
**گۆرانییێکی تەواوبوونی دروێنەی**
**چەند بەردێ لە بەستان**
**هەندە هەزار سەڵەوات بن**
**لە پێغەمبەر و خۆشەویستان**
**چەند مووی بزن و کاران**
**هەندە هەزار سەڵەوات بن**
**لە پێغەمبەر و هەر چار یاران**

**دروێنەی بە کەمباین**

جوتیارەکانی نێوچە نیمچە شاخاویەکان و دەشتاییەکان، لەبەر ئەوەی رووپێوی زەوی چێندراویان بە دانەوێڵە زۆرە، لە شوێنی داس و مالاغان، بە کەمباین دروێنەی دەکەن.

**دەستەڕنە**

جوتیارەکان، چی ئەوانەی نێوچە شاخاوییەکان و چی ئەوانەی دەشتاییەکان، ئەو سالانەی جۆ و گەنم خراپ قەدەیان کردبێت، ئەگەر ئارەزووی خڕکردنەوی هەبێت، دەستەڕنەی(لەسەر چینچک دانیشتن و بە دەست ئیشکردن) دەکات.

**کوتان**

شوێنێک لە ناو پەرێز، یان لە نزیک جادە، خۆش دەکرێت. قشرەی(تابارەی دووڕواو) بە باوەش بۆ ئەو شوێنەی دەینن و لەسەر یەکیان کەڵەکە دەکەن. خەرمانکوتی لە تەنیشت ڕادەگرن و بە شەنەی ئاسن قشرەی لە دەمی دەکەن (وێنەی ٤). مەکینەکە، دوای قشرە هوردکردن، گەنم و کای هەر یەکە لە شوێنی خۆی دەردەداتە دەرەوە. تەلیس و شەڵفە، هەر یەکەیان، بە زارکی ئەو شوێنەی وەکراون کە گەنم و کایان لێ دێتە دەرێ. کایەکە، ئەو جارانەی شەڵفە لەبەر دەستان نەبێت، لە عەردی روو دەکرێت. پاشان لە شەڵفە دەکرێت و لە گوێدرێژ بار دەکرێت یان لە عارەبانەی پشت تراکتۆرانی دەکەن و لە کادینی بەتاڵییان دەکەن.

کادین، ئەگەر لە خانوو دابێت، هەردەم لە یەک لە ژوورەکانی نهۆمی یەکەم(ژێرەوە) دایە. ژوورەکە، بۆ ئەوەی بە ئاسانی کای تێ بکرێت، کونێکی بۆ لەسەرەوە بە جێ دەهێڵن و کارتۆنێک یان پارچە تەنەگەیێکی بە کونەکەی وەدەنێن و بە قوڕ، تاکو ساڵی ئایندە، سواغی دەدن. کا لە دەرکەوە دەردەهیندرێت.

**زەوی بە کرێدان**

هەندێک لە موڵکدارەکان، خۆیان زەوییەکانییان، لەبەر چوونییان بۆ شار یان بوونییان بە فەرمانبەر و پێشمەرگە و پاسەوانی سنوور یان مانگانەی پێشمەرگایەتی و هەر شتێکی دیکەی لەو بابەتانەوە، بۆیان دە عەمەل نایێت. هەنگین، لە جیاتی بەشێک لە داهاتی زەوییەکانییان، بە سەپان(نیوەکار) دەدەن. بەکرێ دان چەند چەشنی هەیە. هەندێکییان ئەمانەی خوارەوەن:

**- بە سێیەک**

موڵکدار زەوی بە سەپان دەدات. ئەوکەسە دەیکێڵێ و تۆی دەکات و ئاوی دەدات، ئەگەر ئاوی بێت، و چاوی لێ دەبێت و کیمیای پێ وەدەکات و دەیدوریتەوە و دەیکوتی. بەرهەم بەو شێوە دابەش دەکرێت: دوو بەش بۆ سەپان و بەشێک بۆ ملْکدار.

زەوی بەراو، لەبەر ئەوەی بەرهەمی ساڵانەی لە هی زەوی دێمی زۆرترە، بە سێیەک دەدریت. زەویەکە بە زۆری، کولتووری هاوێنەیی، وەکو تەماتە و خیار و شفتی و تووتنی لێ دەچیندرێت. وەلێ هەندێ جوتیار کولتووری زستانەی وەکو گەنمی لێ دەچینێت. بە نموونە، جوتیارێکی گوندی هەرتەل لە ناوەڕاستی مانگی تشرینی دووەمی ئەم ساڵ سێ پارچە زەوی، دوای روسەکردن(ئاوبەردانە سەر) تۆ دابوو و بە گا کێڵای بوو. گەنمەکە دوای بیست رۆژێک دەبێتە قەرسیل و زستان لە ژێر بەفر دەمینێتەوە و بەهارێ پێ دەگات.

**- بە نیوەیی**

موڵکدار زەوی و تۆ و کیمیا بە سەپان دەدات ئەویش جۆت و دروێنەی و کوتان دەکات. بەرهەم بە نیوەیی، بەشێک بۆ ئەم و بەشێک بۆ ئەو، دابەش دەکرێت. تەماتە و خیار و شفتی و باغ بە سێ یەکیش دەدرێت.

**- ئیجار**

موڵکدار، لە جیاتی بڕە پارەیێک، زەویەکەی بۆ ساڵێک دووان، بە کەسێک دەدات. ئەو کەسە بۆی هەیە زەویەکەی دابچینێت و بۆشی هەیە

ئیجاری بکاتەوە.

ئیجار، لەبەر ئەوەی بەرهەم دیار نییە، بۆی هەیە زیانی گەورە بە ئیجارکار بگەینیت. بە نموونە، پار زەویەکانی خۆشکان بە دوو دەفتەر بە ئیجار چوو. ئیجارکار، زەویەکانی بە نیوە دایەوە کەسانی دیکە. وەلێ، لەبەر خراپی بەرهەم، لە جیاتی قازانج زەرەری کرد.

**- بە حەوت یەک**

چەشنێکی زەوی بەکرێدانە لە نێوچەی گەرمیان(گوندی علی مستەفا لە ناحیەی قادر کەرەم) دا. موڵکدار، جگە لە زەوی، شتێکی دیکە بە جوتیار نادات. بەرهەمی خەلە بۆ حەوت پشک دابەش دەکرێت. بەشێک خاوەن موڵک دەیبات و شەش بەشەکەی دیکەش بۆ جوتیار دەمینێتەوە.

**ژێربابەتی ١. دانەوێڵە(خەلە)**

زۆربەی هەرەزۆری زەوی جوتیارەکانی نێوچە دەشتاییەکان و بەشێکیش لە هی هاوپیشەکانیان لە نێوچە شاخاویەکاندا، هەر لە دێر زەمانەوە دانەوێڵەیان لێچاندووە و ئەوڕۆش دەچینن. فاکتەری ئەو کارەش بۆ گونجانی ئاووهەوا بۆ شینبوون وگەورە بوون و بەرگرتنی دانەویڵە دەگەڕێتەوە.

جوتیارەکان لە هەر نێوچەیەک بن، وەلێ ئەوانەی گوندەکانی نێوچە شاخاویەکان زیاتر، دانەوێڵەی جۆراوجۆر دەچێنن. بە نموونە، ئەوانەی خوارەوە:

**گەنم**

جوتیارەکان لە پایزێ دەست بە چاندنی گەنم دەکەن و لە هاوین، واتە دوای سێ چوار مانگ، دروێنەی دەکەن.

ساڵی بە باران قەد و گوڵەکانی دانەوێڵە، بە پێچەوانەی ساڵی بێ باران، گەورەن. بە نموونە لە نیوەی مانگی حوزێرانی پار بەژنی بنە گەنمێک لە ئاقاری گوندی کانی کەوان ٥٠ سانتیمەتر و درێژی

گوڵەکەشی ١٠ سانتیمەتر بوو. ژمارەی دنکە گەنمەکانی سێ گوڵە گەنمیش لە هەمان شوێندا بەو شێوە بوو: یەکەمیان ـ ١٨ دنک. دووەمیان ـ ٣٧ دنک. سێیەمیان ـ ٧٨ دنک.

جۆرەکانی گەنم لە گوندی جولحان و ئەوانەی دەوروبەری ئەمانەن: ئەکساد. بەژن بەرز. بەژن کورت. بەتام(پێنج و شەش). ڕەشگوڵ. سۆرگوڵ و ... هتد.

**جۆ**

چاندنی ئەو دانەوێڵە لە پایزدا دەست پێدەکرێت. لە هاوین، دروێنەی دەکرێت. جۆ، وەکو گەنم، بە خۆشی و ناخۆشی ئاووهەواوە بەندە. ساڵی بە باران، لە ساڵی بێ باران، بەژن زیاتر دەکات و دەنکی گوڵەکان زۆرتر و قەڵەوتر دەبن. هەندێک لە جۆرەکانی جۆ ئەمانەن: سپی. ڕەش. شەشپەڕ.

**نۆک**

جوتیارەکان لە ڕۆژانی ئاخری شوبات بۆ حەفتەیەک(٢٥ شوبات بۆ ٣٠ شوبات) دەست بە چاندنی نۆک دەکەن و لە ڕۆژانی ئاخری تەمووز(٢٥ تەمووز) دەیدورنەوە. نۆک بە دوو سێ بارانان شین دەبێت و پێدەگات. بەوەش لە گەنم جۆ جودادەبێتەوە. جۆرەکانی نۆک ئەمانەن: دەنک ورد. حۆلە.

**هیدیکە**

نیسک و ماش و هەرزن و کونجی و ڕەشکە و قزن(وەکو نیسکە وەلێ خڕەپایز دەچیندرێت لە هاوین دەدورێتەوە) کەمتر لە ئەوانەی باسکران دەچێندرێن. فاکتەری ئەو کارەش بە باران و ڕووپێوی زەوی کشتوکاڵی و دەرامەتی ساڵانە بەندە.

**ژێربابەتی٢. شینایی**

تخووبی زاراوەی شینایی، لەبەر ئەوەی مانای زۆر دەداتەوە، بەگوێرەی شوێنەوە تەسک و فرەوان دەکرێت. بە نموونە، لە نێوچە شاخاویەکاندا(وێزێ. کۆیلێ. هۆرنێ)، بۆ ئاروو(خیار) و تەماتە بەکار

دێت. لە نێوچەی دەشتایەکان و دەورووبارەکان، جگە لەوانە بۆ بامیە و باینجان و کودی(کولەکە) و شفتی(زەبەش. شامی. شمتی. شوتی.) و گندۆرە(کاڵک) و پیاز(پیواز) و بیبەر و شێلم و سلقەسۆرە(چەوەندەر) و کەلەم و قرنابێت و شتی دیکەی بەکاردێت.

**پارچە ئاروو و تەماتە**

ئەمانە لە گوندەکانی نێوچە شاخاوییەکان لەبەر ئاوێ دەکرێت. بۆ روونکردنەوە باس لەو شوێنانە دەکەم:

**گوندی کۆیلێ**

ئاروو و تەماتە، لەو گوندە و گوندەکانی دیکەی نێوچە شاخاوییەکان، لە زەوی دەرەدێ، لەبەر ئەوەی بە پێزترە، دەکرێت.

**بژار ــ** زەوی بێستان لێکراو، گیاوگۆڵی زۆر لێ شین دەبێت. گەر بێتوو هەروا لێیان گەڕێت برکە بێستانەکان بێ هێز دەکەن. هەر بۆیەش بێستانەوان، بێستانی بە ژنان( لە شارەزوور پیاو و ژن)، بژار دەکات.

خەپارە ــ بێستانەوان، خۆڵی بنی برکە بێستانەکان، وەلێ لە لای دێراوەکەوە، بە پێمەڕەی دەستی، شل دەکاتەوە و دەیداتە پاڵ برکەکە(وێنەی ٥). ئەوەش بۆ ئەوەیە تاکو ریشەکەی ئاسانتر لە زەوی دابووکتی و ئاو باشتر بگاتە ریشەکان. ئەو کارە بەیانیان و پاش نیمەڕۆ، واتە بە فێنکی، دەکرێت.

بێستانەوان، بە ئەزموونی لە خۆیان پێشتر و هی خۆیان، بێستانەکەی، بۆ ئەوەی باش قوەت بکات، بژار و بنکۆڵ دەکەن و پاشان کیمیای لێ دەدەن. لێی دەگەڕێن بۆ ئەوەی باش تێنوو بێت. ئینجا ئاوی بەردەدەنە سەر تاکو رەباس دەبێت. دوای سێ رۆژی دیکە، بۆ ئەوەی کیمیایەکە نەیسووتێنی، کەرەتێکی دیکە ئاوی دەدەنەوە. هەنگین بێستانەکە رەونەق پەیدا دەکات و سەوز دەچێتەوە و بەرەکەی جوان دەبێت.

بێستانەوان لە ناو بێستانەکەی شوێنیک بە ناوی قۆناغ دیاری دەکات. قۆناغ بۆی هەیە لە ژێر سێبەری بنە دارێک بێت. ئەگەر ئەوە نەبوو

کەپرێک بە داربی و چرو دروست دەکرێت(وێنەی ٦).

**سەوزە**

شینابیکەرەکانی، دەوروبەر و هی گوندەکانی نزیک شارەکان، لەبەر نزیکییان لە بازاڕدا سەوزەی دەکەن. زەوی خۆشکردن وکێڵان و تۆکردن و ئاودان لە ئەستۆی پیاوان دایە. ئەمەیان لە دوو شوێنی جودا، بە دووری و نزیکی لە ماڵەکانییان، دەکرێت.

ء. دوور لە ماڵان ـ شینابیکەرەکان، لە زەویەکانی دوور لە ماڵەکانییان، چی لە ئەوانەی خۆیان بێت و چی لە ئەوانەی بە ئیجار گیراون، سەوزەی دەکەن. کارەکانی چاندن و ئاودان و بژارکردن و بۆ بازاڕ بردن، ئەندامانی خێزان یان هاوبەشەکان ئەنجام دەدرێت.

ب. نزیک ماڵان ـ زەوی تەنیشت ماڵەوە دەکرێت بە سەوزە. بژارکردن و ڕنین و دوورین و قرتاندن و بەدەسککردن و لە سەندوق و کیسی نایلۆن و شەڵفەکردن، دوای شینبوون، بە زۆری لە ئەستۆی ژن و منداڵ دایە(وێنەی ٧). ئەوە لە لایێکەوە رێگە بۆ پیاو خۆش دەکات کارێکی دیکە بکات و ژنیش، دوای ئیشی ماڵەوە، دەست بەتاڵ نەبێت.

**جۆرەکانی سەوزە**

مەبەست لە سەوزە ئەو رووەکانەیە کە بەرەکانیان هەمان قەدەکانییانە. دوای بەژنکردن، بە مەقس یان چەقۆو، دەبڕێنەوە. ئینجا ئاودەدرێتەوە. ئینجا کیمیای پێوەدەکرێت و دوو سێ رۆژ بۆ ئەوەی باش تێنوو بێت ئاونادرێت. پاشان رەباس دەکرێت. سەوزە بەو کارە باش قوەت دەکات. هەندێک لە جۆرەکانی سەوزە ئەمانەن: تەرەتوولە(تەرەتیزە). شبیت. کەرەوز. کەوەر. مەعدەنۆس. مەعدەنۆسی ئیرانی(بە سوێدی ـ سێل).

**تەرە**

مەبەست لە تەرە، ئەو رووەکانەیە کە بەرەکانیان بە قەدیانەوە شۆڕ دەبێتەوە یان سەلکەکانیان لە ژێر گڵەوە گەورە دەبێت. تەرە هاوینی و زستانی هەیە. ئەو دابەشبوونە، ئەوڕۆ، لەبەر پەیدابوونی تەکنیکی

سەردەمیانەی وەکو: خانووی شوشەبەند. چادری تەڕە. دەزگای کارەبایی بۆ گەرمکردنەوە. کیمیای ئۆرگانی و هیدیکە ئەوەندە زەق نییە. بە نموونە، ساڵێ دوازدەی مانگ، تەڕە لە بازاڕ نابرێت.

جۆرەکانی تەڕە ئەمانەن: بامیە. باینجان. بیبەری تیژ. بیبەری شیرین( درێژ و خڕ) پاقلە. پەتاتە(کەرتۆپ). پەلکە سلق. پیاز(پیواز). تەڕەپیاز. تەماتە. تووری سەلک خڕ. تووری سەلک درێژ (ئەمەیان لە مانگی کانوونی دووەم لە ساڵی پار لە هەندێ شینایییان بەرچاوم کەوتووە). چەوەندەر(لە تشرینی دووەم دەست بە هەڵقەنین دەکرێت. لە کانوونی یەکەم تەواو دەبێت). شێلم(لە ئەیلول تۆ دەکرێت و لە کانی دووەم پێدەگات). فاسولیا. قڕنابیت. کەلەم. کودیی دۆڵمە. کودیی زەرد (کودیی هێسک).

هەندێک تەڕە، ئەوڕۆ کەمتر لە سی ساڵێک لەمەو بەر، لە وەرزی زۆربوونییاندا، وشک دەکرێنەوە. بۆ نموونە، باینجان و کودی، هەر یەکەی دوو پەلکییان لێ دەردەهیندرێت و ناوکەکەی لەتلەت دەکرێت و بۆ وشک بوونەوە لەبەر رۆژێ هەڵدەخرێت. تەماتە دەکرێتە ئاویتەماتە(دۆشاوی تەماتە). لەتکەتماتە. نانەتەماتە. تورشی فرۆشەکان و خەڵک، تورشی لە ئاروو و تەرۆزی و سڵقەسۆر(چەوەندەر) و کەلەم دەگرنەوە. سیری لە خێواوکێ شۆر(سوێر. سوور) دەکەن.

نرخی تەڕە، لە بازاڕدا، بە گوێرەی وەرز دەگۆڕێت. بە نموونە، تەڕەفرۆشەکانی مەخموری کیلۆی پیازی لە خاوەن شینایییەکان بە سێ سەد دینار دەکڕن و بە پێنج سەد دینار بە خەڵکی دەفرۆشنەوە. نرخی کیلۆ پیازێک لە هەمان بازاڕدا، ئەوڕۆ، حەوسەد و پەنجا دینارە.

**ژێربابەتی ٣. بێستان**

مەبەست لە بێستان گندۆرە و تەرۆزی، لە زەوی دێمی، کردنە. بۆ روونکردنەوە باسی بێستانی دێمی لە دەشتی دیبەگە(کەندێناوە) دەکەم.

بێستان لە هەموو جۆرە زەوییێک دەبێت و بەر دەدات. وەلێ لە زەوی گردە ـ ئەو زەوییەیی ئاوی بارانی دێتەوە سەرێ ـ لە هەموویان باشتر دێت. لەبەر ئەوە بێستانکەرەکان، تاکو زەوی ئەوها هەبێت لە هیی دیکە

نایکەن. لەبارترین کات بۆ کردنی بێستان مانگی نەورۆز(بیستی مارت ـ بیستی نیسان) ە. بەر لەو کاتەوە بێستان تووشی دوو کێشەی گەورە دەبێتەوە.

ء. بژارێکی یەکجار زۆر لە زەویەکە شین دەبێت. هەڵکێشانییان ماندووبوونێکی زۆری دەوێت.

ب. گەرووی بڕکەکان، لەبەر زەوی توند بوون، کەمتر دەڕسکێن و ئەستوور دەبن.

پلەی گەرما و چەشنی با کاریگەریی بەرچاویان لە سەر بێستان هەیە.

کاریگەریی نیگەتیڤانە ـ بڕکە بێستان بە هاتنی بای شەماڵ و هاوینی فێنک کزدەبێت و خاڵۆزەی لێدەدات. هەنگین بەرەکەی ورد دەبێت وەلێ زۆر شیرین دەبێت. ئەگەر گندۆرە بوو پێدەگوترێت ـ لاقوزە(*). ئەگەر تەرۆزیش بوو ـ قونکە تەرۆزی

کاریگەریی پۆزەتیڤانە ـ بڕکە بێستان بە هاتنی بای هوڕە "ڕەشەبا" و بەرزی پلەی گەرما، لەبەر ئەوەی ژێر زەوی پێ فێنک دەبێت، گەشە دەکات و کولیکی زۆر و گەش دەدات.

---

*) سەربردەێکی یەک جار تاڵم لەگەڵ لاقوزە هەیە. بەگێڕانەوەی هەندێک لە ئازاری دەروونیم سووک دەبێتەوە.

یەک لە نزیکترین کەسوکارم لە دیبەگە هەموو ساڵێک زەویەکەی تەنیشت گۆرستانی کاریتانی دەکردە بێستان. تەرۆزی و گندۆرەی باشی دەهینا. رۆژ نەبوو، بۆ ماوەی سی چل رۆژ، یەک دوو تێڕکان نەڕنیت.

بەیانێک ـ تەمەنم حەوت ساڵ دەبوو ـ ژنەکەی لە پێشەمن دوو تێرکە گندۆرەی لە هۆدەی دەستە ڕاست هەڵڕشت. گندۆرەکانی لێک دەکردەوە. ئەمانە بۆ حاجی. ئەمانە بۆ فلان. ئەمانە بۆ فلان. لەدڵی خۆمدا دەمگوت هەوکە نا هەوکە دەڵێت ئەوەش بۆ توو. هەر نەیگوت و نەیگوت. منیش بەچاو بە روخسار، لەبەر ئەوەی ئەوەندە حەزم چووبووە گندۆرە، هاوارم دەکرد ئەدی بەشی من؟. کەدیتی، ئەگەر بەخۆشی خۆی نەمداتێ، پڕدەدەمە گندۆرەکان. هەنگین بە نابەدڵی و دەست لەرزینەوە گندۆرەێکی **لاقوزەی** بۆ درێژکردم. گوتی: دواتان بڕێت. ها بگرە بخۆ. وەختە چاوم دەربێنی. لەبەر مندارە هورتکان ناتوانین شتێکی بە دڵی خۆمان بخۆین.

بێستان ـ هەر چەندی خزمەت بکرێت ئەوەندە بەرهەم زیاتر دەدات و گندۆرە و ترۆزی گەورەتر دەبن و ماوەی بەرهەمدانی حەفتەیەک دوو حەفتە درێژتر دەبێتەوە. بێستانکەری بە سەلیقە، زیاتر لە خەڵکی دیکە، ئەو کارانە لە ناو بێستانەکەی ئەنجام دەدات.

* شلکردنەوە (تەربیشکردن) ی خاکی دەوروبەری بڕکەکان.
* تەختکردنی کەندوکۆسپە و گرێ و گواری کەستەکی کێڵگەکە.
* پاڵدانی خۆڵی ورد و شێداری ژێرزەوی بۆ پاڵ گەرووی بڕکەکان.
* هەڵبەستانی تولکێش (دانی بەر و کەستەک لەم لاو و لەو لای تولەکان) بۆ ئەوەی بای بەهێز تولەکان لوول نەدات.

**چەشنەکانی گندۆرە**

ئەمەیان چەشناوچەشنە و لەهەر نێوچەیێکدا ناوی خۆی هەیە.

دەشتی هەولێر ـ سێ چەشنە گندۆرە هەیە.

ء. گندۆرەی بەرحوشتر ـ بەناوبانگترین جۆری.

ب. گندۆرەی قەرەقۆش ـ شێوەیێکی درێژوکانی هەیە. پەلکی ئەستوور و گڕنیگڕنییە. بۆشایی ناوی لە پەنجەییێک زیاتر نابێت. لە خواردندا، لەبەر ئەوەی گۆشتنە، شەویلاکی ماندوو دەکات و جووینی پێدەوێت.

پ. کلاو قوت ـ شیلەکەی کاتی شکاندن، لەبەر ئەوەی زۆر شرینە، بە دەستەوە وەدەنووسێت. ڕەنگی سپیپاتە. پەلکەکەی لە کاتی پێگەیشتندا، لەبەر ئەوەی زۆر تەنگە، شەق دەبات.

ت. عارەبەڕەش ـ ئەوەندەی کلاوقوت شیرین و پەلک تەنکە. ڕەنگی کەسکێکی مەیلەو ڕەشە.

ئاقاری گوندی سێناوە ـ دوو چەشنە گندۆرە هەیە.

سێچکور.

گڕو.

**شفتی**

ئەمەیان هاوینی و ئاوییە. وەلێ، لەبەر ماندووبوونی زۆر، کەمتر لە گندۆرە و تەرۆزی دەکرێت. لەگەڵ ئەوەشدا، بۆ شینابیکەرانی شارەزوو و

گوێڕ(شفتی گعێتلی لە ئەستانی هەولێر ناوبانگی دەرکردووە)، پیشەی ساڵانەیانە.

شفتی ئێرانی و تورکی و سوری، لەو ساڵانەی دواییدا، زیاتر لە هی خۆماڵی، لە بازاڕدا هەیە. نرخی کیلۆیەک شفتی، ئەگەر چی بە وەرزە، پار لە سێسەد و پەنجا دینار کەمتر نەبوو.

**ژێربابەتی ٤. میوە و ڕەز**

ئەمانە بەجودا، لەبەر ئەوەی بە بەژن و فۆرمی بەرهەمەکانییان و جیاوازی لە رووپێو و شوێنی چاندنییان، دەکەم.

**میوە(فێقی)**

ئەمەیان، بە تام و فۆڕم، جۆراجۆرە. لە باخچەی گوندەکانی نێوچە شاخاوییەکاندا هەیە، لەبەر ئەوەی ئاووهەوای بۆ شینبوون و بەردان گونجاوە. وەلێ، وەکو خۆم هەستم پێکردووە و گوێم لە خاوەن باخچەکان بووە، دارمێوەکان لەو ساڵانەی دواییدا، کەمتر لە ساڵانی پێشتر بەر دەدەن. ئەمەیان، بە گوێرەی ئەقل، لە ئەنجامی ئەو ئالوگۆرە نیگەتیڤانەیە کە لە ئاووهەوادا، روویان دابێت.

جۆرەکانی میوە ئەمانەن: باوی(بادەم. بایەم. چواڵە). پرتەقاڵ. توو. چەقەلەباوی. خۆخ. سێو. زەردەلو(قەیسی) کرۆسک. گاتوو. گیز(گوێز. گوز. گەردە) گێوژ. لیمۆ. هەرمی. هەروچکە(هەڵوژە). هەنار(ی هیران و نازەنین و شارەبان و خۆران و شارەبان بە ناو بانگە) هەنجیر. یەنگی دونیا و ... هتد.

**ڕەز**

ئەمەیان، کە مەبەست باخچەی دارمیوە، لە ئاقاری گشت گوندەکانی نێوچە شاخاویەکان، کەم و زۆر هەیە. دۆڵی جافاتی. ئاقاری گوندی هەرتەل. ئاقاری گوندی ستوپێ. قەدپاڵی چیای سەفین. دەوروبەری بیارە(وێنەی ٨) لەو شوێنانەن کە رەزێکی زۆریان لێچەقێندراوە.

ڕەز، وەکو هەر دارێکی دیکەی بەبەر، بۆ ئەوەی بەرەکەی شیرین و

پڕئاو و روخسار سەوز و درەنگتر وشکبوون بێت، پێویستی بە خزمەتکردن، بەتایبەتی دوای پەلک دەرکردن، هەیە.
کەزاخە ـ بڕینەوەی دارمیو لە مارتدا. واتە دوای بە سەرچوونی وەرزی سەرماوسوڕ. بەر لەو مانگەدا، ترسی سڕبوونی هەیە.
زەوی شلکردنەوە ـ ئەمەیان، بە جۆتکردن، ئەگەر رەزەکە هەند (گەورە) و بەردەلان نەبێت. یان بە پاچ، ئەگەر رەزەکە هەند و بەردەلان بێت.
هەڵدانەوەی بنە مێو ـ کۆڵینی بنی بنەمێوەکان، بە خاکەناس و پێمەڕە و قەزمە و پاچ، بۆ ئەوەی هەوا بچیتە ژێرەوە.
* دریژکردنی لکی دارمێوەک، بە ناو قۆرتدا تاکو شوێنی مەبەست و بە خۆڵ داپۆشێن و، بڕینی لە دایکەکەی دوای شینبوون
لق ـ لقێکی قاشۆدار دەخرێتە قۆرتێک و بە گڵ پڕدەکرێتەوە. قاشۆیەکە، دوای ماوەییێک، رێوپوک دەردەکات و بەرەبەرە گەورە دەبێت و پەلک دەدات و دەبێتە بنە مێوەکی سەربەخۆ. دوای سێ ساڵ، بە گوێرەی ئاووهەوا، بەر دەدات.
رەهەگورک (کێش. کوشە) ـ کێشانی لقێکی دارمێو بە ناو قۆرتێکی بە درێژی دە سانتیمەترێک قوڵ و داپۆشینی، جگە لە بیست سانتیمەتریکی لای سەرووی، بە گڵ و قوت نەکردنی لە دایکەکە (دارمێوەکە) یەوە ، بۆ ئەوەی تاکو رێپوک دەرکردن، بێ خواردن نەمینێت.

**جۆرەکانی ترێ**

بیست جۆرە ترێ، کەمتر زیاتر، لە رەزەکاندا هەیە. ناوەکانییان، لەبەر ئەوەی لە نێوچەێکەوە بۆ نێوچەێکی دیکە جودان، بۆی هەیە تێکەڵ بە یەک بکرێت. واتە یەک جۆرە ترێ بە دوو جۆر لەقەڵەم بدرێت. ناوەکانییان، بۆ وەلاتانی ئەو کێشەیە، نێوچە بە نێوچە دەنووسم.
گوندی ستووپێ لە ناحیەی شێروان مازن دا: بەقێلی. بێسیرانە. تالک. تایفی. چوارگا. خولیگوینی. زەرک. ساداتی. سلێمانی رەش. گانگیسک. مرک و هیدیکە.
گوندی دەرگەلە لە ناحیەی سەنتەری رواندزدا: ئاویلکە. پەسیرانی.

تایەفی. تولخی. تولی. چۆمیلکە. حەوت بەر. حوسێنی. خەلیلی. خۆشناو. رەشکە. رەشمیری. زێڕین. سپی پایزی. سپی هاوینی. شێخ نورەدینی. کشمیشی. گوار و هیدیکە.

**تووتن**

کولتووریێکی هاوێنەیی‌یە. جوتیاری گوندەکانی نێوچەشاخاویەکان، لەبەر ئاووهەوای گونجاو و هەبوونی ئاو بۆ ئاودان، ساڵێ بە مەبەستی قازانج و کێشانی خۆی، پارچە تووتنێک دەکات. وەلێ لەو پێنج شەش ساڵەیی دوایی لەبەر کەمی ئاو و سەختی وەبەرهێنان کەمی دەکات(جوتیاریێکی گوندی هەرتەل ئەو ساڵ هەر بای خۆی کردبوو ئەویش زۆر خراپ بوو) یان دەستی لێ بەرداوە.

**تووتن چاندن**

دۆڵی باڵەییان، بەر لە دوو سێ ساڵ، ئەگەر هەموو زەویەکانی نەکرابوونایە تووتن ئەوە بەشی هەرە زۆریان تووتنییان لێ دەکرا. نموونەیەکی دیکە، ئەو ساڵ لە شوێنی بیست پارچە توونی پار چوار پارچە تووتن لە گوندی کۆیلێ کراوە.

تووتنەوان، لە ئەنجامی دووبارە و سێ بارە کردنی تووتن، بۆی دەرکەوتووە کە تۆی لە جۆتە گیراو، لە رووی بڕکردن، باشترین تۆیە. هەر لەبەر ئەوە، ئەوەندەی بۆی بچیتە سەر. لەو جۆرە تۆیە زیاتر داناچینی.

**١. شتڵ کردن**

شوێنێکی بە پیت بە ناوی "جێ شتڵ" بۆ پێ وەکردنی تۆ تووتن دیاری دەکرێت. جێ شتڵ زبڵ دەکرێت. پاشان بە خەرماشە (درمغ) تێکەڵ بە خۆڵ دەکرێت. کەستەکەکان هورت دەکەن و هورتکە بەردان فڕێ دەدەن. پاشان جێ شتڵەکە دەکرێت بە دوکان(تەپە) و تۆی پیوەردەکرێت. تۆیەکە، بۆ ئەوەی باڵندە هەڵیان نەگریتەوە، بە قەلەم (قەلەمەکان دار تیروێ(تیرۆ) یان دار چەقەلەن) دادەپۆشرێت. دوکان بە سۆندە ئاو ڕشین دەکرێت. تۆیەکە، دوای بەسەرچوونی چل و پێچ رۆژ، گەورە دەبێت و دەبێت بە شتڵ.

شتڵەکان هەڵدەکەندرێن و جارێکی دیکە لە مشارەکان، کە پێشتر ئامادەکراون، ئەگەر بەرین بوون دوو بەر دەنا یەک بەر، دەیان چیننەوە. چاندنەوەی شتڵەکان لە مشارە نەوەکو لە گۆل، بۆ ئەوەیە تاکو نەسووتین. شتڵ ئاوی لە بن بوەستێت دەسووتێت.

تووتن، لەبەر ئەوەی بە یەکجار پێ ناگات، بە چەند قۆناغ تێدەپەریت:

* کەڵەبابە.

* سەرچن ـ قرتاندنی سەری بنەکان.

* جۆتە ـ دوای سەرچن، دوو کەل، یەک لەم لا و یەک لەو لا سەر دەردێنن. تۆی تووتن لەو کەلانە، بۆ وەرزێکی دیکە، دەگیرێت.

* کارتە ـ دوای جۆتە دوو کارتە لە بنڕا سەر هەڵدەدەن.

* شکاندن ـ پەلکە گەورەکان و زەردبووەکان بە دەستی لێدەکرێنەوە.

* لە تەرەدان ـ پەلکە تووتنەکان، لە شیش دەدەن تاکو پڕبوون. شیشەکان لە تەنیشت یەک لەسەر دوو داران درێژ دەکرێن. بە چرو یان پونگ دایان دەپۆشن. شیشەکان، بۆ ئەوەی هەموو پەلکەکان وەکو یەک زەرد بن، هەرگێر و وەرگێریان دەکەن. شیشەکان دەخرێنە سەر دارتوون و دوو زەلام دەچنە بنی و دەیخەنە سەر شانیان و بۆ ژووریک هەڵی دەگرن. پاشان شیشەکان لە پەلکەکان دەردەکێشن و پەلکەکان، بەو شێوە، دەکەن بە باڵە تووتن.

* بەشیش وەکردن ـ پلکە تووتنەکان، یەک بە دوای یەک و سەفت، لێک دەبەستن و بەشیشەی وەدەکەن.

* هەڵێخستن ـ تووتن، بۆ ئەوەی وشک بێت، لەبەر هەتاو هەڵدەخرێت.

* زەردبوون ـ پەلکەکان، لە ئەنجامی رۆژلێدانییان، زەردەبن.

* وشکردن ـ پەلکەکان وشک دەکرێنەوە.

* داگرتن ـ پەلکەکان بە وشکی لە سەندوق دەکرێن.

سەندوقی تووتن یەک مەتر درێژ و یەک مەتر پان دەبێت. جێگەی پەنجا کیلۆ گرام دەبێتەوە. هەرچوار لای تێک هەڵدەکێشرێت. سەرەکەی پارچە دارێکە کەمێک لە ئەندازەی سەندوقەکە گچکەترە و قایم نەکراوە.

بنـی سـەندوقیش بۆشـە. تەلیسـەک رادەخرێـت. سـەندوقەکەی دەخرێتـە سەر. پەلکە تووتنـەکان، تاکو سەندوقەکە پڕ دەبێت، لـە نـاو سـەندوقەکە لەسـەر یـەک دادەنـدرێن. پاشـان قەپاغەکـەی دەخرێتـە سـەر و کەسێک دەچێتە سەری و دەیپەستێتەوە. سـەرەکە لادەبرێت و سـەندوقەکەی لێک دەکەنەوە و رۆخەکانی تلیسەکە بەسەر تووتنەکە دادەدەنەوە و بە شوژن و بەن دەی دوورن.

**چەشنەکانی تووتن**

بافرە ـ تووتنێکی گەڵا تەنکە و لە کێشدا سووکە.

بێشەما ـ تووتنێکی کەمێک گەڵا تەڵخە و لە کێشدا سووکە.

پەلکەبێ ـ توتنێکی بە بڕشتە و لە کێشدا سووکە.

رەشۆکی ـ تووتنێکی گەڵا مەیلەو شینە.

زەردە ـ تووتنێکی گەڵا زەردە. گەڵایەکانی بەرەو ژوور هەڵدەکشێن.

سیرەمۆ ـ گەڵایەکانی ئەو تووتنە بەرەو ژوور هەڵدەکشێ و لە هەر چوار لاوە پەلک دەدات.

عەلی کەسافی ـ تووتنێکی گەڵا پانە و کەمێک رەنگ تەڵخە و گەڵاکانی بەرەو ژوور هەڵدەکشێن.

**نەخۆشییەکانی تووتن**

هەندێک لە نەخۆشییەکان ئەمانەن: قوزبڕکە(جۆبڕکە). زێپووک. کرم. گەزۆ. گورگە و... هتد.

**ئاودان**

جوتیارەکان شارەزایی باشییان لە گەیاندنی ئاو لە رووبار و کانی بۆ ناو زەوییەکانییان لە باوباپیرانییان بۆ ماوەتەوە. ئاوگەیاندن بە دوو شێوازی جودا بە تەکنیک و ئەندازیاری ئەنجام دەدرێت.

**یەکەم. شێوازی ترادیسیۆنی**

**رووبار**

ئەگەر سەرچاوەی ئاو رووبار بێت ئەوە لە شوێنیکێ بەرزتر لە زەوییەکان، جۆگە(جۆ) یێکی لە رووبارەکە هەڵدەگرن و دەیگەینە شوێنی

پێویست. لەو جۆگەش جۆگەی بچووکتر بۆ ناو زەوییەکان لێ دەدرێت.

**کانی**

جۆگە لە دەمی کانی، قەد چیا، بۆ ناو زەوییەکان، هەڵدەبەسترێت. لە رێگەوە جۆگەی بچووک بچووک بە ڕاست و چەپ لە شا جۆگەکە لێ دەدرێت.

**ئەندازیاری شێوازی ترادیسیۆنی**

باسی ئەو شێوازە لە نێوچەی چۆمان دەکەم.

زەوی دەستەک دەستەک دەکرێت. هەر دەستەکەکیش قەد قەد دەکرێت (هێلکاری ١) دێراوێکی، بە زۆری لە دەستە چەپ، بە ناو زەوییەکە دادێنن. جاری یەکەم قەدی سەرەوە ئاودەدرێت. پاشان قەدی ژێرەوەی، ئیتر بەو شێوە تاکو گشت قەدەکان ئاودەدرێن.

**دووەم. شێوازی سەردەمییانە**

بردنی ئاو لە رووبار یان کانی بۆ زەوی بێ ئاو و دوور لە ئاو، بە بۆڕی پلاستیکی دەکرێت. بە نموونە، پیاوێکی گوندی باریی بچووک بۆ ئەو مەبەستە چوار کیلۆمەتر بۆڕی کێشاوە و حەوزێکی گەورەی بە درێژی و پانی سێ مەتر و بەرزایی دوو مەتر لە سەرووی زەوییەکەی دروستکردووە. کاتی ئاودان شێرەی بۆڕییەکەی بۆ ناو باخچە دەکرێتەوە. کاتی دیکەش ئاوەکە لە حەوزەکە دەکرێت و کاتی پێویست بەردەدرێت.

**ژێربابەتی ٤. گرفتەکانی کشتوکاڵ**

کشتوکاڵ رووبەرووی چەندین گرفت، کە هەندێکیان سروشتین و لە کۆمەڵگەی ئێمەدا، لەبەر دواکەوتووی تیکنیک و لێنەزانین و کەمتەرخەمی، چارەسەر ناکرێن و هەندێکی دیکەیان مرۆڤین و ئەگەر ناچاربین، بە ئاسانی چارەسەریان بۆ دەکرێت.

**یەکەم. گرفتە سروشتییەکان**

چەند گرفتی سروشتی لەبەردەم کشتوکاڵ لە گوندەکان هەیە. هەرە لەبەر چاوەکانییان ئەمانەن:

**باران**

یەکێکە لە گرفتە سروشتییە هەرە زیانبەخشەکان. گرفتەکە بەو شێوانە دەردەکوێت. باران بارینی پێش و پاش وەخت. درەنگ باران بارین. بە نموونە، ئەم ساڵ باران لە مارت باری. زیاد و کەم باران بارین لە ساڵێکدا. باران بارین لە شوێنێک و نەبارین لە شوێنێکی دیکەدا. باران بارین لە چەند رۆژێکدا. بە نموونە، لە نیسانی ئەم ساڵ لە شەورۆژێکدا شەست و دوو ملم باران باری.

باران نەبارین کۆمەڵێک گرفتی بە دواوەیە. بە نموونە: کەمبوون و وشک کردنی رووبار و کانی و بیرەکان. خراپی و نەهاتنی دەغڵ ـ دان و بەروبوومی دار و گیاوگۆڵ و لەوەڕ. بەرزبوونی پلەی گەرما. تەندروست تێک چوون.

**کێشەی ئاو**

جوتیارەکان، ئەو ساڵانەی باران کەم بێت، وەکو پار و پێرار، بە دەستی کەمی ئاو بۆ ئاودانی باخچە و شینایییەکانیان دەناڵێنن. بۆ چارەسەرکردنی رێوشوێنی جۆراوجۆر دەگرنە بەر. بە نموونە، نایلۆن راخستن لە ناو جۆگەی ئاوێ (جوتیارێکی گوندی کۆیلێ پار بای بیست و پێنج هەزار دینار نایلۆنی بۆ ئەو مەبەستە بەکارهێناوە) لە سەروچاوەڕا بۆ نزیک باخچەکان یان لە ناو حەوزی بەردەمی کانی گوندی. هەندێ جار، جۆگەی چیمەنتۆرێژ دەکەن و ئەم لاو ئەو لای بە بەرد یان بلۆک و بە بەرزایی مەترێک (گوندی ماونان) هەڵدەنێن. جاری واش هەیە جۆگەی دەکەن بە نۆین(بەرد رێژکردنی جۆگە و هەڵنانی ئەم لا و ئەو لا بە بەردو بە تاشەبەرد سەرگرتن). کاری لەو بابەتە، رێگە لە رووچوونی ئاو بە رێگەوە دەگریت.

گوندی ناوەندە، لەبەر ئەوەی لە بنی هەڵگۆرد نزیکە، ئاوی زۆرە. ئاوەکە لە خۆی زیادە. هەر بۆیەش گوندەکانی دەوروبەر وەکو گەلەژور و گوندە ژوور جۆگەیان لە بنی هەڵگۆرد گەوەر بە گەوەر بۆ گوندەکانیان هەڵچنیوە. وەلێ دوو ساڵە لە گەڵ گوندی شۆر کێشەیان لەسەر ئاو

نابڕێتەوە. ناوندەیەکان، لە ترسی ئەوەی ببێتە شون، لێ ناگەڕێن شۆڕەبییەکان جۆگەی بۆ گوندەکەیان هەلچنن. بەو دوایی کێشەکەیان چارەسەرکردووە.

**بەفر ڕەوینەیوە**

بەفری پار و مانەوەی بۆ ماوەیێک بەسەر گەڵای دارەکانی شوێنەی نزمەکانی دۆڵی باڵەییان بە نموونە گوندی ماونان و قەڵات، بوو بە هۆی سڕکردنی گوڵی دارمیوەکان و لەناوبردنییان، هەر بۆیەش، دنکە قەیسییەک و گوێزەک بە دارەکانییانەوە نابیندرێن. هەر ئەو بەفرە، بۆ دارمیوەکانی شوێنەی بەر ڕۆژەکانی دۆڵی باڵەییان، لەبەر خۆ نەگرتنی بەفر و توانەوەیان، هۆکاری ئەو هەموو بەرەی دارگوێزەکانی گوندی کۆیلێ بوو.

**دووەم. گرفتە مرۆییەکان**

کشتوکاڵ بە دەستی چەندین گرفتی مرۆیی، بە نموونە، ئەوانەی خوارەوە دەناڵێنی.

**وەرگرتن**

بەرهەمی دانەوێلەی وەکو گەنم و جۆ، ساڵانە لە لایەن وەزارەتی کشتوکاڵ لە فەلاحەکان وەردەگیرێت و لە سایلۆیان دەکرێت. گرفتکە لەوەدا نییە بەڵکو لە وەرگرتن و پارەدان دایە. هەندێ جوتیار دوای دە ڕۆژ چاوەڕێ کردن ئەوجا بارەکەی خستووە و دوای مانگێک پارەکەی پێ دراوە. پاساوی فەرمانبەرە فەرمییەکان بۆ ئەو گرفتانە: کەمی کرێکار و گەیشتنی بەرهەم لە یەک کاتدا و نۆبەتبڕی کردن و خۆنەگرتن و کێشەی تەکنیکی و تەسکی شوێنی ڕاگرتنی بارهەڵگر و ... هتد.

**دەستی کار**

ئاودان و بژارکردن و ڕنین و لە سەندوقکردن و بارکردنی سەوزە، بەدەستی ئەنجام دەدرێت. بۆ ئەو مەبەستە، ئەوجوتیارانەی دەستی کاری خۆیان نییە یان بەشیان ناکات، کرێکاری بە ڕۆژانە دەگریت. بە

نموونە، رۆژانەکە لە مەخموور پار بەو شیوە بوو: هی پیاو ــ ١٥ هەزار دینار و هی ژن ــ ١٠ هەزار دینار. جگە لە ژەمی نیمەڕۆ و بە خۆڕایی هینانی بۆ سەر کار و بۆ ماڵ بردنەوە.

خاوەن شینابییەکان، بۆ ئەوەی ئیشێکی زۆری بە رۆژانەیێکی کەم بۆ بکرێت و لە تڕومنەتی کرێکاری کورد بە دوور بێت، بە دوای کرێکاری عارەب دەگرێت. ئەمانە، لەبەر ئەوەی ئەوەندە مەبەستییان جێگیربوونە لە کوردستاندا ئەوەندە مەبەستییان پارە نییە، رازین بەو رۆژانە و بەو کارەی بۆیان پێشنیار دەکرێت، کار بکەن. بە نموونە، خێزانێکی عارەبی پازدە نەفەری مانگێ بە ٣٠٠ هەزار دینار بۆ خاوەن شینابیێکی گوندی قادراوە لە ناحیەی گوێڕ کار دەکات. خێزانێکی دیکەی عارەب چوار نەفەری مانگێ بە ٤٠٠ هەزار دینار بۆ خاوەن شینابیێکی مەخمور کار دەکات.

**مل نەدانەکار**

کرێکاری کورد، خراپ مل لە کار دەنێت. ئەوەندی بۆی بکرێت، بە بیانۆی جغارەکێشان و بابۆڵە خواردن و دەست بە ئاوگەیاندن و تەلەفۆنکردن، خۆی لەکار دەدزیتەوە. کاریش کە دەکات بە نابەدڵی دەیکات.

**بەیار**

خاوەن زەوییەکان، لەبەر بێ ئارەزوویی کارکردن لە سێکتەری کشتوکاڵدا و لە شار نیشتەجێبووندا و پێشمەرگەکردن بە مانگانە و پارەنەکردنی بەرهەم و گێچەڵی عارەب وەکو: داگیرکردنی زەوی بە پشتیوانی عێراق و رێگەگرتن لە کێڵانی زەوی (فەلاحەکانی گوندی زەنقوڕ سەدان دۆنم زەویان لەبەر عارەبەکانی گوندەکەی خوار خۆیان بۆ ناگێڵدرێت) و بە دەستی ئانقەست تەبارە سوتاندن، هەموو یان بەشێک لە زەوییە کشتوکاڵییەکان ناکێڵن و تۆ ناکەن. هەندێ زەوی سێ چوار ساڵ لەسەر یەک بە بەیار دەمینێتەوە.

**عەقدی زراعی**

دەست بەسەرداگرتنی زەوی کورد لە نێوچە دابڕێندراوەکاندا لە لایەن عێراق و لەقەبەلکردنی، بە ناوی عەقدی کشتوکاڵی(عقد زراعی)، عارەبان، ئەگەر گەورەترین کێشەی زەوی نەبێت ئەوە یەکێکە لە هەرە گەورەکان. چەند ملیۆن دۆنم زەوی لە گوندەکانی قەزای کەلار و ناحیەی داقوق و شوێنی دیکە، دەیان ساڵە، تووشی ئەو کێشەیە هاتوون.

**دووبارە چاندنەوە**

کردنی جۆرێک کشتوکاڵ بە نموونە گەنم و تووتن ، دوو ساڵ لەسەر یەک لە زەوییێکدا، لەبەر نەمانی تاقەت واتە کەمبوونی ڤیتامینی پێویست دەبێتە هۆی لە کورتی دانی بڕیارِی زەوییەکە. جوتیارەکان، بۆ ئەوەی تووشی ئەو کێشەیە نەبێن، شوێنی جۆرەکانی کشتوکاڵ دەگۆڕن. ئەم ساڵ، ئەم لایەی زەوییەکەی دانەوێڵەی لێ دەچێنێت و لایەکەی دیکەی شینایی لێ دەکات. ساڵی ئایندە جێگۆڕیان پێ دەکات.

**پارە نەکردن**

بەرهەمی کشتوکاڵی وەکو گەنم و جۆ، دەوڵەت لە فەلاحەکان، بەو پارەی بۆ یەک تەن دیاریکراوە دەکرِیت. بە نموونە، ئەم ساڵ نرخەکە بەو شێوە بوو: گەنم ـ ٦٥٠ هەزار دینار و جۆ ـ ٤٥٠ هەزار دینار. نرخەکە، بە گوێرەی گووتەی فەلاحەکان، لە چاو ماندووبوون و خەرجی، ئەوەندە نییە. بەرهەمەکان، لەبەر نەبوونی بازارِ ئازاد و رێگەی بۆ دەرەوە هەناردن، بەو نرخە دەفرۆشرێن کە حکومەت دیاری کردووە. هەر فەلاحێک بەرهەمەکەی لە کاتی خۆی بە حکومەت نەدات لە ملی دەمینێتەوە و بۆی نافرۆشرێت.

**ئاوی رووبارەکان**

بەشێک لە ئاوی رووبار و کانییەکان، لە وەرزی هاویندا، بۆ ئاودانی باخچە و شینایی لەبەرکردن، بەکار دەهێندرێت. دوای ئەو ورزە، سەرتاپای ئاوەکان لە زێی دیجلە دەکەنەوە. ئەویش بۆ عێراقییان دەبات.

حکومەت ـ خەریکی دروستکردنی چەند ئاوبەندی بچووکە لەسەر ئەم رووبارە و ئەو رووبارە. بە نموونە، ئاوبەندی خاسە لە سەر ئاوی خاسە و ئاوبەندی قوشەچاپان (باباشاسوار) (وێنەی ٩) لەسەر رووباری قوشەچاپان لە کفری، وەلێ کارەکان لەبەر سیستییان و فرتوفێڵی قۆنتەراتچی و کۆمپانیییەکان، بە ماوەییێکی زۆر درەنگتر لە کاتی خۆی تەواویان دەکەن و داوای پارەی زیاتر دەکەن یان بە بهانەییێک دەستی لێ هەڵدەگرن.

# سەربابەتی دووەم

## ئاژەڵداری

بەخێوکردنی ئاژەڵ، بەر لە سەدان ساڵ، لەناو کوردا باو بووە. ئەوڕۆش سەدان خیزانی کورد، خەریکی ئاژەڵ دارین. فاکتەرەکەی بۆ گونجاوی بارودۆخی سروشتی و مرۆیی دەگەڕێتەوە.

ئاژەڵ داری لە ناو کوردا، وەکو هەر پیشەییێکی دیکە، کۆمەڵێک تایبەتمەنی خۆی هەیە. لەبەر چاوترینییان ئەمانەی خوارەوەن:

- وازهینانی دەیان خێزان، بە بیانۆی ناخۆشی و زەحمەتی، مەڕداری. هەندێ کەس، بە نموونە مەڕدارێکی گوندی هەرتەل، سەرتاپی مێگەلەکەی چەند ساڵێک لە مەوبەر فرۆشت. مەڕدارێکی رانیە، دوای ماڵکردنی برا گەورەکان و چوونی برای بچووک بۆ ئەوروپا، چەند ساڵێکە مێگەلەکەیان فرۆشتووە. ئەوڕۆ، بۆ خواردنی خۆی، یەک چێڵی راگرتووە.

- دەست پێکردنەوەی هەندێ مەڕدار بە مەڕداری. بە نموونە، مەڕدارێکی گوندی جولحان، بەر لە چەند ساڵێک، مێگەلەکەی (سەد و چل سەر) فرۆشت. پار یەک جۆت مەڕی بە حەفت سەد و پەنجا هەزار و یەک جۆت بزنی بە چوار سەد هەزار لە قەسابێک کڕیەوە و دەستی بە مەڕداری کردووتەوە.

- ئاژەڵداری بۆ هەندێ خێزان پیشەی منداڵی و بابەلباب بووە. بە نموونە،حسن ابراهیم(گوندی گردخیوەت) تەمەن شێست و پێنج ساڵ لە منداڵیەوە. سعید عبدالکریم ناسراو بە سعید ڕەشە(گوندی دووگرتکان) تەمن شێست و حەوت ساڵی لە سەرەتای پەنجاکانەوە. فرحان قادر (گوندی کانی کەوان) تەمەن چل و حەوت ساڵ لە منداڵییەوە.

دابەشکردنی کارەکان بەسەر ئەندامانی خێزان. بە نموونە مەڕدارێک بەو شێوەی دابەشکردووە:

* براگەورە کڕین و فرۆشتنی ماڵات و بەروبووم دەکات. برای ناوەنجی و بچووکیش ئیشی شوانی و ئالیک و ئاودانییان بەرکەوتووە.

* ژن و کچ و بوک بێری و هەوێزماڵین و هەوێنکردنی شیر و خوری ڕستن دەکەن.
* هەندێ ژن، کاروباری ئاژەڵداری، دوای مردنی باوکی منداڵان، لە ئەستۆ دەگرێت. بە نموونە، زەوە (وێنەی ١٠) لە شارەدێی سەروچاوە، نزیکەی بیست و پێنج ساڵە لەگەڵ کوڕ و کچەکانی گەرمیان و کوێستان دەکات.
* پابەندبوونی مەڕدارەکان بە زەکات دان. زکاتەکە بەو شێوەیە: سەد سەر یەک بەردیلی نە هەرە باش و نە هەرە خراپ. چوار خوری یەک خوری مام ناوەنجی.
* بەکارهێنانی زمانی تایبەت لە گەڵ ئاژەڵدا. بە نموونە، هەڕە بۆ مەڕ. یخە بۆ بزن. عەلە بۆ بەران. عەجە بۆ نێری. تەگەتەگە بۆ تەگە. تووێر دایکم بۆ چێڵ .... هتد.

### ژێربابەتی ١ جۆرەکانی ئاژەڵ

ئاژەڵداری کورد ئاژەڵی بە گوێرەی قەبارەی لەش و بەکارهێنان لە ئیش و ڕەنگ و بەروبووم، بۆ سێ گروپی سەرەکی دابەش دەکات.
ئەو جۆرە پۆلێنکردنەم، لەبەر ئەوەی خەڵک پێی ئاشنایە و کارەکەی منیش کولتووری ماددیە، لە هی شارەزایانی ئاژەڵ، پێ باشترە. هەر لەبەر ئەوەشە پەیرەوی دەکەم.

**یەکەم. ماڵات** (**پەز. دەوڵەت. وەڵسات**)

بەر لە باسکردنی ماڵات، بە باشی دەزانم هەندێ لەو زاراوانەی کە لەو مەیدانەدا بەکار دەهیندرێت روون بکەمەوە.
**مەڕدار**ـ بە کەسێک دەگوترێت کە پیشەی بە خێوکردنی مەڕوبزن و فەلاحەتی بێت. خانووبەرەی هەمیشەیی لە دەشتێ بۆ خۆی و ماڵاتەکەی هەبێت.
**شوانکارە** ـ بە کەسێک دەگوترێت کە شوانی و مەڕداری کەسێکی مەڕدار دەکات. شوانکارە، جگە لە کاروبەرخ، شیر و خوری مەڕ و بزنەکان دەخوات.

**ڕەوەند** بە کەسێک دەگوترێت کە پیشەی سەرەکی بە خێوکردنی مەڕوبزن بێت. هەمیشە لە ژێر ڕەشماڵ یان خیوەت بژیت. ساڵێ دوازدە مانگ لە گۆزەگۆزدا بێت.

**شوان** ـ بە کەسێک دەگوترێت، بە مەبەستی لەوەڕاندن، مەڕوبزن بۆ دەشت ڕابدات و بۆ ئاودان و دۆشین بیانهینیتەوە و شەوورۆژ بە دواوەیانەوە بێت. لە شوێنی ئەوە مانگانە(٣٥٠ ـ ٤٥٠ هەزار دینار) ی بۆ دەبڕێتەوە. دوو جۆرە شوان هەیە:

**خۆیی** ـ یەکێک لە ئەندامانی خێزانی مەڕدار، دەبێتە شوان. بە نموونە، هی فرحان قادری کانی کەوە حوسێنی برایتی. هی اسماعیل عبداللە هەرتەلی کوڕەکەیتی. هی گەردی محمدی جولحان خۆیتی. هی خێزانێکی گوندی شێناوە حوسێنی برایتی(وێنەی ١١) لەو حاڵەتەدا، پێویستییەکانی ژیانی رۆژانەی خۆی و خێزانەکەی لە فرۆشتنی ماڵات و بەروبوومەکەی دەستەبەر دەکرێت.

**بیانی** ـ کەسێکی بیانییە بە مانگانە شوانی بۆ مەڕدار دەکات. شوانی مەڕدارە کوردەکان، چەند ساڵ لە مەوبەر کورد بوو. دوای ئەوان گرێلایەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان بوو. ئەوڕۆ، لەبەر ئەوەی نە ئەمان و نە ئەوان شوانی دەکەن، عارەب بۆیان دەکات.

**شوانی عارەب** ـ مەڕدارە کوردەکان، بە تایبەتی ئەوانەی نێوچە دەشتاییەکان، شوانی عارەب لە دەشتی قەراج و دیبەگە و لە گوندە عارەب نیشەکانی گەرمییان و کەرکوک، دەینن. لەسەر مانگانە و شوێنی حەوانەوە ڕێک دەکەوەن. بە نموونە، خەرجی شوانەکەی سعیدە ڕەشی دووگردکانی، بەو شێوە بوو: مانگێ سێ سەد و پەنجا هەزار دینار(لە شوێنی دیکە لە سێ سەد بۆ چوار سەد هەزار دینار) ی کاش و ساڵێ دوو کورتەک و شەرواڵ و دوو جۆت پێڵاو و مانگێ سێ رۆژ پشوودان، جگە لە سێ ژەم خواردن و نووستن وپارەی دکتۆر و شتی دیکە.

شوانی عارەب، ئەگەر منداڵی لە قوتابخانە بێت، منداڵەکانی لە گوندی جێ دەهێڵیت و خۆی دێتە لای مەڕدارەکە. ئەگەر نەیبوو بە

خاوخێزانــه وه، دوای دابێنکردنــی شــوێنی حەوانــەوە، دێتــە ســەر ئــیش. شوانـی عارەب، لـه هەندێ شوێندا، ناویان لـه ئاسـایش دەنووسرێت. کـاتـی تەواو بوونـی کارەکەیان، دەبێت بۆ شوێنـی خۆیان بگەڕێنەوە.

**مەڕداری عارەب** ـ ئەمەیان بە خۆڕایی کارەکانی بە خێوکردنـی مالآت وەکو: هینـان و بـردن. ئالیکـدان. ئـاودان. دۆشـین. هـەوێز مـاڵین. جـەوبڕی. هـۆڕ دروستکردن، بۆ مەڕداری کورد دەکات. بە مەڕجێک شوێنـی حەوانەوەی بـۆ خێزانەکـەی دابـێن بکـات و مێگەلەکـەی، بـۆ لـەوەڕانـدن لـە ئاقـاری گونـد، تێکـەڵ بــە مێگەلـەکــەی بکــات. مــەڕداری کــورد (گونــدی پویکــەی هــەژدە کیلۆمــەتر لــە خانــەقین دوور)، لـەبــەر ئــەوەی کوڕەکــەی نــە شــوانـی و نــە ئــاودان و ئالیکــدان و نــە شــەوین دەکــات و نــە ژنەکــەی مــەڕەکانی بـۆ دەدۆشیت و هەوێزی بۆ گێسک دەدات، بـە خۆشحاڵییەوە بـە مەڕجـەکانی رازی دەبێــت. ئـــەو جـــۆرە رێککەوتنـــە، مەترســـیدارترین شـــێوازی بـــە عـارەبکردنی کوردسـتان دادەنـدرێت. ئــەو مــەڕدارە، دوای چەنـد سـاڵێک، خـۆی بــە دانیشـتووی گونـد دەزانــی و داوی بـەشــی خـۆی لــە زەوی و زاری گوند دەکات.

شـوانێتی، بـۆ کەسـانێکی نــە شـارەزا، لــە ڕادان و هینانــەوەی میگــەل زیاتر نییە. وەلێ لە ڕاستییدا بە تەواوی وانییە. بۆ ئەوەی شوانێکی باش بێت، دەبێت شـارەزاییێکی بـاش لــە چۆنێتـی و شـوێن و کـاتـی لەوەڕانـدن هـەبێت. ڕێگە نەدان بە مێگەل، بە تایبـەتی ئـەو دەمانـەی دونیـا گـەرمـە، لـە ئاقار نووستن.

**بەرخەوان** ـ بـە مێردمنـداڵێکی تەمـەن سێزدە چواردە سـاڵی دەگوترێت کـە کار و بـەرخ ، دوای مژینـی مەڕوبزن، بە مەبەستی لەوەڕانـدن، کـەمێکییان لـە ماڵ یان لـە ڕەشماڵ دووربخاتەوە.

**سەربێری** ـ بە گەنجێکی نێرینـەی تەمـەن بیست سـی سـاڵی دەگوترێت کـە سەری دوو مەڕان یان دوو بزنـان، لـە ژێر بـاڵـی چەپ و ڕاستی، بـۆ دۆشـین، بگریت.

**بێریوان** ـ بـە گـەنجێکی مێینـەی تەمـەن بیست سـی سـاڵی دەگوترێت، کـە

مەڕوبزن لە سەربێری دەدۆشیت.
**مێگەل ـ** سەد سەرمەڕ و زیاتر.
**کوتە ـ** سەد سەرمەڕ کەمتر.
**دووماک ـ** بەو بەرخانە دەگوترێت، کە جگە لە مژینی گوانی دایکی ، گوانی مەڕێکی دیکەش بمژیت. روونتر، بەرخی دوو دایک.
**مێشکە ـ** بەو کار و بەرخە دەگوترێت کە دایکی خۆی نەمابێت. روونتر کار و بەرخی سیقی(واتە منداڵی دایک مردوو). مێشکەش، پێم وایە، لە مژینی خێرا هاتووە. مەڕ هەر ئەوەندە بۆ بەرخەکە دەوەستێت تاکو بۆنی دەکات. ئەگەر دیتی بۆنی بەرخی خۆی لێ نایێت لە سەری ڕاناوەستیت.

مەڕدارەکان، بۆ ئەوەی مێشکەکان، شیر بدەن، مەڕی دیکەیان ـ یەک بێت دوو بێت ـ بۆ دەگرن. یانیش ئەو مەڕانەی بەرخیان هاوێشتووە یان نەیانماوە، لەسەریان دەبانێنن. باندنەکەش بەو شێوە دەبێت: بە دوو پەنجان(دۆشاومژ و لەندەهۆر) زی مەڕەکەی بە توونْدی دەکوشن. ئەو کوشیینە مەڕەکەی بۆ حاڵەتی زان دەباتەوە. مەڕدارەکە، دەستی، بە مێشکەکە دەسڕیتەوە. مەڕەکە کە بەرخەکەی بۆن دەکات، دەبینی بۆنی خۆی لێ دێت. کە بۆنی خۆشی لێکرد دەیبانێنی.

### جۆرەکانی ماڵات

ئەمەیان بە گوێرەی شێوەی کەلەش و ماوەی زان و تووکی(خوری. موو) کەلەش و رەنگی تووک و چەوری شیر و ماوەی شێردان و چیری گۆشت و توانای رۆیشتن دوو جۆرە:
**مەڕ ـ** مەبەست گشت ماڵاتی بە خوری وەکو مەڕ و بەران و ئەوانەی لە زاوزێکردنی ئەمانە پەیدا دەبن. زۆربەی مەڕدارەکان جگە لە مەڕ، ماڵاتی دیکە بە خێو ناکەن. بەرخ بە گوێرەی تەمەن و رەگەز، ئەو ناوانەی هەیە:
* بەرخی مێ(لە ساڵێک کەمتر) ــ کاورە مێ(یەک ساڵ) ــ بەردیل(دوو ساڵ)

* مەڕ(سێ ساڵ) ـ مەڕی یەک بەرخی(چوارساڵ) ـ مەڕی دوو بەرخی(پێنج ساڵ) ــ مەڕی سێ بەرخی(شەش ساڵ) ــ قەیرە(حەوت ساڵ) ــ یەک قەیرە(هەشت ساڵ) ـ دوو قەیرە(نۆ ساڵ) ــ سێ قەیرە(دەساڵ) ئیتر بەو شێوە.

* بەرخی نێر(لە ساڵێک کەمتر) ـ کاوڕەنێر(یەک ساڵ) ـ شەک(دوو ساڵ) ـ بەران(سێ ساڵ) ــ قەیرە(چوار ساڵ) ــ یەک قەیرە(پێنج ساڵ) ــ دوو قەیرە(شەش ساڵ) ـ سێ قەیرە(حەوت ساڵ) ئیتر بەو شێوە.

بەران دوو جۆرە. بە شاخەکانییان ـ شاخدار و بێ شاخەکانییان ـ کۆریس یان پێ دەگوترێت.

**جۆرەکانی مەڕ**

مەڕی جۆراوجۆر لە ناو مێگەلەکاندا هەیە. ناوەکانییان ، لای مەڕدارەکانی نێوچەی جودا، کەمێک لێک جودان. وەلێ بۆم ناکرێت، لەبەر نا شارەزاییم. ناوەکان تێکەڵ بە یەک نەکەم. ناوەکان، لەناو مێگەلی مەڕداری چەند گوندان، وەکو لە خۆیان گوێ بیست بووم، دەنووسم:

**دووگرتکان**

گەرعە چاوڕەش. گەرعە چاوسۆر. کەویسار سۆر. کەویسار شین. کەرین بە شاخ. رسەر شین. رسەر تا. رسەر ڕوومەتڕەش. مەڕی مس. قوڵە پیازی. قوڵە تارا. قوڵە سۆر. قوڵە گێپەل. کەڕە. کوڕیس. کۆڵانی. لچگاز. چاوگاز و ... هتد (وێنەی ١٢).

**کانی کەوان**

بەش. ڕەشی ئێرانی. سۆرەبەشی ئێرانی. مەڕەقەوەی عێراقی، رەسەر. کەڕە. کەڕەبەش. کەڕە رەسەر. کەڕە تەو. قوڵە. تارە. کەویسار. شین کەویساری. بۆر. لولک گوان و ... هتد

**کنگربان**

دوو بەژم(لە نێوان جافی و عارەبییە). جافی (مەبەست کوردیە) کلێنجە شۆڕ و درێژ. کلێنجەی کورت. عارەبی(بێ کلێنجە). ژگێر (دەموو

چاوی سووره). عەشم (دەمووچاوی ڕەش نییە). پەر(دەموو چاوی ڕەشە). کەڕی(گوێی کورتە). عەپسە(دەموو چاوی سپییە. خەتەکی ڕەش بە نیوچەوانی داهاتووە.

**باوا**

مەڕدارەکانی گوندی باوا،جگە لە عارەبی مەڕیدیکە بەخێو ناکەن.

فاکتەرەکانیش وەکو مەڕدارێک بۆی باسکردم ئەمانەن: کەم خۆری. سووک رۆیشتن. ماندی نەبوون و.... هتد. جۆری مەڕەکانیش: بەرش. دوعوم. حەپسە. شگێر. گەرحە و ... هتد.

**کەندالْ**

یەکێک لە دانیشتوانی ئەو گوندە(عەزیزی مەلا رەش)، کە تاکو ساڵی ١٩٦٩ چەند سەر مەڕی بەخێودەکرد، بەو شێوە مەڕەکانی لێک جودادەکردەوە.

**مەڕ بە گوێرەی رەنگ:**

١. بازی ـ چوار پەلی سپیی یان دوو رەنگە.

٢. بەلەک ـ جۆری رەنگەکانی ئەمانەن: رەش ـ سپی. زەرد ـ سپی. سۆر ـ سپی.

٣. تە(چەرموو) ـ جۆرەکانی ئەمانەن:

ء. تە روومەت رەش. دەم و چاوی رەش و خوری سپی.

ب. تە روومەت زەرد. دەم و چاوی زەردە و خوری سپی.

پ. تە روومەت سپی. دەم چاو شین(کەوی) و خوری سپی.

ت. تە روومەت سپی. دەم و چاو سپی و خوری سپی.

٤. تەبەش ـ دەم و چاو رەش و نیوچەوان سپی.

٥. رسەر ـ جۆرەکانی:

ء. رسەر شین(کەوی) ـ بە کچکەیی دەم و چاوی مەیلەو شینە کە گەورەش بوو بۆر دەبێت. خوریەکەی لە هەردوو تەمەندا سپییە.

ب. رسەر زەرد ـ دەم و چاو مەیلەو زەرد و خوری سپی.

٦. رەش ـ دەم و چاو رەش و خوری رەش.

٧. زەرد ـ دەم و چاو زەرد و خوری زەرد.
٨. سۆر ـ دەم و چاو سۆر و خوری سۆر.
٩. سەر بە پۆرد ـ خوری تەپڵی سەری وەکو کڵاو بەرزە.
١٠. قولە ـ دەم و چاو سۆر و خوری سۆر. جۆرەکانی:
ء. قولەتارە ـ خوریەکەی سۆری تۆخە.
ب. قولە سیسە(زەرد) ـ خوریەکەی سۆرێکی ئاچوغە(سپی واژی).
پ. قولە مس ـ دەم و چاو سۆر و چاو خەتی رەش یان زەردی تێدابێت. جۆرەکانی:
ء. قولە مس تارە.
ب. قولە مس سیسە.
١١. کەویسار ـ خوری شین و سپی تیکەڵ.

**مەڕ بە گوێرەی ئەندازەی گوێچک:**

١. حەمدانی ـ گوێ گەورە و پان. هەندێک لە رەنگەکانی:
ء. تە روومەت زەردی حەمدانی.
ب. رسەر روومەت زەردی حەمدانی.
پ. قولە تارەی حەمدانی.
٢. رەشۆکی ـ گوێ ئاسایی. هەندێک لە رەنگەکانی:
ء. کەویسار رەشۆکی.
ب. سەر رەشی رەشۆکی.
پ. قولە سیسەی رەشۆکی.
٣. کوڕیس ـ گوێ بە درێژی پەنجەییێک. هەندێک لە رەنگەکانی:
ء. سەر بە پۆردی کوڕیس.
ب. قولەمسی کوڕیس.
پ. تە روومەت رەشی کوڕیس.
٤. کەڕە ـ گوێ بە قەدەر سەری پەنجە. هەندێک لە رەنگەکانی:
ء. تە روومەت سپی کەڕە.

ب. رسەر روومەت شینی کەڕە.
پ. کەویساری کەڕە.

مەڕەکان، لەبەر جیوازی فزیۆلۆژیای لەشییان، وەکو یەک بەرگەی گەرما و سەرما ناگرن. مەڕ بەگشتی مەیلی هەوای فێنک و ئاوی سارد دەکات. مەڕی ستەڕەش پاکی بە گەرما نییە. کەچی مەڕی سپی بەش بە گەرما تێک دەچێت.

مەڕدارەکان، بۆ ئەوەی مەڕەکانیان بناسنەوە و کاتی بزربوون و دزین بیان دۆزنەوە، شوێنێک لە گوێی ڕاستی دەقرتێنی یان دەسمی یانیش بە نیشانەیکی ئاسن لەسەر شێوەی دڵ. بازنە. ڕاست و چەپ. چوارگۆشە داغ دەکات. نیشانەکان لای ئاسنگر بە رادان دەدرێت.

**بزن (ڕەشان)**

مەبەست گشت مالاتی بە مووی وەکو بزن و تەگە (نێری. ساورین) و ئەوانەی لە زاوزێکردنی ئەمانە پەیدا دەبن. هەندێ مەڕدار، بە نموونە، ئەوانەی دۆڵی مەلەکان، جگە لە بزن مالاتی دیکە بە خێو ناکەن (وێنەی ١٣). بزن بە گوێرەی تەمەن و ڕەگەز ئەمانەن:

* کاری مێ (لە سالێک کەمتر) ـ گیسکە مێ (یەک ساڵ) ـ توشتیر (دوو ساڵ) ـ توشتیرزا (سێ ساڵ) ـ بزن (چوار ساڵ و زیاتر).
* کاری نێر (لە سالێک کەمتر) ـ گیسکی نێر (یەک ساڵ) ـ کوور (دوو ساڵ) ـ خرت (سێ ساڵ) ـ قەیرە (چوار ساڵ و زیاتر).

**جۆرەکانی بزن**

بزنی جۆراوجۆر لە ناو مێگەلەکاندا هەیە. ناوەکانییان، لای مەڕدارەکانی نێوچەی جودا، کەمێک لێک جودان. کەوابی تێکەڵ کردنی ناوەکان، لای کەسانێکی نا شارەزا، بە دوور نابیندرێت. ناوەکان، لەناو مێگەلی مەڕداری چەند گوندان، وەکو لە خۆیان گوێ بیست بووم، دەنووسمەوە:

**دووگردتکان**

بزنەپۆش. بزنەمس. بزنەسۆر. بزنەشین. بزنەبەرەک. بزنەبەل. بەلەکار. بزنەڕەش. بزنەزەرد. بزنەغەر. بزنەکوڕیس (واتە بزنی بێشاخ)... هتد

**کانی کەوان**

بەلەبەش. بەلەکار. بزنەڕەش. گەمبۆر. گۆچە. بزنە سۆر. بزنە کور. غەر. کەش. قوتەکور. قوتەکار. قوتە ڕەش. قوتە سۆر. بەلەمس. گۆردی مس. گۆردی شین. گۆردی ڕەش. گۆردی کار. گۆردی بەش... هتد

**کنگربان**

سعودی. سوری. شامیانە. عارەبی. مەرەز و ... هتد. باسی ئەوەی سێیەم دەکەم، لەبەر ئەوەی لە هەموو نێوچەک بەخێو ناکرێت.

شامیانە ـ کەلەشی بەقەدەر هی بزنی ئاساییە. مووی، وەکو هی مەرەز، زەردە و شەویلاکی سەرەوەی، لەبەر ئەوەی لە هی خوارەوەی کورترە، کەوتووتە ناو یەکتر (وێنەی ١٤).

**کەندالْ**

مەڕدارێکی ئەو گوندە بزنەکانی بە دوو جۆر لێک دەکردەوە.

**بزن بە گوێرەی رەنگ:**

١. بازی ـ چوار پەلی سپی یان دوو رەنگە.
٢. بەلەک ـ موو رەش و سپی تێکەلْ.
٣. پۆش ـ موو رەش و سپی تێکەلْ. هەندێکیان هەر گوێیەکانی ئەو رەنگەیە.
٤. رەش ـ موو رەش.
٥. سپی ـ موو سپی.
٦. سۆر ـ موو سۆر.
٧. سەر ـ دەم چاو و مل رەش و موو رەش.

٨. شین (کەوی) ـ موو شین.
٩. غەڕ ـ نیوچەوان بە قەدەر ناو لەپێک سپی و موو رەش.
١٠ ـ قەش ـ نیوچەوان سپی و موو رەش.
١١. کار ـ دەم و چاو یان هەر گوێیەکانی سۆر یان زەرد موو رەش.
١٢. کەژ ـ موو سپی و شینی تێکەڵ.
١٣. مجاخ ـ بناگوێ سۆر یان زەرد.
١٤. مس (هەمس) ـ دەم و چاو خەتی سۆر یان زەردی تێدابێت. موو رەش.

**بزن بە گوێرەی ئەندازەی گوێچک:**

١. گۆرد ـ گوێ پان و گەورە. جۆرەکانی ئەمانەن:
ء. گۆردی رەش.
ب. گۆردی مجاخ.
پ. گۆردی پۆش.
٢. بەل ـ جۆرەکانی ئەمانەن:
ء. بەلە مس.
ب. بەلە کەژ.
پ. بەلەکار.
٣. قوتە ـ گوێ کورت (کولە). جۆرەکانی ئەمانەن:
ء. قوتە غەر.
ب. قوتە بەلەک.
پ. قوتە سەر.

بزن لە رووی شیردانەوە (لە کاتی دۆشیندا) دەکرێن بە دوو بەش بە ناوی:

بزنی خۆشدۆ ـ ئەو بزنانەی بەخۆشی شیر دەدەن.
بزنی چڕدۆ ـ ئەو بزنانەی بە زەحمەت شیر دەدەن.

**جەوکردن**

مەبەست لە جەوکردن، قاچینی خوریە لە جەستەی مەڕدا. ئەو کارە، لە مانگی حوزێڕان، روونتر لە دوای بەرزبوونەوەی پلەی گەرما، دەستی پێدەکرێت. جەوکردن بە گوێرەی دەست هەق دوو جۆرە.

ء. هەرەوەزی ـ واتە جەوکردنی بێ پارە. تۆ ئەورۆ بۆمن جەودەکەیت بەیانی من بۆ تۆی دەکەمەوە.

ب. دەست هەق ـ هەر سەر مەڕێک بە هەزار دینار جەوی دەکرێت. دەست هەقەکە لە چاو نرخی یەک کیلۆ خوری پارەیێکی کەم نییە.

جەوکردن بە ئامرازێکی کانزایی، لەسەر شێوەی مەقەسێکی درێژ، بە ناوی جەوو (برنگ. برنگە. بڕین. بڕینگ. جەوە. جەوێز. چارە. چێرک. چاری. قەیچی مەڕ. کەلەخ. هەورێن. هورەنگ). ئەنجام دەدرێت. نرخی یەک دانە جەووی تەوریزی ٣٨ هەزار دینارە. جەوو بە هەسان یان مەورەد (کارتیخ)، دوای چەورکردنی دەمەکەی بە زەیت، تیژ دەکرێت. مەڕەکەی لە عەردی دەدەن و هەر چوار پەلی بە کندر، ڕاست و چەپ، دەبەستن. ئینجا دەست بە قاچین دەکرێت. هەندێ جار، شوێنێک لە جەستەی مەڕەکە، دەکەویتە بەر دەمی جەووەکە و دەقرتێت. جەووکەرەکان، بۆ ئەوەی برینەکەی ساڕێژ بکەن، تەنی یان ئەسفەنیک یان شتێکی دیکەی لەو بابەتانە لەو شوێنانە هەر دەسوون.

**بێریکردن**

بێریکردن، لە دەوروبەری دەمژمێری دەی بەیانی، ئەگەر بەهار زۆر خۆش بێت دوو کەڕەت دەنا هەر کەڕەتێک، دەست پێدەکات. ماوەی دۆشینی مەڕێک یان بزنێک دەوەستێتە سەر وەرزیساڵ. لە بەهاراندا، لەبەر ئەوەی ئاژەڵ شیری زۆرە، دۆشینەکە دە خولەک دەبات. لە وەرزەکانی دیکە، لەبەر ئەوەی ئاژەل شیری کەم بووە، دۆشینەکە لە پێنج خولەکدا تەواو دەبێت.

سەربێری (تایبەتە بە پیاوان) لەسەر بەردی سەربێری (کورسییەکی بچووکی ئاسنین یان ئەسپەدار) ڕووبەڕووی مەڕەکان و بزنەکان

دادەنیشیت. دوو بێریوان(تایبەتە بە ژنان)ـ یەک لە دەستەڕاست و ئەوەی دیکەیان لە دەستەچەپ ـ هەر یەکەو پەقرەجێکی بچووک یان جامێکی قوول لە پێش خۆ داناوە. سەربێری سەری دوو مەڕان دەگرێت و بۆ لای خۆی دەیانکێشێت. سەری هەر یەکەیان دەخاتە بن باڵێکیەوە(وێنەی ١٥). بێریوان، بۆ ئەوەی پاشی مەڕەکان بخاتە سەر پەقرەجەکە، بۆ لای خۆی دەکێشی. ئینجا گوانی مەڕەکە(مەڕ و بزن دوو گوانی هەیە) دەگریت و دەیخاتە ناو لەپانی و بە پەنجەی گەورە دەست بە دۆشین دەکات تاکو شیر لە گوانی مەڕەکە یان بزنەکە نامینێت. بێریوان دوای لە دۆشین بوونەوە سەربێری بە وشەی "بەرەکە" (لە ڕاستیدا بەرەکەت) سەربێری لە بەردانی مەڕەکە ئاگادار دەکاتەوە. ئینجا دوویی دیکە بۆ لای خۆی دەکێشیت. بەو شێوە تاکو مێگەلەکە دەدۆشرێت.

مەڕ و بزن، بە زۆری لە تەنیشت ڕەشماڵ یان چادر لە بێری دەدرێت. شیرەکە لە مەنجەڵیکی فافۆن یان پلێت دەکرێت. بێریوانەکان، هەندێ جار بە هاریکاری شوان یان کەسانی دیکە، بە دەستی مەنجەڵەکەی، بۆشوێنی هەڵگرتنی شیرەکە هەڵدەگرن. ئەوجارانەی دۆشینەکە لە دووری ڕەشماڵ دەبێت، شیرەکە لە دەبەیێکی پلاستیکی ڕەنگاورەنگ دەکرێت و بە پشتی گوێدرێژ بۆ بن ڕەشماڵێ یان بۆ ماڵێ دەبردرێتەوە.

مەڕ و بزنەکان، بۆ ئەوەی دەرفەتی لە ریز دەرچوونی نەبێت، لە حەوشەیێکی تۆڕبەند دەکرێت یان لە نێوان دوو بەربەست(دوو ریزە بەرد یان دوو جەمەلۆن) دەپەسترێت. حەوشەکە دوو دەرکەی ـ بە یەکەیان بۆ ژوور ڕادەدرێت و بە ئەوەی دیکە بۆ دەرەوە دەردەکرێت ـ هەیە. لە هەندێ شوێناندا، بێرییەکە لە هەوێزەکە بێ هیچ بەربەستێک ئەنجام دەدرێت.

مەڕ و بزن، بۆ ئەوەی بچنە بێری دەنگ دەدرێن. یەکێک لە وانەی بە گۆپاڵەوە لە دەوری مەڕەکان وەستاوە. بە دەنگێکی بەرز ـ تووێرە تووێرەیەتی.

**ماڵات بە شوانکارەیی**

هەندێ خاوەن ماڵات، لەبەر ئەوەی خۆی ماڵاتەکەی پێ لە عەمەل نایێت، بۆ بەخێوکردن بە کەسێکی دیکە(مەڕدار. ڕەوەند) دەدات.

مەرجەکانی بەخێوکردن،لەبەر ئەوەی لە شوێنێکەوە بۆ شوێنی دیکە، کەمێک لێک جودان. ناچار دەبم بە نموونە ڕوونی بکەمەوە.

**جولحان**

خاوەن مەڕێکی ئەو گوندە سەد و بیست سەر مەڕی، بەو شێوە، بە کەسێکی دیکە دابوو.

ماست بۆ کەسەکە.

بەرخ بە نیوەیی.

خوری بە نیوەیی.

ئالیک لەسەر خاوەن مەڕ.

هۆڕ لەسەر کەسەکە.

**هەرتەل**

خاوەنبزنێک بزنەکانی، بەو شێوە، بە ڕەوەندێکی هەمان گوند دابوو.

ء. بەروبووم بە نیوەیی.

ب. بەخێوکردن لەسەر ڕەوەند.

**دووەم. ڕەشەوڵاغ (چافرێ)**

بەخێوکردنی ڕەشەوڵاغ، لە چاو ماڵات، لە رووی ئالیک و جێوڕێ و ڕادان، ئاسانترە. هەر بۆیەش، زۆرێک لە گوندنیش و هەندێک لە شارۆچکەنیش، بە مەبەستی ماست و گۆشت و پارە و بار یەک دوو چێڵ ڕادەگرێت.

بەر لە باسکردنی ڕەشەوڵاغ، بە باشی دەزانم هەندێ لەو زاراوانەی کە لەو مەیدانەدا بەکار دەهیندرێت روون بکەمەوە.

**چێڵ**

مەبەست چێڵ و گاو و ئەوانەی لە زاوزێکردنی ئەمانە پەیدا دەبن. بەر

لەباسکردنی چێڵ، باس لە هەندێ زاراوە دەکەم کە پەیوەندیان بەو ئاژەڵەوە هەیە.

**گاڕان** ـ سەر لە بەیانییان، هەر یەکە و چێڵی خۆی دەگەینێتە ناو گاڕانی گوندی. گاوان یان یەک لە خاوەن چێڵەکان بە نۆبەت، گاڕانی بە مەبەستی لەوەڕاند، بۆ شوێنێکی دەستنیشان لە کێو پێش خۆ دەدات و لە وێندر جێیان دەهێڵێت (وێنەی ١٦). پێش ڕۆژئاوابوون، خۆیان بۆ گوند دێنەوە.

**گاوان** ـ پیاوێکە بە مانگانە، بەیانییان گاڕانی گوندی بۆ دەشت دەبات و نیمەڕۆ بۆ ئاودان و هەسانەوە دەیانهێنێتەوە. پاش نیمەڕۆێکی درەنگ، جارێکی تر، بۆ دەشتییان ڕادەداتەوە و نزیک رۆژئاوابوون، بۆ گوند دەیانهێنێتەوە.

**مۆڵگە** ـ شوێنی ڕاگرتنی گاڕان لە ناو گونددا. گوندنیشەکان بە زۆری، گۆڕە پانێک لە ناوەڕاستی گوند بۆ مۆڵگە دیاری دەکەن. ئەمەشییان بۆ ئەوەیە کە بۆ هەموو لایێک یەک دووری هەبێت.

**توێرە دایکم** ـ چێڵ بە بیستنی ئەو دەنگە لە خاوەنەکەی ئارام دەبێت و بۆ دۆشین دەوەستێت.

**جۆرەکانی چێڵ**

ئەمەیان بە گوێرەی کەلەش و ئەندازەی شیردان و گۆشت و رەنگ و ئەمانەی خوارەوەن:

**کوردی (جافی)**

کەلەشی، لە چاو هی فریزەری و کوردی ـ فریزەری، بچووکترە. پەراسوو و هێسکی نێکەکانی لە ژێر پێستەوە دەرپەڕیون. ورگی گەورەیە. گوانی بچووکە. سیسکەکانی شۆربوونەتەوە (وێنەی ١٧). شیری، جگە لە وەرزی بەهار، لەبەر تێرنەخواردن (لە رۆژهەڵاتەوە تاکو پێش رۆژئاوابوون لەو دەشتە بە دوای لەوەڕ دەگەرێت) و هیلاکەتی و خراپی شوێنی داکردن، زۆر نییە. ئەوەندە نابووتە، پیاو بەزەیی پێی دێتەوە. رەنگییان، بە زۆری، ڕەش و خورمایی و زەردە.

**فریزەری**

فەرمانگەکانی وەزارەتی کشتوکاڵ، بە مەبەستی زاوزێکردن لەگەڵ چێڵی کوردی، لە هۆڵەندە و وڵاتی دیکەی ئەوروپا هاوردوویەتی. کەلەشیان دوو ئەوەندەی چێڵی کوردی دەبێت. دوو سێ کەرەتیش زیاتر لە هی خۆماڵی شیر دەدات. وەلێ، لەبەر جیاوازی کەش و هەوا و ئالێک و شوێنی داکردن، لە شیردان وەکو خۆی نەماوەتەوە.

**کوردی - فریزەری**

ئەمەیان بەرهەمی چێڵی کوردی و گای فریزەرییە. بە کەلەش و شیر لە چێڵی کوردی باشترە و لە فریزەریش خراپترە (وێنەی١٨). ئەو جۆرە چێڵە بە زۆری لە نێوچە دەشتاییەکان، بە نموونە، تەرجیل و سێگرتکان و ئاوایی دیکە بەرچاو دەکەوێت.

چێڵی کەڵخواردی، بە نۆ مانگ، دەزێت. بێچووەکەی بە گوێرەی تەمەن ناوی دەگۆڕێت: گۆلکی نێر دەبێتە جوانەگا و پاشان گا. گۆلکی مێ دەبێتە مێنگوین (نەوەش) و پاشان چێڵ.

گوندنیشەکان و ژمارەیێک لە دانیشتوانی شارەدێیەکان، بە مەبەستی ماست و گۆشت و پارەی کاش، یەک دوو چێڵ، بەخێو دەکەن.

**گــا**

ئەمەیان، بە گوێرەی مەبەستی راگرتن، سێ جۆرە.

**گای گۆشتێ** ـ جوتیارەکان هەر ئەوەندە گۆلکە نێرەکان رادەگرن تاکو گەورە دەبن و گۆشت دەگرن. هەر کاتێک پارەی باش بکات دەیفرۆشن.

**گای گاڕانێ** ـ گاران، بە مەبەستی ئاوسکردنی چێلەکان، پێویستی بە یەک دوو گا هەیە. گایەکە، یا ئەوەتە هی کەسێکە و بۆ خێری خۆی بەرەڵای ناو گاڕانی دەکات یانیش هی گوندە و بەگەڵ گاڕان دراوە.

دووسەرەییەکان، بە پارەی گشت چێڵدارەکان، گاییێکیان کڕیووە. گایەکە، سێ ساڵ لای یەکییان دەمینێتەوە. پاش ئەو ماوە دەبێتە هی ئەو کەسەی کە گایەکەی بەخێوکردووە.

**گـــای جـــۆتێ** - کەڵەشـــی گەورەیـــە و پـــڕ گۆشـــتە و بـــە هێـــزە و خەسێندراوە (وێنەی ١٩). خەساندن بە دوو شێوە ئەنجام دەدرێت.
**شێوەی ئاسایی** ــ جوانـەگا، دوای بەستانی هەر چوار پەلی بە گوریس، لـەعـەردی دەدرێـت. خەسـاس گونەکـەی لـە لای سـکیەوە، بـۆ ئـەوەی دەرپـەڕێت، دەکوشـێت. ئینجـا سـەرەکەی بـە مـوس، بـێ ئـەوەی هـیچ دەرمـانێکی لـێ بـدات، هەڵدەقەڵەشـێ و پێستەکـەی لیک دەکاتـەوە و گونەکەی بە دەمارەوە ڕادەکێشێت و دەری دەهێنێت و فرێی دەدات. پاشان پێستەکەی، بـێ دەرمـانکردن، بەسـەر یـەک دادەداتـەوە و، دوای یـەک دوو حەفتە قەتماغەی دەگرێت و چاک دەبێتـەوە. خەساندن، ئەگـەر بـە پارە بێت، بە دوو هەزار دینارە.
**شێوەی مۆدێرن** ـ دکتۆری ڤێتێریانی، گونی جوانەگایەکەی بـە کاتـەر قوت دەکـات و دەسـت لـە دەمارەکـەی نـادات و، برینەکـەی تیمـار دەکـات. جوتیارەکان، لە ترسی پیسبوونی دەمارەکە و نەخۆشی، شێوەی ئاساییان بەلاوە بێ مەترسیترە.

گای جۆتێ لە چەند گوندی نێوچە شاخاوییەکان هەیە. هەندێک لـە گوندەکان ئەمانەن: زێوە ـ ١ جۆت، هەرتـەل ـ ٣ جۆت (اسماعیل عبداللـه. مصطفی فقێ. خضر سعید عبداللـه). هـەرمک ـ ١ جۆت. کاسکان لـە دۆڵـی شارۆش ـ ٣ جۆت (ئیسای حەسینی. ئیسای حاجی قادری. حەسەن حەمەد)

خاوەن جۆتەکان، دوای جۆتکردنی زەویەکانییان و بێ کاری، جۆتی بۆ ئەو کەسانەی جۆتییان نییە دەکەن. ڕۆژە جۆتێک ( دۆنمێک کەمێک زیاد و کەم) بە چل هەزار بۆ پەنجا هەزار دینار دەکەن. نرخی یەک گـای جـۆتێ بـاش لـە گونـدی هەرتـەل بـە دوو ملیـۆن دینـارە. هـی نـاوەنجی بـە یـەک ملیۆن و شەش سەد هەزارە هی خراپیش بە یەک ملیۆن و دوو سەد هەزار دینـارە.

**گامێش**

گامێش، لەبەر ئەوەی هۆگری ئاوە، لە شوێنی بـە ئـاو بەرهـەمی زیـاتر دەدات و ئاسوودەتر دەژیت. شوێنی ئەوها گوندی قەرەنی ئاغا لـە قـەزای

ڕانیە و شوێنی دیکەیە.

کەلەشی گامێش کەمێک لە کەلەشی چێڵ بەرزتر و گەورەترە. شیریش زۆرتر دەدات.

**بەروبوومی ماڵات**

ماڵات زیندو و شیر و خوری و موو و کار و بەرخ گۆلک (گوێرەکە) قشپل و سەرگین و دوای کوشتنەوەش ـ گۆشت و پێست و ریخۆڵە دەدات. لە خوارەوە، بە درێژی، بۆ ئەوەی بە تەواوی سودی مەڕمان لەبەر چاو ڕۆشەن بێت، باسی یەک بە یەکییان دەکەم.

**شیر**

یەکێکە لە بەروبوومە هەرە گرنگەکانی ماڵاتی شیر دەر. وەلێ ئاژەڵەکان، لەبەر جیاوازی پێکهاتەی فسیۆڵۆژیان، وەکو یەک و بەقەدەر یەک و بە درێژایی ساڵ، شیر نادەن.

**مەڕ**ـ دوای بەران خواردن بە پێنج مانگ دەزێت. چوار پێنج رۆژ دوای زان، پێنج شەش مانگان لەسەر یەک، شیر دەدات. وەلێ لەو ماوەدا وەکو یەک شیر نادات. سەرەتای بەهار، کاتی گیاوگۆڵ زۆرە، دوو ئەوەندی کۆتایی بەهارە دەدات.

**بزن** ـ دوای تەگەخواردن بە پێنج مانگ دەزێت. چەند رۆژێک دوای زان، سێ چوار مانگ لەسەر یەک، شیر دەدات. قەبارەی شیرەکە لە سەرەتای بەهارەوە، لەبەر تێرخواردنی، دوو ئەوەندەی کۆتایی باهارە.

**چێڵ** ـ دوای کەڵ خواردن بە نۆ مانگ دەزێت. چەند رۆژێک، بۆ ئەوەی گۆلکەکەی باش پێ بگریت، نادۆشرێت. پاشان پێنج شەش مانگ لەسەر یەک شیر دەدات. وەلێ، لەبەر ئەوەی گوانی دوو سێ ئەوەندەی مەڕە و زۆتر دەخوات، شیر زیاتر دەدات

**خوری**

مەڕ ساڵێ جارێک و لە مانگی حوزێڕاندا دەبڕێتەوە. هەر مەڕێک تاکو دوو کیلۆ خوری دەدات. ئەو ساڵانەی بەهاری خۆش بێت و ئەوەندە خوریەکەی نەرمتر و تیسک درێژتر دەبێت. نرخی یەک کیلۆ خوری هەزار

دینارە. وەڵێ ئەگەر بێت بۆ وڵاتانی دەوروبەر بڕوات ئەوە نرخەکەی کەمێک زیاد دەکات.

**موو**

بزن ساڵێ جارێک و لە مانگی حوزێڕاندا مووەکانی بەمەقەس (کەلەخ) دەقاچێندرێت. هەر بزنێک تاکو حەفت سەد گرام موو دەدات. موو، ئەگەر مەڕەز نەبێت، لەبەر ئەوەی ناکرێتە شتێک، پارە ناکات.

مەڕدارێکی گوندی هەرتەل، ئەگەر چی دوازدە ساڵە حەیوانی نەماوە، مووی لە گوشان هەڵگرتووە. ناوناوە بای گوریسێکی لێ دەردەینێت.

**بەرخ**

مەڕ ئەگەر لە مانگی مایس بەران بخوات، لە مانگی تشرینی یەکەم دەزێت. واتە پێنج مانگ دوای ئاوسبوون. مەڕ ئەگەر تێر ئالیک بێت ساڵی دوو جار دەزێت. بە نموونە، لە کۆتایی مانگی ئەیلولی پار، دوو کۆزە بەرخم لە ناو هۆڕی مەڕدارێکی گوندی کنگربان دیت. کۆزێکییان پێنج مانگ لە کۆزەکەی دیکە گەورەتر بوو.

مەڕدارەکان بەرخەنێرەکان ـ جگە لە سێ چوارێکیان نەبێت کە بۆ بەران دەیان گێڕنەوە ـ لەگەڵ هەندێک لە بەرخەمێیەکان، بۆ فرۆشتن لە مەیدانی ئاژەڵان دەکات. یانیش لە کوێستانان بە قەسابان دەیانفرۆشیت.

ئاژەڵ لە مەیدانی هەولێر بە زیندوویی قەپان دەکرێت. لە مەیدانی حاجیاوا لە گۆترەیە. نرخی یەک کیلۆ لە بەرخی زیندوو شەش هەزار دینارە ـ نرخێکی ستاندار نییە ـ. دەلاڵ سەری دوو هەزار دینار دەستێنیت. نرخ بە دیناری سویسری دیاری دەکرێت و دیناری برێمەر(طبع) وەردەگیرێت.

مەڕدارێکی گوندی دووگرتکان پار، پەنجا بەرخی ( ٢١١٠ کیلۆگرام) بە ١٢٣٤٣ هەزار دینار فرۆشت.

**پێست**

پێستی کاخۆر(مەڕ، بزن، چێڵ، گا) دوای خۆشکردن دەکرێن بە قایش و

لە قایشەکە کەرستەی جۆراوجۆری وەکو پێڵاو و قایشی پشتێ و جەنتای جلکان و دەستی و هاوشێوەکانی لێ دروست دەکرێت. هەروەها دەکرێت بە هیزە بۆ پەنیر و ژاژی و روون هەڵگرتن.

پێستەکڕەکان، لە دەرەوەی کوشتەرگایەکانی شارە گەورەکان، تاکو نیمەڕۆ پێستەکان لە قەسابەکان دەکڕن و بە پیکاب بۆ شوێنی، بۆ ئەوەی بۆگەنی نەبێت، شوشتن و خوێ کردن دەبەن. پاشان بە پێستەکڕەکانی موسڵ دەفرۆشنەوە.

**شوێنی داکردنی ماڵات**

مەڕدار، ماڵاتی لە شوێنی تایبەت دادەکات و ئالێک دەدات. هەندێک لە شوێنەیکان ئەوانەی خوارەوەن:

**هۆڕ**

ئەمەیان، کە تایبەتە بە کۆچەرەکان، بریتییە لە ژوورێکی چەند مەترێک (پێنج تاکو دە مەتر) درێژ و چەند مەترێک( سێ تاکو چوار مەتر) پان. هۆڕ، بە گوێرەی بەرزی دیوار و شێوەی سەرگرتن سێ جۆرە.

**ء. هۆڕی شارستانی** ــ دیوارەکانی بەرزە(مەترێک تاکو دوو مەتر) و سەرەکەی شارستانییە(وێنەی ٢٠). مەڕدار لە خشت و قوڕ یان بلۆک و چیمەنتۆ دروستییان دەکات و بە کاریتە و شەقرە و قوڕ سەریان دەگرێت. دەرکەی لە بەژنی زەلام نزمترە و چەند دلاقەی، بۆ هاتن و چونی هەوا و رۆناکی، لە دیوارەکان بۆ کراوە.

**ب. هۆڕی لانکانی بە قوڕ** - دیوارەکانی نزمە(مەترێک و نیو کەمتر). سەرەکەی لانکانییە(وێنەی ٢١). مەڕدار لە خشت و قوڕ دروستییان دەکات و بە کاریتە و شەقرە و پووش سەریان دەگرێت. سەری بە قوڕ سواغ دەدات. دەرکەی لە بەژنی زەلام نزمترە. دلاقەی تێدا نییە.

**پ. هۆڕی لانکانی بە دار** - جگە لە کەرستە،جیاوازی لەگەڵ ئەوەی پێشوو، نییە. دیوارەکەی چەپەرە و سەرەکەی بە کاریتە و شەقرە و پووش و مشەمای شین و کندڕ گیراوە(وێنەی٢٢). ڕەوەند لە گەرمیان (شوێنی بەسەر بردنی وەرزی زستان) دروستی دەکات. دوایی بۆ کوێستان

کۆچکردن (شوێنی بەسەر بردنی وەرزی هاوین)، هەڵیدەوەشێنێتەوە. مشەما و کندڕی لەگەڵ خۆیان دەبەن و کاریتە و شەقرەی دەست لێ نادەن.

**هەیوان**

ئەمەیان لە پێش هۆڕ، بۆ پاراستنی مەڕ و بزن لە گەرمای هاوین و سەرمای زستان، دروست دەکرێت. سەرەکەی هەمان سەری هۆڕە. پێشەکەشی نەگیراوە.

**حەوشە**

ئەمەیان ئەو پارچە زەویەی پێش هۆڕ یان هەیوانە. زەویەکە لە سێ لاوە، بۆ وەستانی مەڕ و بزن، بە تێل پەرژین کراوە. دەرکەی داکردن و دەرکردنی بۆ کراوە.

**کۆز**

ئەمەیان هەمان هۆڕی مەڕ و بزنە. وەلێ زۆر لەو بچووکترە. کار و بەرخ، دوای هاوێردن ، تێدەکرێت. ئاخوڕی کۆز، لەبەر ئەوەی ئەوانە لەوەندەی پیویستییان پێیە زیاتر ناخۆن، هەردەم بێ جۆ نییە.

**ئاخوڕ**

ئەمەیان، بۆ ئالیک تێکردن، لە قوڕ و خشت یان چیمەنتۆ و بلۆک دروست دەکرێت. دوو جۆرە ئاخوڕ هەیە.

ء. ئاخوڕی ناو هۆڕ ـ درێژییەکەی بە قەدەر درێژی هەر چوار دیواری هۆڕە. پانایییەکەی حەفتا سانتیمەترێک و بەرزیەکەشی هەشتا سانتیمەترێک دەبێت.

ب. ئاخوڕی دەرەوەی هۆڕ ـ هەمان ئاخوڕی ناو هۆڕە. وەلێ ئەوەندەی ئەو درێژ نییە. درێژییەکەی چەند مەترێک( پێنج شەش مەتر) دەبێت.

**پەچا**

ئەمەیان ئەو پارچە زەویە بە تێل پەرژینکراوەی پێش دەرکەی حەوشەیە. دەرکەی داکردن و دەرکردنی بۆ کراوە. هاوینان، بۆ پاراستنی مەڕ و بزن لە خواردن و پەرت بوون، تێ دەکرێت.

**تەپاڵدان**

ژوورێکی بچووکی لە قوڕ وخشت دروستکراوە. دەلاقەیێکی گەورە، لە شوێنی دەرکە، بۆ کراوە. تەپاڵە( ریخ یان شیاکەی وشک) ی بۆهەڵگرتن تێدەکرێت.

**قشپلدان**

ژوورێکی بچووکی لە قوڕ وخشت دروستکراوە. دەلاقەیێکی گەورە، لە شوێنی دەرکە، بۆ کراوە. قشپلی وشککراوی بۆهەڵگرتن تێدەکرێت.

**حەوزی ئاوێ**

ئەمەیان چوار دیواری بە چیمەنتۆ و بلۆکە. بەرزیەکەی مەترێک و نیو دەبێت. ناوەکەی کۆنکریت رێژە. سەرەکەی والایە. کونێک، بۆ پێداهاتنی ئاو، لە بنی دیوارەکە بۆ هێشتراوەتەوە.

**کۆل**

ئەمەیان، بە گوێرەی ئەو مادەی کە لێوە دروست دەکرێت، دوو جۆرە.

**کۆلی ئاوێ**

ئەمەیان، بە گوێرەی ئەو مادەی لێی دروست دەکرێت، دوو جۆرە.

ء. کۆلی چیمەنتۆ ـ ئەمەیان لە بلۆک و چیمەنتۆ دروست دەکرێت. چەند مەترێک درێژ(پێنج شەش مەتر) و چەندیش(مەترێک) پان و هەشتا سانتیمەترێک بڵندە(وێنەی٢٣). سەرێکی بە دیواری حەوزی ئاوێ وەنووساوە. کاتی ئاودان، بۆ ئەوەی ئاو بێتە ناو کۆڵەکەوە، کونی حەوزەکە دەکرێتەوە و دادەخرێت.

ب. کۆلی پلێت ـ ئەمەیان لە پلێت دروست دەکرێت. چەند مەترێک درێژ (پێنج مەتری و دوو مەتر و نیوی هەیە) و چەند سانتیمەتر (هەشتا سانتیمەتر) پان و چەندیش بەرز(شێست سانتیمەتر) ە(وێنەی٢٤). پێنج مەترییەکان شەش پێچکە و دوو مەتر و نیوەکەیان چوار پێچکەی بۆ کراوە. کۆلی پلێت لەبەر دەمی شێرەی تانکی ئاوێ دادەندرێت. کاتی ئاودان، شێرەکەی دەکەنەوە و دەیگرنەوە.

**١. کۆلی ئالیکی**

هەمان کۆلی ئاوێیە. ئەمەیان هەم بۆ ئاو و هەمیش بۆ ئالیک دەبێت.

**هۆڕ**

ئەمەیان، کە تایبەتە بە مەڕدارەکان، ژوورێکی لاکێشەیی و هایوان لە پێش کراوە. دیواری پێشەوە، بۆ نەفەسدان و رۆناکی، چەند دەلاقەی تێکراوە. سەرەکەی، بە شێوەی جزیری(سێگەۆشەی لاتەریب) یان شارستانی تەخت یان کەمێک زەق(گوندی سولاخ)، گیراوە. زستانان مەڕ و بزنی، بۆ پاڕاستنییان لە سەرما، تێدەکرێت. بزن لەبەر ئەوەی خۆی لەبەر سەرما بۆ ناگیرێت، بە پێچەوانەی مەڕ، هەڵپەی بنە بان دەکات. بنی هەر چوار لا دیوار، بۆ ئالیک تێکردن، ئاخوڕی بە قوڕ و خشت بۆ کراوە. هەندێ لە ناوی دیکەی هۆڕ ئەمانەن: ئاغەڵ. گەڕ. گەوەڕ. بەردالان.

**تەویلە**

مەبەست شوێنی زستانەی ماین و ئەسپ و بارگین و هێستر و کەرە. تەویلەی هاوێنەی، لەبەر گەرمی رۆژەکەی، سەری نەگیراوە و هی زستانەش، لەبەر ساردی شەوەکەی، سەری گیراوە. بن لا دیوارێک، بۆ تێکردنی ئالیک، ئاخوڕی بە قوڕ و خشت لێ کراوە.

**دیو**

رەشەوڵاغ ـ گامێش و مانگا و گا ـ بۆ پاڕاستنییان لەسەرمای شەوی، زستان لە ژوور(دیو) دەکرێت. دیوەکە، بۆ نەفەسدان و رۆناکی، چەند دەلاقەی تێکراوە. بنە بەرمیلێک یان مەنجەڵێک، بۆ ئالیک تێکردن، لە دیوەکە داندراوە. رەشەوڵاغەکە، بۆ ئەوەی کاتی دەرکەکردنەوە، دەرنەپەڕێت، رێشمەی لەسەر کراوە و لە مێغزنجیر قایمکراوە. هەندێک لە ناوەکانی دیکەی دیو ئەمانەن: گەوڕی مانگا. گەوەڕ. ژووری چێڵان.

**جۆرەکانی کا**

ئەمەیان بە گوێرەی قەسەر و گیای کوتراو ئەوانەی خوارەوەن: کاجۆ. کاگەنم. کاماش. کانۆک و ... هتد.

**تفاق**

مەبەست ئەو خۆراکەیە کە لە وەرزی زستاندا بە مەڕ و بزن و مانگا و گا و گامێش دەدرێت. تفاق بۆی هەیە کا یان چرو بێت.

**ئالیک**

مەبەست ئەو کاو و جۆ تێکەڵاوەیە کە لە وەرزی زستاندا بە ماڵات و رەشەوڵاغ و وڵاغی بەرزە و دەدرێت. کا لە ئاخوڕ یان کۆل دەکرێت و جۆی بەسەر وەدەکرێت. پاشان بە دەست تێکەڵ دەکرێت. ئینجا ئاژەلی بەردەدرێتە سەر.

**گیاگزرە**

مەبەست گیای گەیشتوو کە لە نیوەی یەکەمی مانگی دووەمی بەهار دەست بە دروێنەی دەکرێت و باقەباقە دەکرێت. ئینجا، بۆ وەرزی زستان، بە شێوەی قۆڕیەگیا هەڵدەگیرێت.

**قۆڕیەگیا**

باقەگیای درواویی وشک بوو یان گێرەکراو(کوتراو) لە سەر پارچە عەردێک بە شێوەی قوچەکی دەخرێتە سەر یەک و سەرەکەی بە پووش، بۆ گێڕانەوەی ئاوی باران و بەفر، دادەپۆشرێت(وێنەی٢٥). پاشان گیایێکی درێژ بە ناوی ڕیسو دەسک دەکرێت و بادەدرێت و بە هەر چوار لای قۆڕیەگیایەکەدا شۆڕدەکرێتەوە. سەری ڕیسوەکان، بۆ ئەوەی ئاوی بارانی پێوە بچۆڕێتەوە، بەردیان پێوە دەکرێت.

**قۆڕیەکا**

پارچە زەوێک بە قەدەر پێویست تانە دەکرێت. کایەکەی تێدەکرێت و سەرەکەی وەکو هی قۆڕیەگیا بە پوش دادەپۆشرێت.

**دێوەگەڵ (دەچرو)**

مەبەست ئەو لقە ناسکانەی دار گەڵ یان مازووە بە گەڵاوەیە کە بە تەورداس لە وەرزی هاویندا دەبڕینەوە. ئینجا قەد قەد لەسەر یەک دەخرێتە نێوان دوو لقی دارێکی ئەستوور(وێنەی٢٦). لە وەرزی زستاندا، دوای ئەوەی گیاوگۆڵ بە چیایەکانەوە نامینێت، رۆژێ هەندێکی لێ

هەڵدەگیرێت و لە جیاتی ئالیک بە ماڵات دەدرێت.

هەندێ لە ناوی دیکەی دێوەگەڵ ئەمانەن: گەڵدێو. دێگەڵ. دێو. چرۆگەڵ. قۆریەگەڵ.

**کادین**

ژووری داکردنی ئەو کایەیە کە رۆژانە بۆ ئالیک دانی ماڵات و رەشەوڵاغ و وڵاغی بەرزە پێویست دەبێت. دەلاقەیێکی گەوروە لە یەک لە دوو دیوارە پانەکانی کادین، هێشتراوەتەوە. دەلاقەکە، لەگەڵ تەواوبوونی کا داکردن و تاکو ساڵی ئایندە، دەگیرێت. دەرکەیێکیش، بۆ کا دەرهێنان، لە کادینەکە کراوە.

**لەوەدە**

چوار دیوارێکی لاکێشەیی بە قوڕ و خشت کراو و بە بەرزی مەترێک و نیوە (وێنەی٢٧). کای زیاد لە ئالیکی ساڵانە، بۆ ساڵیک دووان، تێ دادەکرێت. سەرەکەی بە قەسەر یان پووش دادەپۆشرێت و تەنک، بۆ باران و ئاگر گێڕانەوە، سواخ (کەفماڵ) دەکرێت.

**ژێربابەتی٣. ئالیکی ئاژەڵ**

خواردنی ئاژەڵ، ئەگەر چی جۆراوجۆرە، لە سێ گروپی سەرکی پێکهاتووە. گروپەکانیش ئەوانەی خوارەوەن:

**یەکەم. گیاوگۆڵ**

گیاوگۆلێکی زۆر لە دەشت و چیایەکانی باشووری کوردستان هەیە. بەشێکی زۆریان، بە تایبەتی پێش پیر بوونیان، حەیوان دەیان خوات. ناوی گیاوگۆڵەکان، لە نێوچەییێک بۆ نێوچەیێکی دیکە، جودایە. مخابن لە توانامدانییە ناوەکان رێک بخەم. واتە گیایێک بە دوو ناوان نەنووسم.

هەندێک لە گیاوگۆڵی دەشتی دیبەگە(کەندێناوە) و مرکییە، ئەوانەن: بۆن خۆش. بیرەسۆر. دڕکە زەردە. دڕکە سپیلکە. چۆغان. حوشترالوک. رووتە. سەرسندە. سێسۆ. شاوێر. شەواشینک. شۆرەکات. قەمیش. قونجرکە. قەلقەلاشک. کەبەر(شیری مەڕی تاڵ دەکات). کەربەسە. کەرخنکێنە. کفر.

کلکه ریوی. کلک مشک. گێ بەلە. گۆرمزە. گیا گەنمە. گیامامزە. ماسیرە. هەوشان. هێرۆ... هتد. بەهارانیش ئەوانە: دانە قەتێ. دەرزیلە. ترشۆکە. خەرتەلە. خەزیمە. دۆمبەڵان. کاردی. کوارگ. کوریکە گاگرۆ (دەڵێن گاگرۆ بواری هینا بە درۆ). کوریکە نیسانە. سوارەدڕە. سێوەرۆک. عاجیلە... هتد.

هەندێ لە گیاوگۆڵی نیوچەی کفری ئەوانەن: پەیکۆڵ. جۆداس. سیازاخ. زەردەسیری. زەنگڵە گیا. سێ پەڕە(وێنجە). شەکرۆک. کەنگر. کوڵەزوانە. گەپڵە(پەندێک دەڵێت: عومرت بە عومری گەپڵەی بەهار بیبیا). ماسەڕە.

**مێگەل ڕادان**

ڕادانی مێگەل، بۆ لەوەڕاندن، ڕێوڕەسمی خۆی هەیە. ڕادان دوو شێوەی هەیە:

**١. نێری و بەران**

شوان چەند نێری و بەرانی خەساو، کە لە گچکەییەوە بۆ ئەوە بەخێو کروان دەنگ دەدات. کە ئەوانە ڕێیان گرت مێگەلەکە، بۆ هەر شوێنیک بچن، دوایان دەکەون. نێری و بەران (وێنەی٢٨)، هەر یەکە و زەنگوڵێکی گەورەی بە قایش لە مل کراوە. کە دەڕوات دەنگیکی موسیقای لێوەدێت. دەنگی زەنگوڵەکان، لەبەر ئەوەی لە کانزای جودا و بە شێوازی جودا دروست کراون، جودایە. هەندێک لە مەڕدارەکان، زەنگوڵی موسڵێی، لە هی شوێنی دیکە، پەسنتر دەکەن. ئەو چەشنە ڕادانە، لە ناو مەڕدارەکان، باو بووە و باوە.

**٢. مەڕیح**

مەڕدار، چەند کار و بەرخی، دوای زان لە دایکییان دادەبڕێت و لەگەڵ کەرێک، لە شوێنێکی سەربەخۆ، بە مەمەشیر گەورەیان دەکات. ئەوانە، هۆگری کەرەکەدەبن. کە هۆگریشی بوون، بە هیچ کلۆیەک لێی دانابڕێن. قەڕاسەی، بۆ هەر لاییێک رابکێشرێت ئەوانی بە دواوەیە و لەهەر شوێنێک لە مێخزنجیر ببەسترێتەوە ئەوانیش لە وێندر

دەوەستن (وێنەی ٢٩). مێگەلەکەش، چاو لەوان دەکەن و بە هیچ شێوەیێک، لێیان دور ناکەونەوە.

مەڕیح، کە مەڕدارە کوردەکان لە مەڕدارە عارەبەکان فێری بووێنەیی، لە لایێکەوە ناهێڵی مێگەلەکە پەرت بێت. لە لایێکی دیکەوە شوانی لە دەنگ دان و بەردهاوێشتن و چوون و هاتن، دەحەسێنیتەوە.

ڕادان، لە دوو کاتی جودا و بە ناوی جودا، وەکو لە خوارەوە نووسیومە، ئەنجام دەدرێت.

١. شیوەخوار ـ مێگەل، پاش نیمەڕۆیان، روونتر دوو دەمژمێر دوای دۆشین، بۆلەوەر ڕادەدرێت. ئێوارێ، لەگەڵ خۆرئاوابوون و هەندێ کەرەتیش تاکو کەوتنەوەی تاریک، بەرەو ڕەشماڵ دەهیندرێتەوە. مێگەل لە هەوێزێ دەنوێت یان، لە ترسی گورگ و دزین، لە حەوشی تێل بەند (لە نێوچەی قادر کەرەم ـ پەچاران) دەکرێت.

٢. شەوین (شەوکەژ) ـ مێگەل، لە نیوەشەودا (دەمژمێر دوازە بۆ یەکی شەو)، واتە دوای هەسانەوە و برسی بوونەوە، جارێکی دیکە لە بۆ دوو سێ دەمژمێران بۆ لەوەڕاندن ڕادەدرێتەوە. شەوین، لەبەر شکەت و ماندوونوونی شوان، دەکەوێتە سەر شانی ئەندامێکی مەڕدار. شەوێنکردن بۆ قەڵەوکردن و زۆرتر شیر دان ئەنجام دەدرێت.

**دووەم. چرو**

مەبەست لکە تازەکانی داربەڕوە. لکەکان بە شینی دەبڕێن و، بۆ زستان هەڵدەگیرێن.

**گەڵاکردن**

لە نیوچەی شاربازێڕ، دە کەس پێکەوە بۆ گەڵاکردن دەچن. هەر بە چەندان کارێک دەکەن و هەر گروپێکیش ناوی خۆی هەیە. بۆ ئەوەی گەڵا بکەی و لە شوێنێک کۆیان بکەیتەوە، دەبێت تەوری داربڕ و دوولکی لەگەڵ خۆی ببات.

گەڵابڕ ـ سێ کەس لە دە کەسان گەڵا دەبڕن.

مەڵۆچن ـ سی کەس لە دە کەسان گەڵای بڕاو کۆدەکەنەوە.
مەڵۆکێش ـ دوو کەس لە دە کەسان گەڵا کۆکراوەکە دەگەیێنە لای بنە دارێک.
دوولکدەر ـ کەسێک لە دە کەسەکان بە دوولک گەڵاکان دەداتە دەست گەڵاشێڵ.
گەڵاشێڵ (سەرگەڵ) ـ یەک کەس لە دەکەسە گەڵایەکان لەناو دارەکە دادەنێت.

**مەڵۆ**

کۆکردنەوەی گەڵاکان لەسەر یەکتر.

چەشنەکانی مەڵۆ

گەڵای بڕاو، بە شێوەی جودا، مەڵۆ دەکرێن. ناوەکانییان لە نێوچەیێکەوە بۆ نێوچەیێکی دیکە جودایە.

قۆڕییەیی (لە نێوچەی شاربازێڕ)

لقە بڕاوەکان، رووی بنەکانیان لە دەرەوە دەکرێن و رووی سەرەکانییان، واتە ئەو لایەیی پەلکەکانی پێوەیە، بۆ ئەوەی کاتی باران تەڕ نەبن، لە ناوەوە دەکرێن.

**سێیەم. پەرێز (جاڕ)**

دوای درووێنەیکردنی تەبارەی گەنم و جۆ، پەرێزەکانیان بە مەڕداران دەفرۆشرێت. نرخی پەرێز دەوەستێتە سەر رووپێو و شوێنی جوگرافی. بە نموونە، پەرێزیکی یەک عەلبەی لە دەشتی مرکییە بە ٣٥ هەزار دینار و پەرێزێکی ٥٠ دۆنم لە دەشتی قەراج بە ٧٥٠ هەزار دینار، بە مەڕدارەکان فرۆشراوە. پەرێز بە دوو شێوە دەخورێت: مێگەلی، بۆ لەوەڕاند تێدەکرێت. یانیش قەسەرەکەی بە شەنەی ئاسن کۆ دەکرێتەوە. لە عارەبانەی دەکەن و لە شوێنیک وەکو جۆخین هەری دەدەنەوە. کە قەسەرەکەیان لە گشت ئەو پەرێزانەی کە کڕیویانە کۆکرایە، بۆ ئەوەی بیکەن بە کا، دێن لە دەوی مەکینەی کا (خەرمان کوت. هەباشە) ـ مەکینەی پیرۆتی کە لە

کەرکوک دروست دەکرێت و نرخەکەی بۆ سێ ملیۆن دەچێت لە نێوچەی کەندیناوە و مرکیە ناوی داوەتەوە ـ دەکرێت.

کۆکردنەوە و کوتانی قەسەر کارێکی سەختە. بۆ ئەوەی کارەکە زوو تەواو بکرێت. لە رۆژئاوابوونەوە تاکو رۆژهەڵاتن سێ شفتی چوار چواری کاری تێ دەکەن. واتە کارەکە، بۆ ئەوەی گەرما کاری خۆی نەکات، بە شەو دەکرێت.

کای کوتراو، بە تراکتۆری عارەبانە بەدواوە، لە پەرێزەوە بۆ گوند دەگوازرێتەوە. کایەکە لە کادین یان لەودە ـ هەندێ جار بە دیوار و هەندێ جار بێ دیوار ـ دەکرێت. سەری لەودەکە، دوای ئەوەی کایەکە بە قەسر دادەپۆشرێت ـ سواغ دەدرێت. زستانان، بۆ ئەوەی کای لێ دەربینن، بەرەو سەفین بۆ ئەوەی بارانی لێ نەدات، دەشکێندرێت.

ماڵات لەوەڕاندن، بەڵامانەوە ئاسان دێتە بەرچاو. وەلێ لە پراکتیکدا، وانییە. لەو بارەوە شوانەکان باسی هەندێ یاسا و رێسا دەکەن. بە نموونە، ئەگەر رووی لە رۆژ بێت. خراپ دەلەوەڕێت و هەیپەی گەڕانەوە دەکات. وەلێ ئەگەر پشتی لە رۆژبێت، باش دەلەوەڕێت. هاوینان لە شوێنی بەرز و زستانان لە شوێنی وشک و پەنا باش دەنوێت. شوێنی بەردەلانی پێ خۆشە. لە شوێنی قوڕ ڕاناوەستێت. حەز بە نووستن دەکات. پاش عەسرێ ئارەزووی هەوێز دەکات.

### چوارەم. شینایی

شیناییەکانی وەکو تەماتە و باینجان و بامیە و بیبەر و کودی و بێستانی تەرۆزی و گندۆرە و شفتی و بابەتی دیکە، دوای تەواوبوونی بەرەکانییان، بە مەڕدارەکان دەفرۆشرێت. نرخی شینابییەکان، بە گوێرەی پانتاییە. بە نموونە، جێگەی یەل عەڵبە لە ۲۰۰ بۆ ۳۰۰ هەزار دینارە.

وێنجە(سێ پەڕە. شینکە)، ئالیکی ئاژەڵە و باشی دەخوات. ئەگەر کەسێک زەوی بۆ چاندنی وێنجە و ئاوی بۆ ئاودان هەبێت، بۆی دەکرێت مێگەلە مەڕێکی دوو سەد سەری لە جێوە بە وێنجە بەخێو بکات. وێنجە

لــە پــازدەی شــوبات بــۆ یــەکی مــارت پــێ دەگــات. خەسڵەتی وێنجــە لــە شــینبوونەوەی، دوای بڕینــەوە، دایــە. تــۆ بیبــرە ئــەو شــین دەبێتــەوە. واتــە گیایێکی تەمەن درێژە.

**پێنجەم. کاوجۆ**

حەیوان ئەو کاتە ئالیک ـ کاو و جۆ یان هەر جۆ ـ دەدرێت کە گیاوگۆڵ لــە ئــەنجامی پیربــوون و وشــکبوون، نــە لــە دەشــت و نــە لــە چیایــەکان نــەمابێت. ئــەوەش بــە زۆری لــە وەرزی زســتان و بــەهار دەبێــت. بــەرخی ساڵێ، واتە ئەوانەی لە مانگی تشرینی دووەم و کانوونی یەکەم زاون، بۆ ئەوەی قەڵەو بن لە وەرزی بەهاردا ئالیک دەدرێن.

مەڕدارەکان، کاو جۆی لە بازاڕ دەکڕن. نرخــی هــەر یەکــەیان پابەنــدە بــە هــەبوون و نــەبوونی گیــاوگۆڵ و پــەرێز و شــتی لــەو بابەتانــەوە. بــە نموونــە، ســاڵی پــار یــەک عەلبــە جــۆ(شــازدە تەنەگــە) بــە هەشــتا هــەزار دینــارە. شــەڵفەی(دوو گوشــی داغ ســۆری لێــک دووڕواو) کــا پــازدە هــەزار دینار بوو. هەندێک لە مەڕدارەکان، بۆ ئەوەی کەمتر چاویان لە بازاڕ، بۆ کڕینی کاو و جۆ بێت. موڵکەکانیان، هەڵبەتە ئەوانەی موڵکییــان هەیــە، بە مەبەستی دابێن کردنی کاو و جۆ، دەغڵی لێ دەچێنن.

**شەشەم. عەلەف**

بریتییــە لــە گــەنم و سۆیا و گــەنمــە شــامی و روونــی خــواردن. ئەمانــە هــەمووی پێکــەوە لێک دەدەن. پاشــان، بــە حــەیوان دەدرێــت. مــەڕدارەکان جــاران دانەوێڵــەکان و روونەکــەیان لــە بــازاڕ دەکــری. ئێســتا، لەبــەر پەیدابوونی کارگەی ئالیکسازی، لە عەلەف فرۆشەکان دەکڕن.

**حەوتەم. هورتکەنان**

بریتییە لە پارچــە ســەمون و پەلکــەنانی تەنــدوری نــەخوراو و کــەون و ڕەق بوو. مەڕدارەکان، کیلۆی هورتکەنانی بــە هــەزار دینــار لــەو کەســانە

دەکرِنــەوە، کــە رۆژانــە بــە عارەبانــەی دەســتی، بــۆ کرِینــی هورتکــەنان لــە ماڵان، بە حــەفت ســەد دینار یان بــە گۆرِینــەوە بــە مــادەی هیربــارشۆرتن و تــەباخ و دەستشۆر خاوێنکردنــەوە، ئــەم کۆڵانــان و ئــەو کۆڵان دەکــەن.

**هەشتەم. ئارد**

ئاردێکی زۆر لـه ماڵان، لـەبەر ئـەوەی هــەمووی یــان بـەشێکی زۆری لــەو ئــاردەی کــە لــە دەوڵــەت(بــائع) وەردەگیرێــت ناکرێــت بــە نــان، دەســت دەکـەوێت. خـەڵک ئاردەکـەی دەفرۆشـن و عارەبانچیـەکان فـەردەی پـەنجا کیلـۆیی بــە شــەش هــەزار دینــار دەکــرِن و بــە هـەشــت هــەزار دینــار بــە مەرِدارەکان دەفرۆشنـەوە. ئارد لـەسەر کا، بۆ حـەیوان، روو دەکرێت.

**نۆیەم. جیقنە**

حـەیوان جیقنـەی، لـەبەر ئـەوەی مادەی پرۆتینی تیدایە، بـاش دەخـوات. مەرِدارەکان، بە تایبـەتی کـە نرخـی کـاو و جـۆ هەڵدەستیت، جیقنــەی لــە مریشکداری (دواجن) یەکان، بۆ حـەیوان، دەکرِن و دەیان دەنـێ.

**ژێربابەتی٤. گرفتەکانی ئاژەڵ و چارەسەریان**

ئــاژەڵ، رِووبــەرِووی کۆمــەڵێک گرفتــی سروشــتی و مرۆیــی دەبێتــەوە. ئـەوەی لـە ئاژەڵدارەکان گویێ بیست بووم یـان هـەستم پێکـردووە، ئـەوانـەی خوارەبوون.

**نەخۆشی**

مـاڵات لــە ئــەنجامی کۆمــەڵێک فاکتــەری سروشــتی و مرۆیــی، نــەخۆش دەکــەویت. وەلــێ مــەرِ، لـەبــەر ئــەوەی لــە بــزن ناسـکترە، زیــاتر تووشــی نـەخۆشی دەبێت. مەرِدارەکان، نـاوی ئـەو نـەخۆشییانـەی خـوارەوە دەیـنن. ناوە زانستییەکـەیان، بۆ من نـەزانـدراوە.

*** نەخۆشییەکانی ماڵات**

هــەر یــەک لــە مــەرِ و بــزن تووشــی نـەخۆشــی جۆراوجـۆر دەبـن. مــەرِ

ئەمانــە: لــەرزەک. شــەلکەی تەبــەقــە. شــەلکەی مــامزە. شــەلکەی تــاعون. زەرتــک. بــاوێتــی. پیسکــە. دانکــە. گروتــی. گرکــە. ئەسپێ. هــەناوە کوتکــە. شانکە و هیدیکە. بزنیش ئەمانە: ریخە ڕەشە. کلک و هیدیکە.

*** نەخۆشیەکانی وڵاغی بەرزە**

هەر یەک لە ئەسپ و ماین و هێستر و کەر تووشی نەخۆشی جۆراوجۆر دەبن وەکو: بالووکە. بێنالّی. تانەی ناو چاو. کەسمە. گەنە لێدان. میز و هیدیکە.

***چارەسەرکردنی نەخۆشیەکان**

مەڕدارەکان بە گشتی و ڕەوەندەکان بەتایبەتی، لەبەر کەمی بنکەی تەندروستی و دکتۆری ئاژەڵ و دووری ئەوانەی هەن و ناڕێکی لە دابەشبوونی جوگرافییان، بە دوو شێوە ئاژەڵە نەخۆشەکانییان چارەسەر دەکەن.

*** شێوەی ترادیسیۆنی**

خەڵکانێک هەن، بە ئەزموونی خۆیان و هی ئەوانەی پێشخۆیان ئاژەڵی نەخۆش، بە بڕین و دەرمانی خۆماڵی و داغکردن، دەرمان دەکەن. بە نموونە:

* کەسمە ـ بەیتار بۆ چارەسەرکردنی کەسمە ژێر لووتی هێستر بە قەرەمبڕ شەق دەکات و پەنجەی لە گرێیەکە گیر دەکات و دەریدەکێشیت (وێنەی ٣٠). پاشان، بۆ ئەوەی برێنەکە پیس نەبێت و خۆی بگرێتەوە، بە خێواوک پاکی دەکاتەوە.

* پێچک شکان ـ بەیتار پێچکی شکاو دەگریتەوە. ئینجا پەڕۆکی لێ دەپێچیت و سێ چوار چیلکە داری دەخاتە سەری و بەبەن دەیبەستیت.

* سوڕانی بەرخ ـ بەرخی لە سک سوڕاو بە دەستی دەسوڕێندرێت. پاشان بەرخەکە بە ئاسایی دەبێت. بە نموونە، خاوەن مەرێکی بارزان لە حەفتایەکانی سەدەی بیستەمدا، شارەزاییێکی باشی لە ڕاستکردنەوەی بەرخ و منداڵ سوراو هەبوو.

* پشتکولی ـ چارەسی ئەو نەخۆشییە بە تۆزی سیسکەی وشککراو دەکرێت. تۆز بە برینی سەر پشتی وڵاغ دادەکرێت.

* پسکە(پەسیوی مەڕ و بزن) ـ چارەسەری ئەو نەخۆشیە بە دارپسکە دەکرێت. کەلی دارپسکەی دەکەن بە پارچەی پێنج سانتیمەترێک و بەنێی وەدەکەن. ملوانکەکە لە ملی مالاتی نەخۆش وەدەکرێت.
* مقاو(پەسیوی ئەسپ و ماین و هێستر) ـ بە گەرم داپۆشین چارەسەر دەکرێت.
ـ چارەسەکردنی مۆدێرن
مەڕدارەکان و ڕەوەندەکان، چارەسەری نەخۆشی ئاژەڵەکانییان بە دەرمان دان و دەرزی لێدان دەکەن. بە نموونە،چارەسەری کرم بە فرۆ دەکەن. گرگە و ئەسپێ ـ IVREMECTIN . هەوکردن ـ TERCYLA. ئەوەی بالکێشە ڕەوەندەکان دەرمانەکان بە فۆرمی شوشەکان و بۆن و رەنگ دەناسنەوە.
نەخۆشییەکان، هەندێکیان لە هەنێکیان، سووکترە و ئاسانتریش چارەسەر دەکرێن. بە نموونە ئەو مەڕەی تووشی ڕەشەبەر ببێت ئەگەر مرداریشی نەکاتەوە گوانەتووش بووەکەی دەبات. کەچی زەردەبەر، کە لە گواندەدا مەڕەکەی مردارناکاتەوە.

**بێجێی**

شوانکارەکان، ئەگەر مۆڵکیشییان هەبێت، بای ئەوەندە نییە کە ساڵێ دوازدەی مانگ تێیدا بژین. لەبەر ئەوە ناچار دەبن، گۆزەگۆز بکەن. پێش بۆ شوێنێک چوون، دەبێت خاوەنەکەی لە هەڵدانی ڕەشماڵ و لەوەڕاندنی مالات لە زەویەکەی ئاگادار بکرێتەوە. دەنا کێشەی بۆ خۆی دروست دەکات.

**لەوەڕ**

گیاوگۆڵ لە بەهاراندا و پووش و پەراش لە هاوین و پایز و زستاندا، تاکو کۆتایی هەشتاکانی سەدەی بیستەم، ئینجا لە ناو ئاقاری هەر گوندێک بوایە، مەشاعی بوو. واتە خواردنی بۆ خەڵکی گوند چۆن بوو بۆ بیانیش وابوو. وەلێ دوای چۆلکردنی کۆمەڵگا زۆرەملێییەکان و گەڕانەوەی ڕاگوێزراوەکان بۆ سەر مولکەکانییان لە گوندەکان، رێگەی لەوەڕاندنی

ئـاژەڵ بـێ رەزامـەنـی خـەڵکی گونـد، رێگـەی پـێ نـەدەدرا. لێرەدا مـەڕدار ناچاربوو، بۆ چوونـە نـاو ئاقار، بکەویتە سەوداکردن. واتـە کڕینـی پـاوان، ئینجا لـە برا گـەورە گوند(ئاغـا. کـاک. میـر) یـان خـاوەن موڵـک بێت. لیـرە چەند نموونـە، بۆ سەلماندنی قسەکانم، دەینمەوە.

ڕەوەندێکی نێوچەی خۆشناوەتی(فرحان قادر احمد)، ساڵی بە ١ ملیۆن و ٨٠٠ هەزار دینار و ٦ کاوڕ و گیسک( بەشی سلیم صابر و فریق رفیق ــ ٩٠٠ هـەزار دینـار و ٣ کـاوڕ و بەشـی عزیـز ....ـ ٩٠٠ هـەزار و ٣ گیسک) ئاقـاری گونـدی کـانی کـەوان دەخـوات. سـاڵانە کۆنتراکتەکـە نـوێ دەکەرێتەوە.

### ئاودان

ئـاودانی مـەڕومالاّت، لـەو شـوێنانـەی رووبـاریـان لـێ نییـە، بـۆ مـەڕدار کاری زیادی بە دواوەیە. باسی ئاودان، بە نموونـە، لـە چەند شوێن دەکەم.

### گوندی هەرتەل

مەڕدارێکی ئەو گوندە حـەوزێکی لاکێشـەیی حـەوت مـەتر درێـژ و پێـنج مـەتر پـان و بـەرزی مـەترێک بـە شـیش و چیمـەنتۆ لـە گـەرەکی بـەرۆژ دروسـتکردوە. پـێش هـاتنی مێگـەل لـە ئـاو پـڕی دەکـات. دەمژمێـر دەی بـەیانـی، بۆ ئاو خواردنـەوە، مێگەلـی دەینیتـە سەر.

### چیای کارۆخ

بـەفرێکی زۆر لـە زستان لـەسەر ئـەو چیایە دەکەویت. کەمتـەرەکان، بـە درێژایی ساڵ، بەفریان لـێ نـابڕێت. هەر کەمتـەرەی دوو سـێ قۆچـە کێـوی، دەیـان سـاڵە، لـێ دانـدراوە. مـەڕدارەکان، بـە قۆچـە کێـوی بـەفری لەلـە دەکەن. ئینجا پەلـە دارێکی تـێ دەبـڕن. لەگـەڵ شکاندنـەوەی پەلـەدارەکـە پارچـە بـەفرێک(کەسـتەکەبەفر) لـە بەفرەکـە دەبێتـەوە. پـەتێکی تـێ دەخەن. ژنان لـە پشتی خۆیانـی هەڵدەدەن و بۆ سەر بیرێی دەیگۆزنـەوە.

بیر(قۆرت) ی بەفر، دوو مـەترێک قوڵـە. بـە بـەرد هـەڵێنجراون یـان بـە چیمەنتۆ لـەبغ کراوە. لایـەکـی، بـۆ هـاتوچۆ، کـەمێک لێژکـراوە. چەنـد لکـە

داری ئەستور، لەسەر دەمی بیرەکە داندەندرێن. کەستەکە بەفرەکان، لەسەر ئەو دارانە کەلەکە دەکرێن. ئاویان، لە ئەنجامی رۆژ پێ کەوتنیان، لێ دەچۆرێتەوە و دەکەویتە ناو بیرەکە. ژنان بە پەقرەج (ستل) ئاوی لە بیرەکە هەڵدێنجن و لە کۆلی دار دەکەن. ئینجا مێگەلی، بۆ ئاوخواردنەوە، دێتە سەری.

کەمتەرەکانی چیای کارۆخ ئەمانەن: بردێنی، بنبەرد، چاکەڵە، شمێتکان، میرسالم، واریٚ سۆر، وارە میر.

کەمتەرەکانی چیای بێترخێن ئەمانەن: قەرەمحم

کەمتەرە، بۆ لاوان، شوێنی چاو بە یار کەوتنە. هەر بۆیەش لە بەیتێکی فۆلکلۆری بەو شێوە باسی کراوە.

پەرژین و پەرژین پەرژین لە خاوێ

باخەکم دانا لە ڕێی سەراوێ

بەشکەم جاربەجار یار بێتە ئاوێ

**کێوی**

کێوەیەکانی دەشت و چیایەکان، لەسەر بنەمای خۆراکییان بۆ دوو گروپ دابەش دەکەم.

**یەکەم. گۆشتخۆر**

ئەمەیان، بە گوێرەی شێوەی لەشیان، بۆ دوو جۆر دابەش دەکەم.

ء. حەیوان ـ بزنمشک. دووپشک(کولاژم). دەڵەک. چەقەڵ. ڕێوی. ژووژک. سیخوڕ. شەوگەرد. قوزبڕکە(جۆبڕکە). قومقمۆک. کەمتیار. گورگ. گۆڕهەرقەنە. مار و ... هتد.

ب. باڵندە ـ باز. باشووکە و ... هتد.

## گورگ

ئەمەیان بە زەڕترین کێوی گۆشتخۆرە. هەر بۆیەش مەڕدارەکان، حسابی بۆ دەکەن. بە نموونە، سەگی بۆ پاسەوانی ڕادەگرن. مەڕەکان لە حەوشە دەکەن. شەوان مەڕەکان بە سەردەکەنەوە. ڕەوشتی گورگ،

ئەگەر بە ناو مێگەل کەوت، دەیانیان دەخنکێنی. وەلێ هەر یەکەکییان دەخوات.
شوان،لە زاری گورگ، دەگێڕتەوە.

قورپانت دەبم مەڕێ
وەکی دەخۆم دونگی تەرێ
خۆت ناکەی لە لەوەڕێ
عەمرت نەمینێ بزن
وەکی سەری کلکت دەگەزم
هاوار دەکەی شوان
سە و قوتەگۆپار لە دوو دەبەزن

**دووەم. گیاخۆر**

ئەمەیان، بە گوێرەی لەشییان، دوو جۆرە.
ء. حەیوان ـ بزنەکێوی. کێروشک(خۆشبەزۆک. کەروێشک). مامز و ... هتد.
پاراستنی فلۆرای کوردستان، لە ئەستۆی دەوڵەت و میللەت دایە. هەر یەکەی بە گوێرەی دەسەڵاتی خۆی کار دەکات و کاری کردووە.
دەوڵەت ـ راوکردن، بە گوێرەی یاسا، قەدەغەیە. سەرپێچکەران سەزا دەدرێن.
میللەت ـ دەیان ساڵە لە نێوچەی بارزاندا راو ناکرێت. هەر بۆیەش بە مێگەل بزنەکێوی لە چیای شیرین و هیبەت دەبیندرێت(وێنەی ٣١).
مخابن، لە کانوونی دووەمی ئەم ساڵدا ژمارەیێکی زۆریان، لە ئەنجامی تووش بوونیان بە ڤارۆسێکی چارەسەرنەکراو. لەناو چوون.
سێ چوار ساڵێکە، بە مەبەستی بۆژاندنەوەی فلۆرا لە زورگەزراو و دەشتی دیبەگەدا، خەڵک مامزی ماڵێییان یان دوو سێ لەوانەی گێڵگەکانییان، بەرەڵا دەکەن.
ب. باڵندە ـ رەشۆڵە. سوسکە. قەتێ. کەو. ... هتد.

**ژێربابەتی ٥. ئاژەڵی باربەر( پشتەبەر)**

مەبەست ئەو ئاژەڵانەیە کە جوتیار یان ڕەوەند بۆ جۆت کردن و هینان و بردنی بار و هاتوچۆکردنی ناو باخچە و هەندێ کەرەت سەفەر پێکردن رایان دەگرێت.

ئاژەڵی باربەر ئەورۆ، لەبەر پەیدابوونی ترومبێل بۆ هاتوچۆکردن و تراکتۆر بۆ جۆتکردن، باوی نەماوە. بە دەگمەن ئاژەڵی بارەبەر لە گوندەکانی نێوچە دەشتاییەکان بەر چاو دەکەویت. کەمێک لە گوندەکانی نێوچە شاخاویەکان ماوە. ئاژەلی بارەبەر ئەمانەن:

**کەر(گوێدرێژ)**

جوتیاری گوندەکانی نێوچە شاخاویە سەختەکان، نێرەکەرێک (بە دەگمەن، لەبەر ئەوەی بەشەرمی دەزانن، ماکەر) بۆ ئیش و کاری خۆیان بە خێودەکەن(وێنەی ٣٢). بە نموونە، جوتیارێکی گوندی هەرتەل ئەو کارانەی بە کەرەکەی دەکرد: زەوی کێڵان بۆ چاندنی دەغل و دان. بن دانەوەی رەز. هینانی بارەدار. بردنی زبڵی حەیوان (تەپاڵە. قشپل) بۆ باخچە. مەڕدارێکی هەمان گوندیش ئەو کارانەی پێ دەکرد: خزمەتکردنی شوان (هەڵگرتنی خواردن و خواردنەوە. سواربوون بۆ کەوتنە دووی مێگەل). گواستنەوەی رەشماڵ و چادر و ناوماڵ بۆ ئەو شوێنانەی ترومبێلیان، لەبەر نەبوونی جادە، ناگاتێ و کاری دیکە.

جوتیارەکانی گوندەکانی نێوچە شاخاویەکان، کەری بۆ جۆتکردن ئەم لەو ئەو لەم دەخوازنەوە. ئەمەیان، پەیوەندی کۆمەڵایەتییان، لەبەر ئەوەی پێویستییان بە یەک دەبێت، بە هێتز دەکات و لە هەمان کاتیشدا، کەمتر بە بەخێوکردنی کەر ماندوو دەبن و خرجیشییان کەمتر دەبێت.

نرخی کەر لە نێوچەیێک بۆ نێوچەیێکی دیکە، دەوەستێتە سەر پێویستی خەڵک، بە نموونە، فەلاحێکی گوندی هەرتەل نێرە کەرێکی سێ ساڵەی بە شێست هەزار دینار لە حاجیاوە کڕیووە.

دیاردەیێکی زۆر بێ وێژدانانە لە گوندەکان بەرامبەر کەر هەیە. خاوەنەکانییان، دوای تەواوبوونی کارەکانییان، بۆ ئەوەی ئالیک و ئاوی

نەدات، لە وەرزی پایز بەڕەڵای دەشتێی دەکات و کاتی ئیش هاتن، ئەگەر لەو ماوەدا بە زیندوویی مایەوە، دەیان گرێتەوە.

**هێستر(ئێستر)**

هینان و بردنی بار و هاتوچۆ لە گوندەکانی نێوچە شاخاویەکان، لەبەر نەبوونی رێگەوبان بۆ ترومبێل، بە زۆری بە پشتی هێستر ئەنجام دەدرێت. هێستر، لەبەر ئەوەی پارەی زۆرتر دەکات و بە تاقەت ترە، مامەڵەی کەری لەگەڵ ناکرێت. وەلێ هێسترێک کە تووشی نەخۆشی سمەخرە دەبێت، لەبەر نەبوونی بەیتار، بەرەڵا دەکرێت.

چەشنەکانی هێستر ئەمانەن: ئاسایی(دایک ماین و باوک کەر). گاویلکە(دایک ماکەر باوک ئەسپ) (وێنەی ٣٣).

**ئەسپ و ماین و بارگین**

هەندێ کەس بۆ هەوەس و سواربوون و تەرادانێ و قۆشمە و جارجار بۆ هینان و بردنی بار ئەسپ و ماین و بارگین(بارگێر) بەخێو دەکات. لە سەرەتای نۆهەتەکانی سەدەی بیستەم، لە هەندێ شاران، بە نموونە هەولێر، شوێنی بە خێوکردنی ئەسپ و ماین و بارگین بە مەبەستی کڕین و فرۆشتن، پەیدا بوو.

چەشنەکانی ئەسپ و ماین ئەمانەن: بەحراوی. پۆلیسی. چوارپەل سپی. حدود. حەمدانی. رەسەن. سەرگیش. شێ. عوبەیە. کەحێلە. کەویتی. ناوچەوان قەش و هیدیکە.

**ژێربابەتی ٦. پەلەوەڕ**

پەلەوەڕی جۆراوجۆری وەکو مریشک(مامر)، قاز (شامی. ئاسایی)، مراوی (خۆماڵی. تورکی)، سۆنە. چینوماچین، عەلەشیش(قەلەمون). کۆتر... هتد لە ماڵان و مریشکداریەکاندا، بە مەبەستی هێلکە و گۆشت و توک، بە خێو دەکرێت.

پەلەوەڕ، بە نموونە، مریشک، بە گوێرەی تەمەن: جووجکە ــ فروج.

نێرەکـان دەبنــە کــەرەباب(کەلـەشێر. دیقـل) و مێیــەکان دەبنــە باڕۆکــە ــ مریشک ـ مریشکی سەرەمر.

پەلــەوەڕ، لــە رووی چەشـنی ئالیـک و شـوێنی بــەخێوکردن و ژمــارە و ماوەی سەربڕین و کەسانی سەرپەرشتیار و دەرامەتی سالانە و مەبەستی بە خێوکردن و خەرجی، بە دوو شێواز بە خێودەکرێت.

**شێوازی ترادیسیۆنی**

مریشــکی کــوڕک بــوو، تــاکو پــازدە هێلکــەی بــۆ دادەندرێتــەوە. دوای بەسەرچوونی سێ حەفتە، جووجکە لـە هێلکـە دێتـە دەرێ. جووجکـە تـاکو فەراقـە بـوون بـە پڕپۆرە گـەورە دەکرێـت و تـاکو سـەر بـڕین بـە گـەنم و پاشماوەی خواردن بە خێودەکرێت.

**شێوازی مۆدێرن**

ئـەمـەیان دووکاری بە دوای یەکەوەن:

ء. هێلکــە دانانــەوە ــ هێلکــەی بــەفس(ملقــح)، دەخرێتــە نــاو مەکینــەی جووجکە هەلێنان(مفقس) ەوە. جووجکە، دوای تێپەربوونی سێ حەفتە لـە هێلکە دێتە دەرێ. پاشان بۆ شوێنی گەورەکردن دەگۆزرێنەوە.

ب. مریشکداری(دواجـن) ــ چلـوپێنـج رۆژ عەلـەفی جۆراوجـۆر بـە جووجکـە دەدرێت. لەو ماوەیەدا کێشی بەرەبەرە زیاد دەکـات و تـاکو خـۆی لـە سـێ کیلۆ دەدات.

نرخـی یەک کیلۆ مریشکی زیندوو بە سێ هـەزار و پێـنج سـەد دینـار و هی سەربڕاو و پاک کراوەش چوار هەزار دینارە.

**ژێربابەتی ٧. مێشەهەنگوین**

بـەخێوکردنی مێشەهەنگوین، بۆ دانیشتوانی هەندێک لە گوندی نێوچـە شـاخاویەکان( پـردی سـمۆر، قــەلات، سـوورەدێ، کـۆلکێ، رایـات) پیشــەی سالانـەیە. مێشە هەنگوین بە دوو شێواز بە خێو دەکرێت.

### شێوازیترادیسیۆنی

مێشە هەنگوێن لە غەلێف دەکرێت. غەلێفەکان، بۆ چاو لێ بوون و پاراستن، کەپریان لەسەر دەکرێت یان سەریان بە پلێت یان مشەما دادەپۆشرێت (وێنەی ٣٤).

### شێوازی مۆدێرن

مێشەهەنگوێن لە سندوقێکی لاکێشەیی (درێژی ـ ٧٠ سم. پانی ـ ٥٠ سم. بەرزی ـ ٥٠ سم) دەکرێت. مێشدارەکان، بە مەبەستی زیادکردنی بەرهەم، گەرمییان و کوێستان بە مێشەکانییان دەکەن. بە نموونە. مێشدارێکی گوندی کۆلکێ (پیرەفات) بە ناوی سەلیم پێرار مێشەکانی بۆ گوێستانی وێزێ و پار بۆ کوێستانی هۆرنێ بردبوو.

### مێش برینەوە

مەبەست دەرهێنانی هەنگوێنەی لە غەلێف و دەرهێنانی چەند شانە لە سەندوق و دەست لێنەدانی دوو سێ شانە، بۆ خواردنی مێشەکان تاکو دووبارە شانەکان لە هەنگوین پڕ دەکەنەوە.

مێشدارەکان سەرگینی لە پەمپێ مێشا دەکەن. هەندێک نەفتی، بۆ ئەوەی دووکەڵ بکات، پێ دادەکەن و و ئاگری پێ وەدەنێن. دووکەڵەکەی لە شانەکان دەدەن. زۆربەی مێشەکان کە بۆنی دووکەڵ دەیان گاتێ دەفڕن. ئەوانەی دەمینێنەوە بە فلچە لایان دەبەن (وێنەی ٣٥).

### بەرهەمی ساڵانە

ئەمەیان دەوەستێتە سەر خۆشی و ناخۆشی وەرزەکانی ساڵ. بە تایبەتی بەهاریان. چەندی ئەم وەرزەیان خۆش بێت ئەوەندە هەنگوین، زۆر دەبێت. مێش لە بەهاری خۆشدا، لەبەر ئەوەی بۆ شیلەی گولان زۆر دوور نافرێت و کەمتر ئەم گوڵ ئەو گوڵی دەکات، کەمتر ماندوو دەبێت. بە نموونە، بەرهەمی حەوت مێش، ئەم ساڵ، لە گوندی سوورەدێ بیست

کیلۆ هەنگوین بوو. کەچی پار لەبەر خۆشی وەرزی بەهارچل کیلۆ بوو.

مێشدارەکان، بۆ ئەوەی مێشەکانییان هەنگوین زیاتر بدەن و کەمتر ماندوویان بکات، شەکراوێکی خەستییان(دوو جام شەکر و سێ جام ئاو) بۆ لە تەشتێک دەگرێتەوە و لە پێشیان دادەنێت. میشەکان لە جیاتی ئەوەی بە دوای شیلەی گوڵ بگەڕێن لەسەر ئەو شەکراوە دەنیشن و ئەوەندی پێیان دەچێت دەیبەن و دەیکەن بە هەنگوین.

تەشتی شەکراوەکە، بۆ ئەوەی مێشەکان نەکەونە ناوی و نەخنکێن، دەبێ پەل بێت و چەند چیلکەداری باریک و بە قەد تەشتەکە درێژ(لە هەندە شوێناندا پارچە تەپەدۆری باریک بۆ ئەو مەبەستە بەکار دەهێنن)، بۆ لەسەر وەستانی مێشەکان، دەخەنە ناو تەشتەکەوە.

نرخی یەک مێشە هەنگوینی(غەلێف. سەندوق) زیندوو، لە گوندی سوورەدێ، لە بەهاری پاردا لە نێوان سەد و بیست هەزار بۆ سەد و سی و پێنج هەزار دینار بوو. لە گوندی کۆلکێ لە ناوچەی گۆڕەتوو ـ سەد و پەنجا هەزار دینار بوو.

مێشی فرۆشراو، ئەگەر بێتوو بۆ چەند رۆژێک لە شوێنی خۆی دوور نەخرێتەوە. ئەوە لەکاتی درچووندا، ئۆتۆماتیکی بۆ ناو مێشەکان دەگەڕێتەوە. لێرە، لەبەر ئەوەی کەسییان لە ناو سەندوقانیان جێی ناکەنەوە، تووشی هەلاکەت دەبێت. مێشدارەکان چی دەکەن؟ سەندوقەکان بار دەکەن و سەریان بە شتێک دادەپۆشن. ئینجا بۆ سێ چوار رۆژ، بۆ ئەوەی نە چیتەوە شوێنەی کۆنەکەی و سەر بەخۆ بێت، دوور دەخاتەوە. بە نموونە، مێشدارێکی سوورەدێ چوار سەندوق بە مێشەوە بۆ سەنگەسەر بردن و دوای حەفتەیەک لە وێوە بۆ سوردەدێ هینایەوە.

نرخی یەک کیلۆ هەنگوین، پار پایزێ لە گوندی کۆلکێ بە بیست و پێنج هەزار دینار بوو. ئەو ساڵ، هەمان مێشدار، بە سی و پێنج هەزار دینار دەیفرۆشێت.

# سەربابەتی سێیەم
## پیشە و کاڵای دەستکرد

بەشێک لە پێداویستیەکانی کشتوکاڵی و ئاژەڵداری و ناومال و پۆشاک، بە دەستی دارتاش و ئاسنگر و تەنەگەچی و پەڕەچی و کارگەچی (هەلاج) و جۆلا و بەرگدوور دروست دەکرێت. بەشەکەی دیکە، بە حازری لە بازاڕ دەست دەکەوێت. تایبەتمەندییەکانی پیشە و کاڵای دەستکرد، ئەمانەن:

- لە دوکان یان لە ژوورێک دروست دەکرێت.
- نرخییان، لەبەر ئەوەی دەستکردە، لە هی کارگان گرانترە.
- وەستا و شاگرد، پێکەوە ئیشی تێدا دەکەن.
- بەرهەم، بای بازاڕە.
- بەرەو نەمان دەچێت.
- کاڵەی بەرهەم، بە زۆری گوندنیشەکان بەکاری دەهێنن.
- خەسڵەتی نەتەوەیی پێوە دیارە.
- ئیشەکان، بە زۆری، پیاو دەیکەن.
- هەندێکییان پشتاوپشتە.

### ژێربابەتی١- پیشە و کاڵای خوری و پێستەمەنی

مەبەست گشت ئەو کاڵانەیە، کە ژن یان پیاو، لە ماڵان یان لە دوکانان یان لە کارگان، بە دەستی یان بە مەکینە یان دەست ـ مەکینە، لە خوری مەڕ و مووی بزن و هاوشێوەکانییان، دەیانچنن یان دەیانرێسن یان دروستیان دەکەن. ئینجا کاڵاکە بۆ خۆی یانیش بۆ فرۆشتن بێت. خوری و موو بنەمای چەندین پیشە و کاڵای دەستینە. ئەوانەی خوارەوە، هەندێکییانن.

## ١- کارگەچیاتی(هەلاجی)

مەبەست لە کارگەچیاتی گشت ئەو شتمەکانەیە کە کارگەچی لە لوا (بەرگن)ـ خوری بەرخی یەک ساڵ ـ لە دوکان یان خانوویێک دروستیان دەکات. هەندێک لە تایبەتمەندیەکانی کارگەچیاتی لە رۆژی ئەورۆدا ئەمانەی خوارەوەن:

ـ کارگەچیاتی، بۆ هەندێ کەس، پیشەی رۆژانەی خێزانە(باوک و کورە). بە نموونە، وەستا جبار حسین احمد لە کفری. ئەو پیاوە سێ منداڵی، بەردەستیی دەکەن. رۆژانی هەینی و پشوودان، هەندێ رۆژیش پاش نیمەرۆیان، کورە گەورەکەشی ـ فەرمانبەری ئاسایش ـ بۆ دوکان دێت و ئیش دەکات. هەروها بۆ عمر علی یش پیشەی رۆژانەیە.

ـ کارگەچیاتی بۆ هەندێ کەس، لەبەر بێ بازاڕی، تەواوکەری پیشەیێکی دیکەیە. بە نموونە، وەستا علی صالح لە شارۆچکەی کۆیە، جگە لە کارگەچیی فرۆشیاری بەتانییە و شتی دیکەی لەو بابەتەشە. ئەو رۆژانەی کاریان بۆ دێت، لەگەڵ براکەی کارەکەی ئەنجام دەدەن.

ـ کارگەچیاتی، یەکێکە لەو پیشە میللیانەی، کە ساڵ لە دوای ساڵ مەیدانەکەی، لەبەر بێبازاڕی، تەسک دەبێتەوە و بەرەوە نەمان دەچێت.

ـ بەرهەمی کارگەچییەکان، مەڕدارەکان و تاک و لۆک خاوەن دیوەخان و گوندنیشەکان. بەکار دەهێنن. خەڵکی دیکە وەکو کەلەپوور (تراث) ی میللی چاوی لێدەکەن.

ئەمانەی خوارەوە، بەشیکە لەو شتانەی کارگەچی بە دەست و هەندێ کەرستە دروستیان دەکات:

### قاپووت

پۆشاکێکە لەسەر شێوەی جەواڵ. پێشەوەی، لە ملەوە بۆ گۆزینگ، شەقکراوە. شوێنی مل، بۆ رەحەتی مل، بڕاوە. بێقۆڵە و شوێنی قۆڵەکانیشی نەبڕاوە. پانییەکەی لە مەترێک کەمێک زیاترە. (وێنەی ٣٦).

کارگەچی، لەسەر داوای خاوەن مالات یان بەرچاڤکردن بۆ فرۆشتن لە

بازاڕدا، لـه لـوای ڕەنـگ سپی دروستـی دەکـات. قـاپووت لـه بـازاڕی جـۆت قاوەی کـەرکوک دەست دەکـەوێت. کارگـەچی لـه کۆیـه و کفری، تـاکو ئـەوڕۆ، دروستـی دەکـەن. قاپووتـی ڕۆژێ شەش کیلۆ و هـی شـەوێش هەشت تـاکو دە کیلۆ لـوای تێدەچێت.

قـاپووت، بـه زۆری شـوانـی دەشـتـی هـەولێر و دەشـتـی کۆیـه و نێوجـەی خۆشناوەتـی، بـۆ خۆپاراستـن لـه سـەرمای زستـان و پێخـەو لـەسـەر جـل و بەرگـی ڕۆژانـه لـەبـەری دەکـات. شـوان لـه ڕۆژی بـەباران، بـۆ ئـەوەی تـەڕ نـەبێت و ئـاوی نـەمژێت، نـایلۆنـی بـه خـۆی دادەدات.

دروسـتکردنـی قـاپووت و کـەپـەنک، کارگـەچی، بـەو شـێوە ئـەنجـامی دەدات: لوایەکه لـەخرت و خـاش پاک دەکاتـەوە،جاران بـه دەست(کوتـک و کـەوان) و ئـەوڕۆ بـه مەکینـه، پـەڕەی دەکـات. پاشـان بـه دەستـی چـەپی چەنگ لـه لوایەکه دەدات و بـه شـەنەی دەستـی ڕاستـی لـەسـەر ڕایـەخ بـه یـەک ئـەنـدازە، پـەرتـی دەکـات. نـەرم دەیڕشـێنـی ئینجـا دوو چیغـی، بـه شێوەی خوارەوە، بـۆ ئـەنجام دەدات.

**چیغی یەکەم**

دارچیغ ـ دارێکـی دوو مەتر و نیو درێژە. بیست سـانتیمەتر ئـەستوورە ـ لـه سـەر لوایـەکـه لـه سـەرێکەوە پاڵ دەخـات. ئینجـا زۆر بـه سفتـی لـولـی دەدات و کنـدڕی لـێ دەئـاڵێنـێ. ئـەم سـەر و ئـەو سـەری کندڕەکـه لـەبـەر قفری یەکەم لـه هـەر دوو سەران ڕادەکرێنـەوە. نێـوان قرفـەک و قرفـەک دە سـانتیمەترێک دەبێـت. نیـو کـاتژمێر، بـه مەبـەستـی یـەک گـرتن، بـه قـاچ دەگێڕدرێت.

**چیغی دووەم**

کندڕەکەی لـه چیغەکـه دەکەنـەوە. چیغەکـەی لـەسـەر عـەرد ڕادەخـەن. پارچـه نـایلۆنـەکی، بۆ ئـەوەی لـه کاتـی گێڕانـی دووەم یـەک نـەگرێت، یـەک لایی قـەد دەکرێت. وەستـا، شوێنـی مل لـه لایی سەرەوە و قوڵ لـەلایی چەپ و ڕاسـت، بـه مەقـەس دەبڕیـت. ئـەو قـەدکردن و بڕینـه پـێ دەگـوترێ وەسـتایی. ئـاوڕشـێنێکی نـەرمی بـۆ دەکرێـت و نیوکـاتژمێر دەگێڕدرێـت.

پاشان دەدرێتە دەست شاگرد. ئەویش پێنج شەش کاتژمێر دەیگێڕێت. ژووری گێڕانەکە دەبێ گەرم بێت. بۆ ئەو مەبەستە هەندێ کات سۆپە پێدەکرێت. شاگردەکە بە دەرپێیەکی بە زۆری سپی و تاقە فانیلە کار دەکات و لە ئەنجامی گەرمی و شکەتی تکتک ئارەقەی لە دەم و چاو و لەش دەچۆڕێتەوە.

قاپووت و کەپەنک حەوت هەشت کاتژمیر، کاری بۆ دروستکردنی دەوێت. دەست هەقی وەستا، ئەگەر چی لە شوێنیک بۆ شوێنیکی دیکە و ناسیاو و نەناسیاو وەک یەک نییە، لە سی بۆ چل هەزار دینارە.

**کەپەنک**

جیاوازیەکەی لەگەڵ قاپووت، تەنیا لە شێوەی قۆڵەکانی دایە. ئەمەیان بە پێچەوانەی ئەویان، بێ قۆڵە (وێنەی٣٧). شوانەکانی دۆڵی ئاکۆیان و هی عەشیرەتی بلباس وهی عەشیرەتی مامش و نێوچەی پشدەر، وەکو پێخەف شەوان لە ناوی دەخەون.

**کوڵەباڵ**

جۆرە پۆشاکێکی پیاوانە. لەسەر رانگ و چۆغەڵ یان کورتەک و شەرواڵ، بۆ خۆ پاڕاستن لە سەرمای زستان، لە بەر دەکرێت (وێنەی٣٨).

کوڵەباڵ لە لوای بەرخی یەک ساڵە، بە هەمان شێوەی قاپووت و کەپەنک دروست دەکرێت.

شێوەی کوڵەباڵ، لە دەڤەرێک بۆ دەڤەرێکی دیکەی جوگرافی کەمێک جوودایە. ئەوانەی هەورەمان دوو گوێی کورتی بۆ لەسەر شانی ڕاست و چەپ دروستکراوە. ئەوانەی خۆشناوەتیش گوێیان بۆ نەکراوە.

**سەرکراو**

جۆرە پۆشاکێکی پیاوانە. بۆ داپۆشین و پاڕاستنی سەر لە سەرمای زستان و گەرمای هاوین، لە سەر دەندرێت. جۆرەکانی سەرکراو ئەمانەن: زستانی ـ ئەمەیان بە قاپووت دەدورێت. هاوینی ـ ئەمەیان لەسەر دەندرێت.

**لباد**

جۆرە رایەخێکی لاکێشەییە بە درێژی دوو مەتر و پانی یەک مەتر. بۆ لەسەر دانیشتن لە دیوەخانان و مالان و ڕەشمالاندا، رادەخرێت. هەندێ ئەوروپی، وەکو سوڤینێر، پارەی پێ دەدەن.

لبادی یەک نەفەری ـ دوو مەتر درێژ و یەک مەتر پان ـ لە حەوت کیلۆ و دوو نەفەری ـ دوو مەتر درێژ و مەترێک و نیو پان ـ لە دە کیلۆ بەرگن دروست دەکرێت. باسی چۆنییێتی دروستکردنی لباد، لە گەڕەکی عەجەمانی شارۆچکەی کفری، دەکەم.

دوو مندالی تەمەن لە ژێر چواردە سالیدا، دوای ئەوەی، سێ کیلۆ و نیو بەرگنیان، کەمێک لە خلت و خال پاکردەوە(وێنەی ٣٩)، بە بیست وپێنج خولەک، بە مەکینەیکی کارەبایی (وێنەی ٤٠) (مەکینە بە ٩٠٠ هەزار دینارە)، لە ژوورێکی رووناک و پێش کراوە، پەڕەکرد. دواتر بەرگنەکەیان بۆ ژوورێکی دیکە هیناو لە عەردیان رووکرد.

وەستا، بە بەرگنی ڕەش و سوور کەوتە نەخشکردن لەسەر ئەو حەسیرە قەمیشەی( درێژی پێنج مەتر و پانی دوو مەتر) کە لە ژوورەکەی تەنیشتی ڕاخرابوو. پاشان بە چەنگان بەرگنەکەی دەهێنا و بە شەنە دارەکەی دەستی، بە یەک ئەندازە، پەرت دەکرد. کەمێک، بۆ ئەوەی بەرگنەکە یەک بگریت، ڕشاند. پاشان حەسیرەکە و بەرگنەکەی لولدا و لە ناوەڕاستدا، بۆ ئەوەی حەسیرەکە شەت نەبێت، بە بەنێک بەست. کوڕەکەی، بیست خولەکێک، بە قاچ چیغەکەی هیناو برد. چیغەکەیان کردووە و ڕایان خستەوە. هەندێ بەرگنیدیکەی لە رۆخەکان پەرتکرد و بە دەستی ڕێکی خست و کەمێکی ڕشاندەوە. چیغەکەیان، وەکو پێشوو لولداوە و کەمێکییان هەژاندەوە. لبادەکەیان لە چیغەکە دەرهێنا و بۆ بلاوتنۆ(پەستان) لە ژووری سەرەوەیان برد.

کوڕەکەی(ئارام تەمەن چواردە سال) پارچە گوشێکی لە لبادەکە پێچا و لولیدا و کەمێکی بە کەفاوی سابوون ڕشاند. لەسەر چۆکان دانیشت و لبادەکەی بۆ پێشخۆ کێشا و بە باسکەکانی بیست خولەک پەستای.

وەریگێڕا و بیست خولەکی دیکەی پەستایەوە. کردیەوە و هەر جارەی ڕۆخێکی بە کەفاو و سابوون، دەڕشاند و ورد دەیشێلا (وێنەی ٤١) بەو شێوە، دوای کاتژمێک لبادە بۆ قەدکردن تەواو بوو.

وەستا بەسەر کەوت و لبادەکەی لەگەڵ شاگردەکەی ڕاخست. ئەم لا و ئەو لایان، بە درێژی گرت، تاکو نیوەی قەدیان کرد و جارێکی دیکە قەدیان کردەوە. ئینجا دوو کەڕەت ـ کەڕەتی چوار جار ـ بە قایم لە عەردیان دا و بۆ خۆیانیان ڕادەکێشا. لبادەکەیان کردەوە و نیمدەرەکی گوش، بۆ ئەوەی قون تەڕ نەبێت، لەسەر ڕاخست. ئیشی شاگردەکە لێرە تەواو بوو.

وەستا، دەستی بە شێلانی هەر چوار لای لبادەکەی کرد. بە دارقەدەر ـ دارێکی یەک مەتر درێژ و دە سانتیمەتر ئەستوور ـ ڕۆخەکانی ڕاست دەکرد (وێنەی ٤٢). بە پێ، دوای ئەوەی ڕۆخی لبادەکەی بە دەستی لە گەڵ ژێرپێی جۆت دەکرد، یەک چارەگ کێشایی و ڕێکی خست. دوای، بۆ وشک کردنەوە، بە دوو بزمار لە سەرێکەوە بە دیواری وەکرد.

دەست هەقی لبادێکی دوومەتر درێژ و مەترێک پانی بیست هەزار و هی چوار مەتر درێژ و مەترێک پانی پەنجا هەزار دینارە. سلێمانییەکان، بۆ کڕینی چەند دانەیەک لە لباد بۆ کفری دین.

کارگەچییەکان،بۆ ئەوەی هەست بە بێزاری نەکات، بە دەم کارکردنەوە گۆرانی دەچڕیت.ژنێک لای کارگەچی دەبێت و لەشی بە دەرەوە دەبێت. کارگەچی بۆ ئاگادارکردنەوەی، ئەو گۆرانییەی پێ هەڵدەرێت.

چۆن دانیشە دانیشە
کانی نییە ئاودارە
بزن نییە مودارە
قامیش نییە ناوەڕاستی قلیشە
چۆن دانیشە دانیشە
هەلاج بە قوربانە

**لاکێش**

جۆرە رایەخێکی لاکێشەییە بە درێژی چوار بۆ شەش مەتر و پانی یەک مەتر. بۆ لەسەر دانیشتن لە دیوەخانان و ماڵاندا، ڕادەخرێت. لاکێش لە دیوەخانەکانی هەندێ عەشیرەت، بە نموونە، کێخوا سمایل لە دەڤەری دوکان و جافایەتی، بەر چاو دەکەویت.

لاکێشێکی چوار مەتر درێژ و یەک مەتر پان ـ شازدە کیلۆ و هی شەش مەتر درێژ و یەک مەتر پان ـ بیست کیلۆ لوای بەرخی یەک ساڵەی بۆ دروستکردنی تێدەچێت.

لباد و لاکێش، بە هەمان پرۆسەی قاپووت و کەپەنک دروستکردن، تێدەپەرێت.

هەندێک لەو کەرستانەی کە جاران کارگەچی لە لوا دروستی دەکردن و ئەوڕۆ لە ماڵان و مۆزەخانەی دەوڵەت و تایبەت نەبێت بەرچاو ناکەون ناکەون ئەمانە بوون:

**هیزەدان** ـ لە سەر شیوەی جۆرکێکی گەورەیە. دەوێکی لە سەرێکەوە، بۆ لە ناونانی هیزە، هەیە. پلەی گەرمای روون، لەبەر نەفەس نەدان، لە وەرزەکانی ساڵ لە یەک ئاست رادەگرێت و لە تێکچوون دەیپارێزێت.

**بەرلێف** ـ پێخە فێکی گەرمە.

**بەلیێچ** ـ زستانان، بۆ پاڕاستنی بەل لە سەرما، بەکار دەهیندرێت.

**٢- جۆلایی**

جۆلاکان، بە دوو دەزگای کەمێک لە یەک جودا، کار دەکەن.

دەزگای جۆلایی

جۆلا بۆ چنینی دووگرد و هاوشێوەکانی، دەزگاییک بەکار دەینی ، کە لەو پارچانەی خوارەوە پێکهاتووە: بەرژەنە. پێتات. دەفە. شە. قەدەر. قولەقەدەر. کێشکە. گورد. گوریس. لولکە. هێسک. مەکۆ. نەوەر. خڕەک (ئامرازێکی ئاسنی یان ئاسنی و دارە. بۆ بەن و بەنموو و کەلەف هەڵکردنەوە لەسەر لولکە بەکار دەهیندرێت). ڕایەڵ( پێنج دانە شیشی

یەک مەتر درێژ و دە سانتیمەڕ ئەستوورە. سێ دانەیان لە دووری سێ مەتر لە دوو دانەکەی دیکە یان ـ نیوانیان شیشێک و شیشێک پازدە سانتیمەترە ـ لە عەردی، توونت دەچەقێندرێت).

ئەمانەی خوارەوە، بەشێکە لەو شتانەی جۆلا بە دەزگا جۆلایی لە دوکان یان هۆدەییێکی خانووەکەی دەیانچنێت.

**دووگرد (بەرماڵ)**

شتێکی چنیندراوە بۆ نوێژ لەسەرکردن ڕادەخرێت. دوای نوێژکردنیش، بۆ ئەوەی بێنوێژ نەبێت یان شەیتان پیسی نەکات، قەد دەکرێت و لە شوێنیک، تاکو نوێژی دیکە، هەڵ دەگیرێت. ئیشی سەرەکی جۆلایەکان، لەبەر زۆری بە ڕاداندان، بە تایبەتی لە لایەن خەڵکی نێوچەی برادۆست و باڵەکایەتی، لەبەر ئەوەی پێیان جوان و نوێژ لەسەر کردنیشی خێرترە، بەرماڵ چنینە(وێنەی ٤٣).

بەرماڵ بە زۆری لە کەلەفی ڕەنگاورەنگی ئێرانی(سوور، زەرد، ڕەش، سپی، مۆر، قاوەیی) و کەمتر لە بەن دەچیندرێت. دووگرد لە دوو تەختەی یەک مەتر و نیو درێژ و نیو مەتر پان، روونتر لە چوار سەد داو، پێکهاتووە. تەختەکان، بە دیوی ناوەوە، لێک دەدورێن. بەرماڵێک یەک کیلۆ کەلەف(کیلۆی کەلەف پازدە هەزار دینارە) یان بەنی تێدەچێت. شەش دەمژمێر بۆ چنینی دەبات.

دووگرد، لە رووی نەخشەوە، چوار جۆری هەیە. ساکاری و یەک کەشکۆل(کەشکۆل لە سەر شێوەی تیسکی رۆژە) و دوو کەشکۆل و سێ کەشکۆل. دەست هەقی جۆری یەکەم و دووەم بیست و پێنج و هی سێیەم ـ چل هەزار و هی چوارەم ـ پەنجا هەزار دینارە. دووگرد دوو ڕەنگی لێکوەشێندراون. ڕەنگەکان بەو شێوەن: شین + سۆر. کەس + سۆر. رەش + سپی. مۆر + زەرد.

دەست هەقەکە، لەبەر ئەوەی کارێکی ورد و قورسە، بە نموونە، نزیکەی دە هەزار جار مەکۆی بە ناو داوەکان، جارێک لە ڕاست بۆ چەپ و جارێک لە چەپ بۆ ڕاست، بینی و ببەیت و بە قەدەر ئەوەش بە دەفە، بۆ ئەوەی داوەکە بچیتە تەنیشت یەک، بکوترێت.

**پێچاڵ**

جۆلا بۆ چنینی تەختەی رانک و چۆغەر دەزگاییێک بەکار دێنی، کە لەو پارچانەی خوارەوە پێکهاتووە. دەفە. گورد. شە. لەنگەر. پرد. شانەی لەنگەر. پێستەتە. کۆڵەکە. هەڵپێچ. واڵە(چۆڵەکە). رەمغە. سنگ. گوریس. رەفتە. مێکوک. لولو. لولاک مالاتێ. خرەک (وێنەی٤٤).

ئەمانەی خوارەوە، بەشێکە لەو شتانەی جۆلا بە پێچاڵ لە دوکان یان هۆدەییێکی خانووەکەی، دەیانچنێت.

**بۆز**

ئەمەیان، بۆ دروونی رانک و چۆغەر لە هەولێر و سلێمانی و شال و شەپک لە دهۆک، لە مووی بزنی مەرەز(پووشی. رەش. زەرتکی. سپی. سوور. شینکە) دەچندرێت. نرخی یەک کیلۆگرام موو، لە سەر رەنگ و شلکی وەستاوە. بە نموونە، هی زەرتکی ٧٠٠ دینار و هی سووریش ٣٠٠ دینارە.

**موورستن**

موو بەر لە دەستکردن بە رستنی، بۆ ئەوەی لە خۆڵ و زبل پاک بکرێتەوە، دەشۆرێت. ئینجا لەسەر تەنافێک یان بەردێک یان رایەخێک، بۆ ئەوەی وشک بێتەوە، هەڵدەخرێت. پاشان پوختە شیدەکرێتەوە. ئینجا بە شانە، بۆ ئەوەی تاڵە مووەکان لێک ببنەوە، شانە دەکرێت. حسابی موو، بۆ رستن بە پیلە(یەک پیل ١٠٠ گم). دەست هەقی رستنی یەک کیلۆگرام موو بە ٣٣ هەزار دینارە.

**ئامرازەکانی موورستن**

موو بە دوو ئامرازی لێک جودا بە مادە و شێوە و ئەندازەی بەرهەم لە یەکەییێکی کاتییدا، دەرسترێت.

**- تەشی**

یەکێکە لە کۆنترین ئامرازی خوری و موو رەستنە. تەشی، لە بەر ئەوەی خوری و مووی ئەستوور و باریکی پێ دەرێسرێت، چەند جۆرێکی

هەیە(وێنەی ٤٥).
ئەستوور ـ خوری بۆ ڕایەخ و جاجم و شتی دیکەی لەو بابەتانەی پێ دەڕێسرێت.
ناوەنجی ـ خوری بۆ دوگرد پێ دەڕێسرێت
باریک ـ مووی مەڕەزی بۆ ڕانک و چۆغە دەڕێسرێت.
تەشی کە لە دار دروست دەکرێت لە سێ پارچە پێکهاتووە:
قولاب ـ پارچەییێکی کانزاییە و لە ناوەڕاستی سەلکی تەشی، بۆ تێ وەرئاراندنی خوری و موو، گیراوە.
سەلکە تەشی ـ پارچە دارێکی خڕە. تیرەکەی پازدە سانتیمەترە و ئەستووریەکەشی هەشت سانتمەتر دەبێت. رووەکەی تەختە. پشتەکەی، بۆ ئەوەی بە ئاسانی بسوورێت، کەمێک زەقە. کونەکی، بۆ تێ هەڵکێشانی کلکە تەشی، تێکراوە.
کلکە تەشی ـ دارێکی چل و پێنج سانتیمەتر درێژ و پێنجیش ئەستوورە. سەرەکی لە کونی تەشی ڕاکراوە.

**ـ مەکینەی کارەبایی**

یەکێکە لە ئامرازە تازەکانی مەڕەز ڕەستن. مەکینەکە بە ئەسڵ واتەر پەمپی موبەریدەیە. بەکارهێنانی لەو ساڵانەی دواییدا بۆ پەلەکردن لە ڕستندا دەگەڕێتەوە. وەلێ تەشی ڕێسەکان، لەبەر نزیکی وزەی کارەبا لە لەشیان، بە دڵگرانی مووی پێ دەڕێسن.

**چنین و دەست هەق**

چنینی موو بۆ ڕانک و چۆغەر، لەبەر باریکی داوەکان، کاتێکی زۆری دەوێت. بە نموونە، چنینی یەک بزوو بیست و پێنج کاتژمێر دەبات. دەست هەقیش پەنجا هەزار دینارە. واتە کاتژمێر و دوو هەزار دینار. پارەکە، لە چاو ماندووبوونە مێشکی و جەستەیی، زۆر کەمە.

### ژێربابەتی ٣- پێستەمەنی

پێستە چەند ئامرازی هەڵگرتنی روون و پەنیر و ژاژی لێ دروست دەکرێت. هەندێکییان ئەوانەی خوارەوەن:

#### پێستە خۆشکردن

بەر لە باسکردنی پێستە خۆشکردن، پێویستە باس لە شێوەکانی رووتکردنەوەی حەیوان(مەڕ. بزن. چێڵ) ی سەربڕاو بکرێت.

**کەوڵکردن** ـ کونێک لە دیوی ناوەوە لە دەستی چەپی دەکرێت. قەساب دەمی دەخاتە سەر کونەکە و فوی، تاکو هەڵمسانی حەیوانەکە، تێدەکات. تیخی لە ملەوە بۆ دوونگ(کلک) بە پێستەکە دادەبنێت. ئینجا بەرەبەرە پێستەکەی لە گۆشتەکە دەکاتەوە. پێستەکە لە کارگە خۆش دەکرێت و لە دروستکردنی پێڵاو و قایش و جەنتا و شتی دیکە بەکار دەهندرێت.

**گروینکردن (کەلین)** ـ پێستە نە کونی تێدەکرێت و نە بە تیخیش دەبڕیت کەوابێ گۆشتەکەی چۆن دەردەینن؟. گۆشتەکە لە ناو پێستەکە بە تیخ پارچە پارچە دەکرێت. پارچەکان، ئەگەر مەڕ بێت لە دوونگەوە و ئەگەر بزنیش بێت لە ملەوە، یەک دوای یەک دەردەهێندرێن. دەرهێنانی گۆشت لەو دوو ئەندامەی لەش، بۆ جیاوازی خەسڵەتی فیزیاوی حەیوانەکە دەگەڕێتەوە. پێستەی لەو شێوە، لە مالان یان لە ڕەشمالان بۆ چەند شت، بە نموونە ئەوانەی خوارەوە بەکار دێت.

#### هیزەی روونی

پێستە بۆ روون، لە ماڵەوە یان لە ڕەشمالان، وەلێ بە کەمێک جیاوازی لە ناوی شتەکان و شێوە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە، خۆش دەکرێت. لە خوارەوە، بۆ روونکردنەوە، باس لە هی قادرکەرەم دەکەم.

خوردە ـ ماست و دۆینە ـ لە پێستی گروینکراو دەکرێت. ئینجا جەوتی وشکراوی بە هاوەن کوتراوی، بۆ ئەوەی رەنگی پێستەکە لە سپی بۆ ڕەش بگورێت، لێدەدن. چەند رۆژێک، بۆ ئەوەی قایم بێت، دەستی لێ نادرێت. پاشان تووی وشک دەگرنەوە و لە پێستەکەی، بۆ ئەوەی نەرم بێت، دەکەن. ئینجا رۆژبەرۆژ، ئەو روونەی کە لە هەژاندنی مەشکە دەست

دەکەوێت، تێدەکەن. پێستە، لەبەر ئەوەی پلەی گەرماییەکەی لە وەرزەکانی ساڵدا گۆڕانی بەسەر دانایێت، روونی لە تێک چوون دەپاریزیت.

**هیزەی پەنیری**

پێستە بۆ پەنیر، لە ماڵەوە یان لە ڕەشماڵان، وەلێ بە کەمێک جیاوازی لە ناوی شتەکان و شێوە لە نێوچەیەک بۆ نێوچەیەکی دیکە، خۆش دەکرێت. لە خوارەوە، باس لە هی گوندی ناوەندە دەکەم.

پێستە جوان دەشورێت و بە مەبەستی وشک بوونەوە یان بە رستە وەدەکرێت یان بە پەرژین دادەدرێت یانیش لەسەر تاشەبەرد، هەڵدەخرێت. هەر چوار پەلی، بۆ ئەوەی ئەو پونگ دۆیی کە تێی کراوە لێ نەڕژێت، دەبەسترێت. دوای سێ رۆژ بە تاڵ دەکرێت و جوان دەشورێتەوە. ئینجا ماست و قوڕادەی، بۆ ئەوەی پێستەکە ئەستوور بێت و نەرمبێت و تامی گۆشتی پێوە نەمینێت، تێ دەکرێت. دوای سێ رۆژ بەتاڵ دەکرێتەوە و پوختە دەشورێتەوە. پاشان پەنیر و ژاژی و شیرێژەی تێ دەکرێت و زاری بە بەن، بۆ ئەوەی بای لێی نەدات، دەبەسترێت و لە شوێنێکی سارد، بۆ ئەوەی تێک نەچیت، هەڵدەگیرێت(وێنەی٤٦). دواتر، لەسەر یەک بە پەنیر فرۆشان دەفرۆشرێت. هەندێ کەس بە کیلۆ لەسەر شەقامی شارەکان، بە نموونە دیانان، دەفرۆشێت.

هەندێک لە مەڕدارەکان، لەبەر کێشەی خۆشکردنی پێستە و بۆن، پەنیری لە تەنەگەی روون و دەبەی پلاستیک دەکەن. وەلێ ئەوانە، لەبەر ئەوەی یەک و دوان نین و هینان و بردنیان خۆش نییە هەموو مەڕدارێک دەستییان لە پێستە، کە نرخەکەی لە بازاڕی سۆران (دیانان) پار سی هەزار دینار بوو، بەرنابێت.

هەندێک لەو کەرستانەی کە جاران ژنان لە پێستەی گروینکراو ئامادەیان دەکرد و بەکاردەهات و ئەوڕۆ لە مالان و مۆزەخانەی دەوڵەت و تایبەتی نەبێت بەرچاو ناکەون ئەمانە بوون: مەشکە و دۆدانە و کوندە و... هتد. وەلێ ئەمانە، لەبەر ئەوەی نەماون، باسیان ناکەم.

**ژێربابەتی ٤- پیشە و کاڵای دەزوومەنی**

مەبەست گشت ئەو کاڵایانەی لە دەزوو دەچندرێن. هەندێک لە کاڵاکان ئەوانەی خوارەوەن:

**کڵاشی هەورامی**

ئەمەیان نێوچەیێکی فراونی جوگرافییە لە کوردستاندا. سنووری ئیداری نێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوای کوردستان، کە بە هی سیاسی نێوان ئێران و عێراق ناوبراوە کراوە بە دوو بەش. رۆژهەڵاتەکەی بە هەورامانی باڵا و رۆژئاواکەی بە هەورەمانی لهۆن(تخت) ناسراوە. لە دوو شوێنی ئەوەی دوایی، واتە شارەدێی تەوێڵە و گوندی نۆدشە، جۆرە کڵاشێک، بە ناوی کڵاشی هەورامی دروست دەکرێت. کڵاشی هەورامی دوو بەشە، هەر بەشەی بە جودا، دەکرێت.

**یەکەم. بنی کڵاش**

مەبەست ئەو بەشەی کڵاشە کە سەری کڵاشی لەسەر دەچندرێت و بنی پێی دەکەویتە سەر.

**ئامرازەکانی بنی کڵاش دروستکردن**

دروستکردنی بنی کڵاشی هەورامی بە چەندین ئامرازی لە دار و ئاسن یان دار ـ ئاسن دروستکراو دەکرێت. هەندێک لەو ئامرازانە دارتاش و هەندێکی دیکەیان ئاسنگر جاری واش هەیە هەر وەستا خۆی دروستییان دەکەن. ئامرازەکان، بە زۆری، هەمان ئەوانەن کە دەیان ساڵ لە مەو بەر بەکارهێندراون.

١. **کۆتە** ـ لقێک یان قەدێکی دارتووەی مەترێک درێژە. لای سەری، بۆ ئەوەی ئیشی لەسەر بکرێت، بە مشار خشت دەبرێتەوە و بە بڕبەند سفت و ساف دەکرێت. لای خواریش، بۆ ئەوەی لە شوێنی کڵاش کردندا، بە ئاسانی لە عەردی بچەقێندرێت، بە تەپشوو پەل دەدرێت و سەرەکەی تیژدەکرێت. درێژی هەردوو بەشەکەی پەنجا سانتیمەتر دەبێت. کۆتە بۆ ئەوەی دەنگی ئیشکردن دەوروبەری بێزار نەکات لەدار

دروست دەکرێت(وێنەی ٤٧).

٢. **مشتە** ـ پارچە ئاسنێکی بیست سانتیمەترێک دریژ و پێنج سانتیمەترێک ئەستوورە. سەرەکەی، بۆ ئەوەی کاتی کوتان لە دەست نەترازێت، کڵاوەییە و بنەکەشی، بۆ کوتان، پانە.

٣. **درەوش (درێشە)** - شیشێکی بیست سانتیمەترێک درێژ و دوو سانتیمەڕێک ئەستوورە. دەسکێکی داری بە قەدەر مشتی مرۆڤ تێگیراوە. چەند جۆری، لەبەر ئەوەی بۆ کاری جودا بەکار دێت، هەیە.

ء. دەمباریک ـ بۆ کونکردنی پارچە و دانانی پەرگەما.

ب. دەمتیژ ـ بۆ کونکردنی سنگ و پاژنە(قومپانی).

پ. وەسەت ـ بۆ کونکردنی قۆژەوانەی ناوەڕاست یان لووتی کڵاش.

ت. دەمپان ـ بۆ بڕینی ناوەڕاستی کڵاش.

٤. **کۆڵـو درەوش** ـ شیشێکی بیست سانتیمەتر درێژ و دەسکدارە. لە دەرنەفیز، یان هەر دەرنەفیزە و سەرەکەی تیژکراوە، دەچێت.

٥. **گازن** ـ تیغێکی دەمتیژی بیست سانتیمەترێک درێژە. کلکەکەی، بۆ ئەوەی لە کاتی ئیش پێکردندا خۆش بگیرێت ، لە دار رادەکرێت. ئاسنگر لە مورەد، لەبەر ئەوەی پۆڵایەکەی زۆر قایمە، دروستی دەکات.

٦. **چلمێردە** ـ پارچە دارێک بە دەسکەوەیە. وەکو گازن وایە. وەلێ کورترە.

٧. **قەدگیر** ـ ئاسنێکی بارێکی نیو کەوانەییە. سەرێکی، بۆ کێشانی بزمار، دوو فلیقانییە.

٨. **چەقۆ** ـ ئاسنێکی پانی دەم تیژی دەسکدارە. درێژ و کورتی هەیە.

٩. **پلایس** ـ ئاسنە لە شێوەی گاز. دەمەکەی پانی درێژووکانییە.

١٠. **دواڵگیر**ـ شیشێکی دە سانتیمەتر درێژی دەسک دارە. دوالەکانی، کاتی کێشان، پێ رادەگیرێت.

١١. **بەز** ـ چەورییە. تیرەکانی، بۆ ئەوەی بە ئاسانی بکێشرێت و کاتی تەڕبوون کورژ نەبێتەوە، پێ چەور دەکرێت.

١٢. **چەرمدزە** ـ تەختەیە بەقەدەر ناو لەپ. کاتی کونکردنی پەرۆک، بۆ ئەوەی درەوشەکە لە دەست رانەچێت، دەدرێتە بەر دەست.

١٣. **لاكێش** ـ تیرەییێکی نیومەتر درێژە. تیرەکانی پێ رادەکێشرێت.

١٤. **دەقاق** ـ دارێکی بیست و پێنج سانتیمەتر درێژ و پازدە سانتیمەتر پان و دەش ئەستوورە. ناوەڕاستەکەی کەمێک قۆرکراوە.

١٥. **دوالْ کێش** ـ دارە بە قەدەر پانی مشت یان هێسکێکی لاقی مەڕ و بزن. بۆ دوال کێشان بەکاردێت.

١٦. **پەڕۆی دوالْ کێش** ـ پەڕۆکە لەگەڵ دوالْ بۆ راکێشانی دوالْ بەکار دەهێندرێت.

١٧. **هەسان** ـ بەردێکە بە قەدەر ناو لەپ. لایەکی تەختە، بۆ لێخشان و تیژکردنەوەی ئامرازە ئاسنیەکان بەکاردێت.

١٨. **رۆن هەسان** ـ چەورییە ـ رۆنی حەیوانی یان زەیتی گوڵەبەرۆژە ـ بۆ هەسان چەورکردن بەکاردێت.

١٩. **قالب** ـ دارە، لەسەر شێوەی پێ، بۆ کڵاش لە قالب دان بەکاردێت. ماوەییێکە هی پلاستیکیش پەیدابووە.

**کەرەستەکانی بنی کڵاش دروستکردن**

ئەمەیان لە کەرستەکانی خوارەوە و بە دەستی چەند کەسێکەوە دروست دەکرێت.

**١. پێکەنە**

ئەمەیان لە خامی سپی بەو شێوە دروست دەکرێت.

خام بە تۆپ، لە بەزازان دەکرێت. دوو مەتر دوو مەتر لە تۆپکە دەبرێت. ئینجا، بۆ ئەوەی جوان تەربێت، دەخرێتە تەشتی ئاوەوە.

خوم (پێنج سەد گرام بۆ یەک تۆپ خام) لە مەنجەڵیکی ئاوی کوڵاو دەکرێت. پاشان، بۆ ئەوەی رەنگی خامەکەی لە سپی بۆ شین بگۆڕێت، گشت پارچە خامەکان، دەخرێنە ناو خوماوەکەوە و دەیکوڵێنەوە. هەندێک خومی دیکە، دوای دەرهێنانی پارچە خامەکان ، لە خوماوەکە دەکرێتەوە و دەیکوڵێنەوە. پارچە خامەکان، بۆ ئەوەی هەموو وەکو یەک رەنگ بگرن، سەروبن دەکرێن و دەخرێنەوە خوماوەکەوە.

پارچە خامەکان، بۆ ئەوەی ئاوەکەیان بچووریێتەوە و رەنگی زیاد لەگەڵ ئاوەکە بڕوات هەڵدەخرێت. پاشان، بۆ ئەوەی دەستی کلاشکەر بە رەنگ نەبێت و کلاش رەنگ نەداتەوە، دەشووریێنەوە. پاشان، بۆ ئەوەی وشک ببنەوە، هەلدەخرێنەوە. وەلێ، بۆ ئەوەی کاڵ نەبنەوە، نابی رۆژیان لێ بدات.

پارچە خامەکان، دوای وشک بوونەوەیان، تیلم تیلم(بە هەورامی خشتییان پێ دەگوترێت) دەکرێن. هەر چوار مەتر خام چوار سەد دانەی دەکەویتێ. خشتەکان، دوای دوو قەدکردن و تەرکردن، بۆ ئەوەی هەموویان وەک یەک شێدار بن، دەخرێنە ناو جۆرکەکی نایلۆن و بۆ رۆژی خۆی هەڵدەگیرێن.

وەستای پێکەنە، دوای ئەوەی خشتەکانی رۆژی پێشی هینابووە گۆڕێ، قەدیان دەکاتەوە و بە مشتە لەسەر دەزگایەکە(دارەکە) پوختە و لێزانانە دەیان کوتیت.

خشتەکان بە گوێرەی بەرزی و نزمی، بۆ ئەوەی کلاشکار بە ئاسانی ببیانکات بە ژێرە، ریز دەکرێن. ئینجا دەستە دەستە بەو شێوە جیادەکرێنەوە: پاژنە. سنگ. لوت. ئەمانە، هەندێک (پاژنە و لوت) سوور و هەندێک (سنگ و نیوەی پاژنە) شینن. ئینجا بە درەوشە یەک کون لە پارچەکان دەکرێت.

پێکەنەکار، چەند دانەیەک لە پێکەنە بەسەر یەکەوە، بە ژێرەکار دەفرۆشێت. هەقی خام و خوم لە پارەی پێکەنەکان دەدرێت و ئەویتر بۆ پێکەنەکار دەمینێتەوە.

ئامادەکردنی جۆتێ پێکەنە، ئەگەر پێکەنەکار و شاگرد زۆریش چەپووک بن، رۆژێکی تەواو دەبات.

پێکەنەکاری باش ئەو وەستایەیە کە پارچە جوان بکوتێت. دیوی ژێرەوەی سفت و رێک بکات. بەرزی و نزمییان تێ نەخات. رەنگی جوان بێت. قەراخی جوان بڕابێت و یەک رەنگ بێت.

**٢. دواڵ** ـ چەرمی بەکارهێندراوە لە کلاشی هەورامیدا دەبێت ئەو

سفەتانەی هەبێت: هی جوانەگابێت. درێژی لە مەترێک و نیو کەمتر نەبێت. خوێی پێوەنەکرابێت. چەوری پێوە نەبێت. گەنە لێی نەدابێت.
پێستەخۆشکردن ــ چەورییەکانی سەر پێستە دەرندرێت. ئینجا جوان دەشووررێتەوە. پاشان خۆڵەمێشی پێوەدەکرێت و لەسەر عەردی، بۆ ئەوەی وشک بێتەوە، رادەخرێت.
پێستەی خۆشکراوە. بۆ ئەوەی بخوسێتەوە، دەخرێتە تەشتێکی ئاوەوە. پاشان تاڵ تاڵ بە چەقۆیێکی تیژ دەبڕێت و بۆ ئەوەی جارێکی دیکە وشک بێتەوە لەبەر هەتاو هەڵدەخرێتەوە.
**٣. کێرەوڵ (لوت و قۆدە)** ـ چەند دانەیەک لە کێری گای کەمێک بەتەمەن و رەنگ ڕەش و بۆر( جگە لە سپی)، بۆ ئەوەی کەمێک نەرم ببێتەوە، دەخرێتە ناو تەشتێکی ئاوەوە. پاش ئەوەی توێکڵیان دەکرێتەوە پارچە پارچە دەکرێت. پارچە بە بزمار لە پاژن و لوتی کڵاش قایم دەکرێت.
**٤. پەرمەگا** ــ بەنمووی بزنە. بن پەرگی، واتە ریزی یەکەمی سەر پێکەنەکان، پێ دەچندرێت.
**٥. کەتیرە** ـ مادەیێکی لیچقە. لە بنی کڵاش، بۆ ئەوەی پەرۆکەکە هەڵنەوەشێت و لێوارەکانی ساف بێت، دەدرێت.
**٦. بزماری کەوش**ـ پارچۆکە ئاسنێکی سەرپانی نووک تیژە. لە پاژنە و لوتی کڵاش، بۆ ئەوەی زوو نەخورێت و لە رۆیشتندا دەنگی لێوە هەڵ بستێت، دەدرێت.

**دووەم. سەری کڵاش**

مەبەست ئەو بەشەی کڵاشە کە لەسەر بنەکڵاش هەڵدەچندرێت.

**ئامرازەکانی سەری کڵاش**

سەری کڵاش بە دوو ئامراز دەچندرێت
١. تەپەنە ـ تێلێکی رەقی باریکی نوک تیژە. دەزووی پێ دەچندرێت.
٢. پەرگەماڵ ـ پەرۆکێکی زبرە، بە زۆری پارچەیێکە لە شاڵ، بۆ توک لە دەزوو داماڵێن(پاککردنەوە) بەکار دێت.

**کەرستەکانی سەری کڵاش چنین**

سەری کڵاش بە دەزووی سپی دەچندرێت. دەزووەکە، بۆ ئەوەی ئاڵۆز نەبێت، دەکرێت بە پەرگ (گڵۆڵە) ێکی پڕ چەنگ.

**قۆناغەکانی سەری کڵاش چنین**

سەری کڵاش پێنج قۆناغی، بە ناوەکانی خوارەوە، هەیە.

١. بنپەرگ ـ ریزی یەکەم، واتە ریزی دەوری بنی کڵاش لە ناوەوە، لە سەری کڵاش.

٢. گەڕیان دەور ـ رۆخی کڵاش. واتە، رێزی نێوان سەری کڵاش و بنپەرگ.

٣. ساراجن ـ سەری کڵاش. واتە رێزی سەری پەنجەکان و پشتی پێ.

٤. دەمگە ـ رۆخی ساراجن، لە سەر پشتی پێ.

٥. شیرازە ـ ریزی سەرەوەی، واتە ئەوەی بن گۆزینگ، کڵاشە. ئەمەیان زیاتر بۆ جوانکردنی رۆخی کڵاش دەچندرێت.

**ژێربابەتی ٥- پیشە و کاڵای دارەمەنی**

مەبەست گشت ئەو کاڵانەیە، کە ژن یان پیاو، لە ماڵان یان لە دوکانان یان لە کارگان، بە دەستی یان بە مەکینە یان دەست ومەکینە، لە دار و قامیش و شووڕک و پوشوپەراش و پەلکە دارخورما، دروستییان دەکات.

**ء. کاڵا لە دار**

دار بە شێوە سروشتییەکەی یان دوای تاوتوێکردنی لە کارگەدا سەرچاوەی دروستکردنی کەرستەی جۆراوجۆرە. هەندێک کاڵای لە دار ئەمانەی خوارەوەن:

**ئامرازەکانی جۆتکردنی ترادیسیۆنی**

ئامرازی جۆتکردن لە دار و ئاسن و کندڕ و گوریس دروست دەکرێت. پارچە دارەکان لە داربەڕوو یان دارئەسپیندار، دارتاش یان جوتیار، دروستییان دەکەن. پارچە ئاسنەکان، لە سکە یان چەشنێکی دیکەی ئاسن، ئاسنگر، دروستیان دەکات. کندڕ لە بازاڕ لای دووکاندار دەکڕێت.

گوریس لە ماڵان ژنان لە مووی بزن دەیهۆننەوە.

ئامرازی جۆتکردن، ئەگەر چی هەموویان زەوییان پێ دەکێڵرێت، کەمێک لە فۆرم و پارچە و قورسایی و نرخ لێک جودان. من باسی ئەو کەرستە جۆتکردنە دەکەم کە خۆم، لە کاتی کاری مەیدانی بەرچاووم کەوتووە.

**١. نیروئامور**

جوتیارەکانی گوندەکانی نێوچە شاخاویەکان، لەبەر بچووکی رووپێوی زەوی کشتوکاڵی و نەگەیشتنی تراکتۆر و سەختی شوێن، بە نیروئامور، زەوییەکانییان دەکێڵن. ئەو کەرستەی جۆتکردنە، کە خۆم لە چەندین گوندان، بە نموونە، کۆیلێ (بناری قەندیل) و ناوەندە (بناری هەڵگۆرد) بینیومن (وێنەی٤٨). لە دوو بەش، جودا بە شێوە و ئەرک و پارچە و ناو، پێکهاتووە. لە خوارەوە باشی نیر و ئامور بە جودا دەکەم.

**ء. نیر**

دارێکی لاکێشی بە تەپشوو خۆشکراوە. درێژیەکەی بۆ گاجۆت دوو مەتر (نۆ بست) و بۆ کەر پازدە سانتیمەتر کەم (هەشت بست) درێژە. چوار کونی، دوو لەم سەر و دوو لەو سەر، بە دووری مەترێک و بە مکارە تێکراوە. پارچەکانی ئەمانەن:

**ناونیر**ـ پارچەێکە چوارگۆشەیی و بە قەدەر ئەستووری نیرەکە و بە بەرزایی چوار سانتیمەترە. وەلێ بەشێکی جودا نەکراوەیە و لە ناوەڕاست نیرەکە هەڵکەوتووە.

**کڵاوە** ـ چوار داری پەنجا سانتیمەتر دریژ و پازدەش ئەستوورە. سەرەکی، بۆ ئەوەی لە کونەکە نەکەویتە خوارێ، گۆیە. سەرەکەی دیکەی، بۆ ئەوەی بەنی کڵاوە نەترازێت، لەلە کراوە. کڵاوەکان، هەر دووانییان بە پازدە سانتیەتر لێک دوورن، لەو سەر لەو سەری نیرەکە لە کونان ڕاکراون. ملی هەر یەک لە گایەکان دەخرێتە نێوان ئەو کڵاوانەوە.

**پارچە لباد** ـ دوو پارچە لباد، بۆ پاراستنی ملی گایەکان یان کەرەکان لە برێنداربوون، لە نیرەکە و لە نێوان کەلاوەکان لول دراون.

**گوریس** ـ پارچە گوریسێک یان کندرێک لە نیرەکە دەخرێت و سەرەکانی لێک گرێ دەدرێن. ئینجا لەسەری باسکێش، بۆ ئەوەی ئامورەکەی رابکێشیت، دەخرێت. گەیاندنی نیروئامور بەیەکەوە، ئەگەر بەو شێوە نەبووایە، ئامورەکە بە ئاسانی کاتی جوت کردن لەبەر جوولەجوول دەشکا و لە کار دەکەوت.

**بەنکراوە** ــ دوو بەنی کەمێک ئەستوورە. کلاوەکانی لەژێرەوە، بۆ ئەوەی نیرەکەی رابگرن و قورسایی کێشان بکەویتە سەر ملان ، پێ دەبەسترێت.

**ب. ئامور**

دارێکی دوو مەتر و نیو درێژە. پارچەکانی لە لای جوتیارەوە بۆ لای سەری گایەکان ئەمانەن:

**دەستەمستە** ـ دارێکی پازدە سانتیمەتر درێژ و پێنج سانتیمەتر ئەستوورە. سەرەکی کەمێک، بۆ ئەوەی بە ئاسانی لە کونی پشتبارە ڕابکرێت و قایم بکرێت، تیژکراوە. جوتیار، بۆ ڕاگرتنی نیروئامور و بڵندکردن و دانانی دندە بۆ خەتێکی دیکە، دەستی پێ دەگرێت.

**پشتبارە** ــ دارێکی یەک مەتر و نیو درێژ و پازدە سانتیمەتر ئەستوورە. سەرەکی، بۆ ئەوەی قیت ڕاوەستیت، لە کونی پشت دندە ڕاکراوە و قایمکراوە. سەرەکەی دیکەی، بۆ دەستەمستە، کونکراوە. پشتبارە نیروئاموری پێ میزان دەکرێت.

**دەندە** ــ ئەو پارچەی ئامورەیە کە سەرەکەی وەکو زمان، بۆ تێ هەڵکێشانی گاسن، خۆشکراوە.

**گاسن** ـ ئاسنێکی شێست سانتیمەتر درێژە. سەرەکی، بۆ ئەوەی لە زەوی رابچێت، نووکەکی تیژە. سەرەکەی دیکەی، بۆ ئەوەی لە دەندە رابکرێت، کراوە بە مالی گاسن یان کافلی گاسن و بە تۆقی ئاسن بۆ ئەوەی لە کاتی ئیش پێکردندا لە دەندە نەترازێت و نە جوولێت، قایم کراوە (وێنەی ٤٩).

جوتیارەکـان گونـدی گرتـک و روسـت، لەبـەر ئـەوەی زەویـەکانییان بەردەلانـە، ئـارەزووی گاسـنی لـە سـکە(درەنگتـر کـول دەبێـت و کـەمتر دەچەمێتـەوە) دەکـەن. ئاسنگرەکانیش کـەمتر، لەبـەر ئـەوەی زۆری پێـوە خەریک دەبن، کەمتر ئارەزووی دروستکردنی دەکەن.

**شمشـیرە ــ** پارچـە دارێکـی تـەنکی لاکێشـەیی سـی سـانتیمەترێک درێـژە. سەرێکی لە دەندە قـایمکراوە. سـەرەکەی دیکـەی، کـە کونێکی بـۆ گوڵەپـە تێکراوە، لـە باسکیش هەڵدەکێشرێت.

**گوڵەپە ـ** پارچە دارێکی تەنکی لاکێشەییە. لـە کونی شمشـیرە، بـۆ ئـەوەی دەندە و باسکیش لێک نەترازێن، رادەکرێت.

**باسکیش ـ** دارێکـی دوو مـەتر درێـژ و بیسـت و پێـنج سـانتیمەتر ئەسـتوورە. سەرەکی لە کونی دەنـدەی ڕادەکرێت و قـایم دەکرێت. سـەرەکەی دیکـەی کونـەکی لـە کۆتاییەکـەی تێکـراوە و دارێکـی سـی سـانتیمەتر درێـژ و دە سانتیمەتر ئەستوری، تێ بڕاوە. باسکیش بە کندڕەکی هـەردوو سـەر لێک گرێـدراو و لەسـەر شـێوەی ئاڵقـە لـەو دارە دەخرێـت و لـە نیـری دەبەسترێتەوە.

**سـەر مژانـە ــ** دوو بـورغی ئەسـتووری سـی سـانتیمەترێک درێـژە. لـە دوو کونەکەی پشت باسکیش و سـەری ئـامور، بـۆ ئـەوەی لێکییـان قـایم بکـات. رادەکرێت و بە سەموونە دەبەسترێت.

**دار جۆت ـ** دارێکـی دوومەتر درێـژ و پێـنج سـانتیمەتر ئەسـتوورە. جۆتییـار، بۆ لێخوڕینی گایەکان، بە دەستی چەپی دەگرێت.

**مەساسە ـ** پارچە ئاسنێکی دەم خـڕی و کلکدارە لـە سـەرێکی دار جۆت، بـۆ پاککردنـەوەی گاسن لـە قوڕ و خۆڵ، هەڵکێشراوە.

**نـەقیزە ــ** بزمـارێکی سـەر پـەڕیـوە. سـەرێکی لـە دارجـۆت دەکوترێـت. سەرەکەی دیکەی، بۆ لە ڕانی گا راکردن، تیژکراوە. جوتیار، کاتی سیستی گایەکان لە کێشاندا، بە کاری دەینیت.

**٢. هەوجار و گاسن**

جوتیارەکانی نێوچە دەشتاییەکان، زەویەکانییان بە هەوجار و گاسن و جۆتە کەرێک یان بە مەکینە( سێ گاسن یان پێنج گاسن) و جۆتە هێسترێک دەکێڵن. ئەو ئامرازانە، لە دوای پەیدابوونی تراکتۆر، کاریان پێ ناکرێت و لە کاری مەیدانیشمدا، بەرچاوم نەکەوت. هەر چۆنێک بێت پارچەکانی هەوجار و گاسن(کەرستەی جۆت)، وەکو لە لیتراتۆراندا باسیکراوە، ئەمانەی خوارەوەن(هێلکاری ٢):

**هەوجار**

پارچەکانی هەوجار، لە لای جوتیارەوە بۆ لای سەری هێسترەکان یان کەرەکان، ئەمانەن:

**دەستەندوو**ـ دارێکی مەترێک درێژ و دە سانتیمەتر ئەستوورە. ڕاست و بێگرێ و لووس و تراشراوە. سەرێکی کەمێک، بۆ ئەوەی لە کونی سەر قونکە هەوجارە گیربکرێت، تیژکراوە. سەرەکەی دیکەی دەستی لێ نەدراوە.

**دەستەمستە** ـ دارێکی کەمێک لە مستەکۆرەی مرۆڤ درێژترە. لە کونی دەستەندوو( کونەکە دە سانتیمەتریک لە خوار سەری دەستەندووەکەیە و لە تەنیشتەوەیە)، بۆ دەست پێوەگرتن و کۆنترۆلکردن و سوورانەوە و هۆدانەوە هەوجارەکە، گیراوە.

**هەوجار** ـ دار بەروو یان گوێز یان تووێکی ئەستووری دوو لقییە. لقێکی خوارەوەی، کە پێی دەگوترێت زمانە هەوجار(دۆندە)، کورتە(هەشتا سانتیمەترێک دەبێت) بە تەپشوو داتراشراوە و ڕێکخراوە. گاسنی تێهەڵکێشراوە و بە تۆق قایم کراوە.

لقەکەی سەرەوەی، کە پێ دەگوترێت باسکە هەوجار، درێژ (مەترێک دەبێت) و ڕووە لە هەورازە. کەمێک کوڕە. دوو کونی لە ڕێز یەک لە سەرەکەی تێکراوە. ئەو کونانە دەخرێنە سەر کونەکانی مژانە و بە خەپە لێک توووند دەکرێن.

شوێنی نێوان زمانە و باسکی هەوجار، واتە شوێنی لێک دابڕانی لقی سەرەوە لە لقی خوارەوە، بوغازە یان گرانگی پێ دەگوترێت.

**گاسنی تەختە** ـ پارچە ئاسنێک(سکە. شێلمان) لاکێشانی(٨٠ سم x٦٠ سم) لەسەر سندان، دوای جۆشدانی لە کوورە، پاندەکرێتەوە. لە ناوەڕاست و لەم لا و ئەم لا کەمێک دەبرێت. سەرێکی، کە پێی دەگوترێت کۆپەی گاسن(مالی گاسن . کافلی گاسن)، بۆ ئەوەی لە زمانەی هەوجار هەڵبکێشرێت، لە چەشنی بازنە وێکی دەیننەوە و تۆقی لە شیش دروستکراوی تێهەڵدەکێشن. سەرەکەی دیکە، کە پێی دەگوتری نووکی گاسن، لە شێوەی پەڕ و ئینجا نووک لە تەنیشترا دەکوترێت.

گاسن لە ئەنجامی ئیش پێکردن کول دەبێت و پەڕەکانی دەخورێن و لە گەرمەی جۆتکردندا دەچەمێتەوە. جوتیار، بۆ تیژکردنەوە و ڕاستکردنەوە، گاسنی بۆ لای ئاسنگر دەینیت. ئەویش، دوای گەرم و سوورکردنەوە، ئەو کردارانەی لە گەڵ دەکات.

ء. **بەڕووله** ـ تیژکردنەوە و درێژکردنەوەی نووکی گاسن. بێ تێکەڵ کردنی ئاسنی دیکە.

ب. **دوو شاخە** ـ بەرینکردنەوە پەڕەکانی گاسن. بە تێکەڵ کردنی ئاسنی دیکە.

پ. **بەڕەنیا** ـ تێژکردنەوەی نووکی گاسن. بە تێکەڵ کردنی ئاسنی دیکە

**تۆقی گاسن** ـ پارچە شیشێکی لەسەر چەشنی بازنە چەمێندراوە. گاسنی پێ لە زمانەی هەوجار قایم دەکرێت.

**قرۆمە** ـ مەبەست پێک وەنووساندنەوەی، هەڵبەتە دوای شکاندن، زمانەی هەوجار بە قونکی هەوجار. چەند کونێکی وەکو یەک لەم و لەو دەکرێت. ئینجا شیش لە کونەکان رادەکرێت و، سەرەکان بە چەکوچ بۆ لایێک دەپاچێنەوە. هەندی جار سەری شیشەکان دەنەدەنەن و بە بورغی(پێچ) دەبەسترێن.

**مژانە** ــ دارێکی دوو مەتر درێژ و بیستوپێنج سانتیمەتر ئەستوورە. سێ کونی(یەک لە سەر و دوو لە پا) تێکراوە. سەری مژانە، دوای رەتکردنی بە ناو بۆسە (زەنگوڵەی نیر). دەخرێتە ژێر نیرە. سەرمژانەی، بۆ لێک

قایمکردن، لە کونی نیرە و مژانە رادەکرێت. پای مژانەش، لەگەڵ ژێر سەری باسکە هەوجار جۆت دەکەن و دوو خەپەی لە کونەکان رادەکەن.

**خەپە** ــ دارێکی لوسکراوی بیست سانتیمەتر درێژ و دە سانتیمەتر ئەستوورە. کونێک، بۆ تێڕاکردنی کرمۆکە، لەسەری خەپە، بۆ ئەوەی لە کونەکە نەکەویتە خوارەوە،کراوە.

**نیرە** ــ دارێکی ڕاستی بیست سانتیمەتر ئەستوورە. درێژیەکەی بۆ هێستران یەک مەتر و نیوە و بۆ گێدرێژان یەک مەتر و بیست و پێنج سانتیمەترە. شەش کونی لە ریز یەک تێکراوە. چوارانیان (دوو لەم سەر و دوو لەو سەر) کە بە کونی دارکراوە ناسراون، دارکراوەیان تیدەندرێت. دووانیشییان( لە ناوەڕاست بە دووری پازدە بۆ بیست سانتیمەتر) کە بە کونی دارخەزنە ( دوو گوێی نیر یان کێروشکە) ناسراون، خەزنەیان، بۆ راگرتنی هیرتە تێدەندرێت.

**دارکراوە** - چوار داری بەڕوو(گوێز. توو) دوو گوێ یان سەرخڕی چل سانتیمەتر درێژ و دە سانتیمەتر ئەستوورە. دوو لە کونەکانی ڕاست و دوو لە کونەکانی چەپی نیرەکە رادەکرێن و دەکەونە پێش، بۆ ئەوەی شانی ئاژەڵەکان برێندار نەبن، کۆپەران. ملی ئاژەڵەکان، بۆ ئەوەی ڕاست بڕۆن، دەخرێتە نێوان دارکراوەکان. بنی دارکراوەکان، بۆ نەترازانی بەنکراوە، لەلەکراون.

**بەنکراوە** - بەنێکی کشتی(نیمچە گوریس) حەفتا سانتیمەتر درێژ و دوو سێ سانتیمەتر ئەستوورە، بنی دارکراوەکانی، بۆ بەرزەفت کردنی دارکراوەکان، پێ قایم دەکرێت.

**دارخەزنە (دوو گوێی دار. کێروشکە)** ـ دوو داری بە دە پازدە سانتیمەتر لێک دووری داتاشراوی پازدە سانتیمەتر درێژ و دە سانتیمەتر ئەستوورن. لە کونەکانی ناوەڕاستی نیر، بۆ راگرتنی هیرتە، رادەکرێن.

**هیرتە (وێژە)** ـ پارچە قایشێکی چل سانتیمەتر درێژ و بیست سانتیمەتر پانە. بۆسە و نیرە، لە نێوان دارخەزنە، بە یەک دەبەستێتەوە. ئەو کاتانەی قایش دەست نەکەوێت، هیرتە لە گوریس یان کندر، دروست دەکرێت.

**بۆسە (زەنگوڵە)** ـ دار بەرووەکی مەترێک درێژ و دە سانتیمەتر ئەستوورە. بە شێوەی بازنە چەمێندراوە و قەفکراوە. کاتی جۆت دابەستان، مژانە و نیری بە بۆسە لێک دەبەسترێن.

**بەربۆسە** ـ دارێکە لە لای سەروەی بۆسە(زەنگوڵە) قایمکراوە و دەیکات بە دوو بەش. سەری مژانەی دەکەویتە سەر و لەکاتی کێشانی هەوجار رایدەگرێت.

**سەرمژانە (گاینجە)** ـ دار بەرووەکی سی سانتیمەتر درێژ و دە سانتیمەتر ئەستوورە. بە تەپشوویدار خۆشکراوە. دەخرێتە، دوای تێپەربوونی سەری مژانەکە بە ناو بۆسەکە، ناو کونی لای سەرووی مژانەکە.

**کۆپەڵان (کۆپەران. بارینە)** ـ لوولدراوێکە لە گوش یان پەڕۆکۆنە یان پارچە لبادی کۆن دروست دەکرێت. لە قایشی، بۆ ئەوەی زوو لەبار یەک نەچێت، دەگرن. رۆخەکانی و جەمسەرەکانی بە سیرمە دەدوورن. دوو فرفرۆکەی، یەک لەم سەر و یەک لەو سەر، قایم دەکەن. بەنکراوەی، بۆ گەیاندنی هەردوو سەری کۆپەڵانەکە، لە فرفرۆکەکان دەبەستن.

کۆپەڵان، بۆ ئەوەی بەرسینگ و پیلەکانی وڵاغەکان نەچەمێن و نەگۆیندرێن، دەخرێتە دوای دارکراوەکان.

**بنمل** ـ پارچە لبادێکی نیمچە چوارگۆشەی مەترێک و پەنجا سانتیمەتر درێژە. بنمل، بۆ ئەوەی ملی وڵاغ بریندار نەبێت، دەبێت ئەستوور( سێ پارچە) بێت. رووەکەی بە قایش، بۆ ئەوەی زوو لەبار یەک نەچێت، دادەپۆشرێت.

**لاپووتە (مەساسە)** ـ پارچە ئاسنێکی دەمخڕی بە قۆڵە. جوتیار قوڕی سەر گاسن و هەوجاری پێ پاک دەکاتەوە.

**دارجۆت** ـ دارێکی مەترێک و بیست سانتیمەترێک درێژ و دە سانتیمەترێک ئەستوورە. بزمارێکی سەر تیژی، بۆ نەقیزەدانی چواررۆی جۆت، تێ بڕاوە.

**جەلەو (جڵەو)** ـ بریتییە لە گوریسێکی(کندرێکی) پێنج مەترێک درێژ. دوو قەد دەکرێت. قەدی ڕاستی بە لای ڕاستی وڵاغ دەبردرێت و بەناو زەناخە

و قەڕاسە قایم دەکرێت. قەدی چەپیش، بە هەمان شێوەیە وەلێ لە لای چەپی وڵاغ دەبێت. ناوەندی گوریسەکە بە دەستی جوتیارەوە دەبێت. ئەویش، بۆ ئەوەی نەکەویتە سەر هەوجارەکە و بە ئاسانی دەستی بگاتێ، لەو پارچە دارەی سەر دەستەمستەی دەستەندوەکەی دەئاڵێنێ. وڵاغی پێ لێدەخوڕیت و ڕاست و چەپییان پێ دەکات. کاتی هۆدانەوەش بۆ خۆی رایان دەکێشێت.

**٣. پاچ**

ئامرازێکی دەستییە. دەمەکەی پارچە ئاسنێکی، بۆ ئەوەی بە ئاسانی زەوی پێ بکۆڵیت، پانکراو و تیژکراوە. سەرەکەی دیکەی بۆرێکی پێنج ئینجی پازدە سانتیمەتر درێژە بە ئۆکسجین لێی لەحیمکراوە. باسکەکەی داربەڕوو یان دارئەسپیندارە. نرخی باسکی داربەڕوو لە بازاڕی قەڵادزێ چوار هەزار دینارە.

**٤. پێمەڕە**

ئامرازێکی دەستییە. دەمەکەی لە ئاسن دروست کراوە. سەرەکەی، بۆ ئەوەی بە ئاسانی لە عەرد رابچیت، نووکەکی تیژە. پشتەکەی، بۆ ئەوەی سەری باسکەکەی تێ ڕابکرێت، قۆڵە. هەندێکیان، بە مەبەستی پێ لەسەر دادان و داگرتن، شیشەکی پازدە سانتیمەتر درێژی، لە لای چەپی پێوە لەحیمکراوە. باسکەکەی داربەڕووێکی دوومەتر درێژ و پازدە سانتیمەتر ئەستوورە.

**کۆلی دۆشاو**

ئەمەیان لە کۆلکەدارێکی وشکی دارتوو یان داربی یان دارگوێز دروست دەکرێت. درێژییەکەی ١٥٠ سانتیمەتر و پانییەکەی لە دیوی ناوەوەی ٥٠ سانتیمەتر و لێوارەکانی ٤٠ سانتیمەترە. کۆلکەکە، بە تەپشوویداری، لەم سەر بۆ ئەو سەر، پەلدەدرێت. سولاوکە(سولکە) ێکی ٣٠ سانتیمەتر درێژ، بۆ پێداهاتنی لینجاوی ترێ، لە سەرێکیەوە قایمکراوە.

**ب. کاڵا لە قامیش و نەیجوور**

ئامرازی جۆراوجۆر، بە دەستی سەبەتەچنان لە قامیش و نەیجوور و بەن و پەرۆکی رەنگارەنگ، دەچندرێت. هەندێک لەو کاڵایانەی، کە بە گوێرەی ئەلف و با پاش ریزکراون، ئەمانەی خوارەوەن:

**چیغ**

بە دەستی ژنان لە قامیشی خۆڕسکی دەو رووباران یان ئەوانەی مرۆڤ لە شوێنێک چاندویەتی، دەچنرێت.

خانمێکی گوندی وەرتێ، چیغێکی پێنج مەتر درێژ و دوو مەتر پانی بەو شێوەی کە باسی دەکەم، دروست دەکرد (وێنەی ٥٠). دوو بەرمیلی نەفتی (لە شوێنی دیکە دوو داری دوولکی یان دوو دیوار) دوو مەتر لێک دووری دانابوو. کاریتەیێکی بیست سانتیمەتر ئەستووری هاویشتبووە سەریان. بیست و چوار بەردی بە سەنگی نیوکیلۆ و بە دووری پازدە سانتیمەتری بە کاریتەکە شۆرکردبۆوە. دوازدەیان روو لە خۆی و دوازدەکەی دیکەش پشت لە خۆی کردبوو. ئامێزە قامیشێکی لە تەنیشت بەرمیلەکان لە عەرد درێژکردبوو. دەستی دەدایە قامیشێک و لە سەر کاریتەکە درێژی دەکرد. بەردێکی ئەم بەرەی برند دەکرد و دەیخستە ئەو بەری. بەردەکەی بەرامبەری لەو بەر برند دەکرد و دەیخستە ئەم بەرەوە. بەو شێوە تاکو بەردەکان تەواو دەبوون. بەو کارەی قامیشەکانی جەلە دەکرد. سەری قامیشەکانی، دوای تەواوکردن، بە تەوری داری، بۆ ئەوەی یەک بن، قوت دەکرد. بەنموونەکەی دەستی، رەنگاو ڕەنگ و کەمێک ئەستور بوون.

چیغ بۆ چەند شت بەکار دێت وەکو: گرتنی دەور و ناوبڕەی ڕەشماڵی ڕەوەندان (وێنەی ٥١). رایەڵکردنی بەرگنی کارگەچییان. بنساپیتەی خانووان.

درێژی چیغێکی پێنج مەتر درێژ و دوو مەتر پان، لە گوندی بەکرە شەل لە کفری بە پەنجا هەزار دینارە.

**پ- کالا له شوورک(توولین)**

ئامرازی جۆراوجۆر، لە شوورک (توولە) ی ئەرخەوان. پەڵک. داربـاوی. دارتـوو. دارهـەنار. زەردەبـی. ڕەشـەبی. قـەرەقاج. کفـر. گـەز بـە دەسـتی سەبەتەکەران دەچندرێت. هەندێک لەو کالایانەی، کە بە گوێرەی ئەلف و با پاش و پێش کراون، ئەمانەی خوارەوەن:

**سەبەتەی نانی(تەیکە. سەلەی نانی. تریان)**

ئـامرازێکی خـڕ و پانـە لەسـەر شـێوەی سـینی فـافۆن و مـس وایـە و، کەمەڕەکەی شیست و ئەستوری پێنج سانتیمەترە(وێنـەی ٥٢). خـەڵکی بۆ نـانی تیـری لەسـەردانان و نـانی ڕەق ڕشـاندن دانـەیێکی بـە کـڕین یـان دروسـتکردن بێـت پەیـدا دەکـات. سـەبەتەی نـانی، بەرەبـەرە شـوین بـۆ سەبەتەی پلاستیک، بەردەدات.

**غەڵێف**

ئـامرازێکی لولـەیی مـەترێک درێـژ و کـەمـەڕە پـەنجا سـانتیمەترێک دەبێت. خاوەن مێشەکان،بۆ بەخێوکردنی مێشەهەنگوین، بە کاری دێنن.

غەڵێف لە لکی زەردەبی یان ڕەشەبی بەو شێوە دروست دەکرێت. لکێکـی نیمچـە ئەسـتوور و بـە درێـژی شێسـت سـانتیمەترێک دەکەنـە پۆسکە(بازنـەییێکی کـەمـەڕە هەشتا سانتیمەترێک دەبێت). ئینجا سـەری دوازدە دانـە قیسپی گۆپاڵی (نێوان قسپێک و قسپێک یـەک پەنجەیـە) لـە پۆسکەکە قایم دەکرێت. نێوان قسپەکان و بنی غەڵێفەکە سفت بـە شۆپی دەچیندرێت. دەمی غەڵێف بە پاشاغن(کونێک لـە ڕۆخـی پاشـاغن بـە نـاوی چاوی مێشێ بۆ هـاتوچۆکردنی مێشـەکان، دەهێڵنـەوە) دەگیرێـت. غـەڵێف بـە ڕیخـی بـەهاران، بـۆ دوورگرتنـی گـەرمای هـاوین و سـەرمای زسـتان، سواغ دەدرێت.

غەڵێف لـە ناوەوە بە تیرە و تەڵـە کراوە بـە دوو بـەش. هـەنگوێنـی لای قـونکی غەڵێفەکـە بـۆ مێشـەکان، بـۆ ئـەوەی نـەمرن، دەسـتی لـێ نـادرێت. هەنگوینی لای پۆسەکەی غەڵێفەکەش، خاوەن مێش دەیبڕێتەوە.

درێـژی غـەڵێف مـەترێک و نیـو دەبێت. قەدەکـەی لـە دەمـەوە هەشـتا

سانتیمەترێک دەبێت. وەلێ بەرەبەرە تەسک دەبێتەوە تاکو پەنجا سانتیمەترێک لە قونکیەوە.

**قەرتاڵە(تاسەوی. سەبەتەی ترێ)**

ئامرازێکی قوچەڵەکی مەترێک بەرز و کەمەڕە هەشتا سانتیمەترێک دەبێت. لە دەمەوە بەشە پاشان بەشییەکە بەرەبەرە وێک دێتەوە تاکو لە بنەوە پێک وەدەنووسی و بۆشایەکە نامینێت.

خاوەن باخچە و ڕەز و ئاژەڵ بۆ هینانەوەی میوە لە باخچە و ترێ لە ڕەز و فرێدانی زبڵی بن پێی ماڵات لە هۆڕ و کۆز و هی ڕەشەولاغ لە دیو و هی ولاغی بەرزە لە تەویلە دانەێکی دەکرێت یان خۆی دەیچنیت. قەرتاڵە لە هەندێ شوێندا، بەرەبەرە شوێن بۆ سندوقی پلاستیک چۆل دەکات.

**قەفەزی کەو**

ئامرازێکی گومەتی پەنجا سانتیمەترێک بەرز و کەمەڕە سی سانتیمەترێک و بن خڕ و پانە(وێنەی ٥٣). کەوبازەکان، لە ترسی بەڕەلابوون و نەگیرانەوە و فرێن و بەدەم پشیلەوە بوون ، لە قەفەزیان دەکەن. دوو قەفەز، شان بە شانی یەک، لەسەر تەختەک قایم دەکرێت.

**گێسکی گەز**

بریتییە لە قامکە(بیست و پێنج لکێکی ئەستوور و باریک) لکە گەز. ئەو چەشنە بە زۆری لە ئەستانی هەولێر و سلێمانی و دهۆک بەکار دەهیندرێت.

هەندێک لەو ئامرازانەی کە چەند ساڵێک لەمەوبەر بەکاردەهات ئەمانەبوون: سەبەتەی بەقاڵ(بۆ گۆشت بەرچاوخستن) سەبەتەی زبڵ(بۆ زبڵ لە شەڵتەکردن) سەبەتەی کرێکار( بۆ خۆڵ کێشان).

**ت. کاڵا لە پووشوپەراش**

ئامرازی جۆراوجۆر، لە پووشوپەراش بە دەستی وەستا (بە زۆری ژن) دەچندرێت. هەندێک لەو کاڵایانەی، کە بە گوێرەی ئەلف و با ریزکراون، ئەمانەی خوارەوەن:

**تەوەق (سەبەتەی نانی. تریان)**

ئامرازێکی خڕ و پانە لەسەر شێوەی سینی فافۆن و مس وایە و، کەمەرەکەی شێست و ئەستوری پێنج سانتیمەترە (وێنەی ٥٤). لە لاسکی گەنم، کە هەندێکییان رەنگ (سەوز. سوور. شینی کاڵ) دەکرێن و بە بەن لێک قایم دەکرێن، دروست دەکرێت.

خەڵک بۆ نانی تیری لەسەردانان و نانی ڕەق ڕشاندن دانەیێکی بە کڕین یان دروستکردن بێت پەیدا دەکات. تەوەق بە زۆری لە گەرمییان، بە تایبەتی خانەقین، باوە. تەوەق، بەرەبەرە شوێن بۆ تەوەقی پلاستیک، بەردەدات.

**کورتان**

ئەمەیان بە مەبەستی پاراستنی ئاژەڵی بارهەڵگر وەکو: هێستر و بارگین و کەر، لە زامداربوونی پشت و بە ئاسوودەیی سواربوون، دروستکراوە و دروست دەکرێت. کورتان لەچەند شوێن، بە نموونە، کۆیە و ڕانیە و دیانا و حاجیاوە، ئامادە دەکرێت.

**ئامرازەکانی کورتاندوورین**

کورتاندوور بۆ دوورینی کورتان ئامرازەکانی خوارەوەی دەبێ لەبەر دەستدا بێت:

**شوژن (سوژن)** ـ ئامرازێکی کانزایی بیست و پێنج سانتیمەتر درێژ و دوو سانتیمەتر باریکە. سەرەکەی بە قەدەر پێنج سانتیمەتر پانکراوەتەوە و کونێکی لاکێشەیی، بۆ پێوەکردنی بەنموو، تێکراوە. قونکەکەی، بۆ ئەوەی بە ئاسانی لە کورتانەکە ڕابکرێت، تیژ کراوە. شوژن بە زۆری لەشاری تەوریز دەهاوردرێت.

**ناولەپ ـ** ئامرازێکی کانزایی سێ چوکرەییە. دەخرێتە ناو لەپی ڕاست و بە بەن لە پەنجەکان دەبەسترێت. ناولەپ بۆ پاڵدانی شوژن، لە کاتی دوورینداا، ئیشی پێ دەکرێت.
**بەنموو ـ** داوە لە مووی بزن. ژنان مووەکەی بە تەشی باریک دەڕێسن.
**بەڕ-** نرخێ بەڕی تازە و کۆن لە بازاڕی سورچییان لە دە هەزار بۆ چل هەزار دینارە. وەلێ نرخی نەخشدارەکان سێ ئەوەندەی نرخی بی نەخشەکان دەبێت.
**جاجم ـ** کورتاندرووەکان بە پارەکی کەم جاجمی تازە و کۆنییان لە بازاڕدا دەست دەکەوێت. کۆنە جاجمێک ( دوو بە سێ مەتر) لە بازاڕی سورچییان لە هەولێر بە دوو هەزار دینار کڕاوە.
**پووش ـ** گیای وشک بوو. دوو جۆرە بە ناوی: پوشی ئاسایی و کرتی. یەکەمیان، لەبەر ئەوەی لە دووەم نەرم و لوسترە، بۆ ئیشکردن خۆشترە.

**پارچەکانی کورتان**

کورتان لە شەش پارچان پێکهاتووە: سەرقەپۆز(سەرکورتان) و پاشکۆ و قوڕفە و بارێنە و پێشە و ناوخەزنە(وێنەی٥٥). هەر یەک لەو پارچانە کاری خۆی هەیە. بە نموونە، ..... لە خزینی بار بۆ پێش و پاش.

**پێویستییەکانی کورتان**

کورتان بە رووتی لەسەر پشتی وڵاغ خۆی ڕاناگرێت. بۆ ڕاگرتن دەبێت ئەمانەش هەبێت:
**قەڕاسە ـ** ئامرازێکی کانزایی یەک مەتر درێژ و قفرقفرە.
**سەرپارو ـ** پارچەیەکی یەک مەتر دریژە. لە پارچە لباد و بەڕە دروست دەکرێت. دەخرێتە سەر کەنەفی باربەر.
**قایش پارو ـ** پارچە قایشێکی دوو مەتردرێژە. سەرەکی قرفێکی کانزایی پێوە قایم کراوە. سەرەکەی دیکەی گوێچکەکانی، بۆ ئەوەی بە ئاسانی لە قرفەکە ڕابکرێت، قوت کراوە و چەند کونی، بۆ زمانەی قرفەکە، تێکراوە.
**تەنگە-** کەژوو(کەژی) بیەکی چوار مەتر درێژی و هەشت سانتیمەتر پانە.

ڕەنگی، لەبەر ئەوەی ژنان بە زۆری لە بەنموو دەیهونێنەوە، ڕەشە.

کورتاندوور، لە کاتژمێرێکدا، کورتانی کەران و لە دوو کاتژمێردا، کورتانی ولاغی بەرزە، دەدوریت.

نرخی کورتانی کەران لە لایی کورتاندرووییێکی خانی محمود ئاغا (کاروان سەرای) لە کۆیەیێ ١٥ هەزار و هی هێستران ٢٠ هەزار دینارە. لە حاجیاوەش، بە ٢٠ هەزار و ٢٥ هەزار دینارە.

**گێسک ـ** بە گوێرەی ئەو رووەکەی لێی دروست دەکرێت دوو جۆرە.

ء. گێسکی قەسەر ـ لە قەدی گەنم دروست دەکرێت. ژنان قونکی قامکە گەنمێک پێش کوتان و لەسەر جۆخین دەگرن. ئینجا بەو کوچکە بەردەی پێشییان، کە بۆ ئەو مەبەستە هێندراوە، تاکو گوڵەگەنمەکان رووت دەبنەوە، دادەدەن. ئەو چەشنە گێسکە، لە هەندێ لە گوندەکانی ناحیەی کەندیناوە و سەرگەڕان بەکار دێت.

ی. گێسکی شعر بنات ـ لە رووەکێک بە ناوی شعر بنات(گوندی قادراوە) دروست دەکرێت. تۆیەکەی لە ئێران دەهیندرێت. بیست بیست وپێنج لکی ئەستوور و باریک بە درێژی هەشتا سانتیمەترێک دەبێت. لکەکان بە شێوەی قامک و لە بنەوە، بە بەن یان لاستیک، لێک دەبەسترێت.

**ج. کاڵا لە پەلکە دارخورما**

هەندێک کەلوپەلی ناوماڵ و بازاڕ و خانووبەرە لە پەلک(سعف النخیل) ی دارخورما دەچندرێت. پەلکەکە بە درێژی تیلم تیلم دەکرێت. پانی هەر تیلمێک شەش سانتیمەترە. تیلمەکان کاتی دروستکردنی کەرستە ڕاست و چەپ تێک هەڵدەکێشرێن.

هەندێک لەو ئامرازانەی کە لە پەلکی دارخورما دەچندرێت و بە گوێرەی ئەلف و با ریزکران، ئەوانەی خوارەوەن:

**باوەشینە (باڕوشە)**

ئامرازێکی نیمچە چوارگۆشەیی (سێزدە بە نۆ سم) ڕەنگاو ڕەنگ

(سووری پات. کەسکی پات. مەیلەو زەرد) و کلک(سی و حەوت سم) دارە(وێنەی ٥٦). خەڵک هاوینان، بۆ خۆ فێنک کردنەوە، لە دەستی دەگرن. کەبابچییەکان، بۆ ئاگر خۆشکردن، بەکاری دەینن. خانەقی، لەبەر هەبوونی پەلکەدارخورما، یەک لەو شوێنانەی گەرمیانە کە باوەشینی لێ دەچندرێت.

**زەمبیل**

یەکێکە لە ئامرازە کۆنەکانی هێنان و بردنی میوە و سەوزە. لە تیلمی پەلکەدارخورما دەچندرێت. فۆرمێکی(شێوە. شێواز) گۆلمانی هەیە. قورپەکی بۆ لە ناوەڕاست، بۆ ئەوەی لە کاتی هەڵگرتندا هاوسەنگی هەبێت، کراوە.

هەندێک لە ناوی دیکەی زەمبیل ئەمانەن: زەنبیل. زەمبیلە. تلۆخ. لەرتەلە.

**گێسک**

چەشنی باوەشینەیە، بۆ ئەوەی عەردی پتر بگرێت، لاکێشەیی چندراوە. ئەوەیان، لەبەر هەبوونی کەرستەی پێویست، بە زۆری لە ئەستانی کەرکوک و گەرمییان، بۆ ناوماڵ ماڵین، بەکار دەهندرێت.

**ژێربابەتی ٦- پیشە و کاڵای ئاسنەمەنی**

مەبەست گشت ئەو کاڵانەیە کە پیاو(ئاسنگر. زێڕنگر. تەنەگەچی. تۆرینچی) لە ئاسن و تەختەئاسن(پلێت. تەنەگە) لە گڵ لە دەزگایەکان(ورشە) و کارگەکان، بە مەبەستی کڕین و فرۆشتن، دروستیان دەکات. هەندێک لە پیشە و کاڵای ئاسنەمەنی ئەوانەی خوارەوەن:

**ئاسنگریاتی**

یەکێکە لەو پێشە تڕادیسیۆنانەیە، کە تاکو ئێستا، لە هەندێ شار و شارۆچکە(دهۆک. کەرکوک. سۆران. ڕانیە) و گوند(خانەقا. دولێجان) ماوەتەوە. ئاسنگر بۆ دروستکردنی ئامراز بۆ کشتوکاڵ و ئاژەڵداری و دارستان و شەڕکردن، بە ئامرازەکانی خوارەوە کار دەکات.

### ٠١. کووره

مەبەست لە کووره ئەو ئامرازەیە کە بە بادانی بەدەست یان بە وزەی کارەبا بای، لە ڕەژووی پێشی بۆ سوور بوونەوە، دەکات. کووره بە گوێرەی مادەکانی لێوە دروستکراو و شێوە و هێزی بەگڕ خەستنی و نرخ و سووک و گرانی و مێژووی دروستکردنی سێ جۆری هەیە. جۆرەکان ئەمانەن:

**کوورەی هەنبانە**

بریتییە لە دوو پێستی خۆشکراو. ملەکانییان لولەی ئاسنی تێگیراوە. لولەکان بۆ یەک وێک هاتووتەوە و لە لولە ئاسنەکی گەورەتر ڕاکراون. سەری لولەکە لە ڕەژووی ناو ئاگردانەکە کراوە. پێستەکان، دەسکییان بۆ کراوە. شاگرد بە دەستەکانی دەسکەکان دەگرێت. جارێک دەستەڕاست و جارێک دەستەچەپ بڵند دەکات و دایدەنێتەوە. بەو شێوە پڕۆسەکە، تاکو ڕەژووەکە سوور دەبێتەوە و دەبێتە پەنگر، دووبارە دەکرێتەوە. ئاسن، بۆ نەرمکردنی لە ڕەژووەکە ڕادەکرێت.

**کووره گادەم**

بریتییە لە تەختەییێکی مەترێک و سی سانتیمەتر درێژ و مەترێک پان. تەختەکە دوو پێچکی بە درێژی دوو مەترێک هەیە(وێنەی٥٧). دانەییێک لە کوورەگادەم لە لای وەستاییێکی(احمد حمدامین ناسراو بە وەستا رحمان) گوندی خانەقا لە دۆڵی خانەقا هەیە.

**کوورەی مەکینە**

بریتییە لە مەکینەییێکی خڕی خۆڵەمێشی. بە کارەبا کار دەکات. لە کاتی ئیشکردندا یەکێک دەسکەکەی با دەدات. با لە لولەکەی دێتە دەرێ. سەری لولەکەی لە ڕەژووی پێشی کراوە. دانەییێک لەو کورە لای ئاسنگرێکی شارۆچکەی سۆران(صدیق ابابکر عیسی) هەیە(وێنەی٥٨).

**کوورەی نەفت**

بریتییە لە کوورەییێکی قوچەکی لە قوڕ و خشت دروستکراو. سێ لایی قوچەکە، بۆ گەرماو دووکەڵ پەرتنەبوون، گیراوە. چوارەمی، بۆ هینان و بردنی ئاسن، والا هێشتراوەتەوە سەری قوچەکە، بە مەبەستی پەنگ

نەخواردنەوەی دووکەڵ و دەرچوون، بۆرییەکی کانزایی ـ تەنەکە یان بەرمیل ـ تێگیراوە. بەرمیلێکی چل و دوو گالۆنی لە سەر چوارپەیەک لە تەنیشت داندراوە. بۆرییێکی بە زەمبەرە، بۆ بەلانسکردنی سووتەمەنی، لە بەرمیلەکە گیراوە. حەوزێکی کانزایی ـ قونکە تەنەگە یان قونکە بەرمیل ـ لە ناوەڕاستی کوورەکە و لە نێو دوو دیوارۆکە داندراوە. کاتی ئیش پیکردن زەمبەرەکە دەکریتەوە. سووتەمی بۆ ناو حەوزەکە دێت. ئاگر لە سووتەمەنییەکە بەردەدرێت. ئاسن بە مەبەستی سوورکردنەوە بە درێژی لە سەر دیوارۆکەکە دادەندرێت(وێنەی ٥٩). دانەییێک لەو کوورە لە سۆران(مخسود شمعون بێدیاڵی) و سێ دانە(اندریوس یاقو عزیز و دوو کەسی دیکە) لە نێوچەی پیشەسازی شاری دهۆک هەیە.

**٢. گاز**

هەڵگرتن و دانان و گرتن و وەرگێڕان و کوتانی ئاسنی سوورکراوە لە ناو کوورە و لەسەر سندان ودروستکردنی ئامراز، پێویستی بە گازی جۆڕاو جۆر(دەمپان. دەمخوار. کلکدرێژ. کلککورت. بچووک و گەورە) هەیە. گازەکان ئەمانەن: کوورە، ڕاستە، قەڵەم و هیدیکە.

**٣. قەڵەم**

کونکردنی ئاسنی سوورکراوە بە قەڵەمی ئەستوور و باریک دەکرێت. گەورە و بچووکی کونەکان دەوەستێتە سەر چەشنی ئامرازە دروستکراوەکە. بە نموونە کونی چەکوچی دەستی لە کونی ماور بچووکترە.

**٤. سومبە**

بڕینی ئاسنی سوورکراوە بە سومبە دەکرێت. ئەستووری و بارێکی سومبە دەوەستێتە سەر ئەستووری و باریکی ئاسنی بڕاو. چەندی ئەستوورتر بێت ئەوە پێویستی بە سومبەی ئەستوورتر دەبێت.

**٥. مەورەد(کارتیخ)**

پارچە ئاسنێکی لاکێشەیی(درێژی سی سم . پانی پێنج سم) دڕی ورد یان درشتە. دەسکێکی داری بۆ کراوە. بۆ تیژکردنی ئامرازی بڕین وەکو داس و تەور بەکار دەهیندرێت.

**٥. سندان**

دەزگاییێکی ئاسن ڕێژی دەم باریک و قون پان و بن ئەستووری چوار گۆشەیی درێژووکانی و لوسە(وێنەی ٦٠). ئاسنی سوورکراوەی لەسەر دەکوترێت و دەبرێت. سندان لە سەر کۆتەرە دادەندرێت. کۆتەرە، ئەگەر وەستا بە دانیشتنەوە کار بکات لەسەر عەردی و ئەگەر بە پێوەش بێت لە سەر سەکۆ دادەندرێت.

**٦. ماور**

سەلکێکی لولەییە درێژیەکەی بیست سانتیمەتر و پانی هەشت سانتیمەتر دەبێت چوار لایەکەی پانە. شاگرد ئاسنی سوورکراوەی دەستی وەستای لەسەر سندان پێ دەکوتێت. دوو جۆرە ماور هەیە. تەوشوانی - ئەمەیان دەمەکەی پانە و بیورانی - ئەمەیان دەمەکەی درێژە.

ئاسنگر زۆر شت لە ئاسن دروست دەکات. هەندێکییان ئەمانەن: داس. داسووکە. پیشەقان. پێمەڕە. گاسن. تەپشوو.

**تەنەگەچیاتی**

هەندێک لەو کەرستانەی تەنەگەچی(تەنەگەکار) لە کانزای وەکو پلێت و تەنەگە دروستیان دەکات ئەمانەی خوارەوەن:

**ء. تەندووری پلێت**

مەبەست ئەو ئامرازیەی نانبرژاندنەیە کە تەنەگەچی لە پلێتی سپی مەیلەو تەنک دروستی دەکات(وێنەی ٦١). پەیدابوونی ئەو جۆرە تەندوورە بۆ سەرەتایی نۆهەتەکانی سەدەی بیستەم دەگەڕێتەوە. واتە بۆ دەوروبەری ئەو سەردەمەی دانیشتوانی گوندەکان بە زۆرەملێ بۆ ئۆردووگایەکان لە لایەن عێراقەوە ڕاگوێزران.

ڕاگوێزراوەکان، لەبەر نەبوونی شوێن و دارودوڕ لە شوێنی تازەیاندا، بۆ نانبرژاندن پەنایان بۆ تەندووری کانزایی، کە بە نەفت و گاز گەرم دەبێت، بردووە.

**ب. سێری نانی(ساج)**

مەبەست ئەو ئامرازەی نانبرژاندنەیە کە تەنەگەچی لە پلێتێکی تەنک دروستی دەکات. سێر خڕە و کەمەڕەکەی حەفتا سانتیمەترە وە پشت دەرپەڕی و روو چاڵە. هەندێکیان، بۆ ئەوەی دووکەڵ پەرت نەبێت، رۆخێکی کون تێکراوی لە تەنەگەی بۆ کراوە و بۆڕی تەنەگەی تێخراوە (وێنەی ٦٢).

سێر، بۆ ئەوەی نانی لەسەر ببرژێندرێت، بە دەمنخوونی دەخرێتە سەر سێکوچکەییێکی بەردی یان گلێ و بە دارودووڕ گەرم دەکرێت. ئینجا نان هەویری ـ ئەنگوتکی پانکراوە ـ بە دوو لایی لەسەر تیرۆگ لەسەر سێرەکە ڕادەخرێت. دوای برژانی رووەکەی بۆ ئەوەی پشتەکەشی ببرژێت بە ناوبرێشک لەسەر سێرەکە وەردەگێڕدرێت.

نانبرژاندن بە سێر، بۆ خێزانێکی بچووک ( پێنج سەر خێزان)، بە تایبەتی ئەگەر کچیان نەبێت، ژنێک ـ دایک ـ دەیکات. بۆ خێزانێکی گەورە ( پێنج سەر خێزان و زیاتر) و بە مێوان دوو ژن ـ دایک و کچ یان خەسوو و بووک یان کچ و دش ـ دەیکەن.

ئامرازەکانی نانبرژاندن بەسێر ئەمانەن: تیرۆگ، ناوبرێشک، فەرشە، کەور، تەشتی هەویر، سێر، شیشی ئاگر.

**مەشکەی فافۆن**

بریتییە لە بەرمیلێکی فافۆن(ئەلەمنیۆم) ی رەنگ سپی. دوو قوڵپی بۆ دەست پێوەگرتن و هەژاندن، یەک لەم سەر و یەک لەو سەر، بۆ کراوە. دەمێکی کەمەرە بیست سانتیمەرێک، بۆ تێکردنی شیر و ماست و هەڵرێژتنی دۆ و کەرە، لە قەد بۆ کراوە. رۆخێکی قەپاغداری پازدە سانتیمەتر بڵندی تێگیراوە (وێنەی٦٣). بە کندر یان گوریس یان کەژی بە دارمەشکە(سێ پا) ی وەدەکرێت و ژنان دەیهەژێنن.

کۆچەرەکان و مەڕدارەکان، بیست ساڵێک لەمەو بەر لەبەر نەبوونی کارەبا و مەشکەی فافۆن ماستییان لە مەشکە دەهەژاند.

مەشکە بەو شێوە بەکار دەهیندرێت: دەست و پای مەشکە، بۆ ئەوەی

بە ئاسانی ماستی لە دەم بکرێت و بهەژێندرێت لە دەستەخوردە بە پەت قایم دەکرێت. ناونۆرک لە کونی دەستەخوردەکان، بۆ ئەوەی مەشکە ڕەپ ڕاوەستێت هەڵدەکێشرێت. گوریس لەسەری دەستەخوردەکان، بۆ هەڵواسینی بە سێپایە، دەبەسترێت. سەری گوریسەکان دەگەینەوە یەک و دەیخەنە نێوان گوێی پایەکان. ژنێک یان دوو ژن، دەست بە هەژاندن، تاکو کەرە و دۆ لێک جودا دەبێتەوە، دەکەن. ئەو کارە، بە زۆری بەیانییان، ئەنجام دەدرێت.

**ناڵبەندی**

ئەو پیشە، لەبەر کەم بەخێوکردنی وڵاغی بەرزە، باوی پەنجا ساڵێک لەمەو بەری نەماوە. لەگەڵ ئەوەشدا، لە نێوچە شاخاویەکاندا، بە تایبەتی ئەو گوندانەی کە خەرێکی هینان و بردنی بارن لەم دیوەوە بۆ ئەو دیو یان لەو دیو بۆ ئەم دیو، ماوە.

**کەرستە و ئامێرەکانی ناڵبەندی**

ناڵبەند، بۆ ناڵکردنی وڵاغ، پێویستی بەو کەرستە و ئامێرانەی خوارەوە هەیە:

١. **ناڵ** ـ ئەمەیان، بە گوێرەی فۆرمەکەی، دوو جۆری هەیە.
ء. تەختە ـ پارچە ئاسنێکی تەنکی خرە. بە قەدەر سمی وڵاغ بڕاوە. شەش کونی(سێ لەم تەنیشت و سێ لەو تەنیشت)، تێکراوە. بە بزماری ناڵ، لە بنی سمی وڵاغ، قایم دەکرێت. تەختە بە زۆری بۆ وڵاغی نێوچەی نەرمایی بەکار دەهیندرێت.
هەلقە ـ پارچە ئاسنێکی کەمێک ئەستووری خرە. بە قەدەر سمی وڵاغ بڕاوە. شەش کونی(سێ لەم تەنیشت و سێ لەو تەنیشت)، تێکراوە. بە بزماری ناڵ، لە بنی سمی وڵاغ، قایم دەکرێت. تەختە بە زۆری بۆ وڵاغی نێوچەی ڕەقانی بەکار دەهیندرێت.
٢. **بزمار** بزمارێکی حەوت سانتیمەتر درێژە. سەرەکەی چوارگۆشەی

کەمێک، بۆ ئەوەی زوو نەخورێت، ئەستوورە و نوکەکەی، بۆ ئەوەی بە ئاسانی لە سمی ولاغ بچەقێت. تیژە.

٣. **سمتراش** ـــ پارچە ئاسنێکی پەنجا سانتیمەتر درێژە. سەرەکەی ئەوەندەی ناو لەپ پان و کەمێک کەوانەیی و دەم تیژە. کلکەکەی بە قەدەر پەنجەی دەست ئەستوورە. دەسکەکەی لە دارگیراوە. بنی سمی، بۆ جێگرتنی ناڵ، پێ دەتراشێت.

٤. **سمبڕ** ـ پارچە ئاسنێکە لە شێوەی سمتراش دایە. سەرێکی دەسکێکی ئاس و سەرەکەی دیکەی دەسکێکی دارە. دەمەکەی، بۆ بڕینی رۆخێ سم دوای ناڵکردن، تیژە.

٥. **گاز** ـ پارجە ئاسنێکی دوو لکی ئەوەندەی پەنجەی دەست ئەستوورە. لە ناوەڕاست بە بزمار لێک قایم کراون. سەرێکی لکەکان کەمێک پان و بۆ ناوە چەماوەتەوە و تیژە. سەرەکەی دیکەی ڕاستە و کەمێک، بۆ نەکەوتنە سەر یەک، بۆ ناوەوە خوارکراوەتەوە. گاز بۆ قرتاندی سەری بزمار کە لە سم دێتە دەرێ بەکار دێت.

٦. **لەواشە** ـ دوو لکە داری پەنجا سانتیمەترێک درێژ و شەش سانتیمەرێک ئەستوورە. سەرێکی لکەکان، بۆ ئەوەی بە پەتک لێک قایم بکرێت، کون کراوە. سەرەکەی دیکە، بۆ گرتنی پەتک، لەلەکراوە. لێوێ ولاغ، بۆ ئەوەی لە کاتی ناڵکردندا بەر زەفت بێت، دەخرێتە نێوان دوو لکەکە و توند دەکوشرێت و دەبەسترێت.

٧. **سندان (دەزگا)** ـ پارچە ئاسنێکی چوارگۆشەی بستێک بەرزە. کونێک بۆ بزمار پانکردنەوە بە چەکوچ، لە لای سەرەوە، هەیە.

٨. **هەگبە** ـ کەرستەکانی ناڵبەند، بۆ ئەوەی بەم لا و بەو لا پەرت نەبێت، لە هەگبە دەکرین. هەگبە، وەکو توورەگە، لە پارچە جاجم یان بەڕە یان گوش هەر شتێکی دیکەی لەو بابەتەوە، ئامادە دەکرێت.

**ئامرازی بڕین**

جەخماخچییەکان ئامرازی جۆراوجۆر بۆ بڕین(چەقۆ و قەرەمبڕ) و برژاندن(شیشی کەباب و سیخی تکە) و قیمەکردن(ساتور) و تیژکردنەوە لە دوکانەکانیان بە نموونە، خەلیل زەینل لە هەولێر(وێنەی ٦٤) و یونس عەبدولخالق لە سلێمانی، بە چەکوچ و لەسەر سندان دروست دەکەن.

**ژێربابەتی ٧- پیشەو و کاڵای گڵەمەنی(تاسولقەیی. گۆزەمەنی. گڵکاری)**

یەکێکە لەو پیشە و کاڵایانەی کە ساڵەها ساڵە کورد دەستی داوەتێ. ئەمڕۆ ژمارەییێک لە خەڵک و لە شوێنی جودا جودادا، بە نموونە، خورماتوو کاروپیشەیان کردنی ئامرازی نانبرژاندن و ئاوتێکردن و گوڵچاندن و شتی دیکەی لەو بابەتانەن.

**تەندوور**

ئامرازێکی باوی نان برژاندنە. تەندوور، بە گوێرەی مادەی کردن و دروستکردن و گەورە و بچووکی و شوێنی دانان و توخمی ئیشکەر و بەرهەمی رۆژانە و چەشنی سووتەمەنی گەرمکردن، دوو جۆرە:

**١. تەندووری قوڕ**

ریشەی بەکار هێنانی تەندوور قوڕ بۆ نان برژاندن لە نێو کورددا، مێژوویێکی سەدان ساڵەی هەیە. تاکو سی ساڵێک لەمەو بەر، هەر ماڵە و تەندووری خۆی لە حەوشە هەبوو. ئەگەر نەشی بوایە ئەوە ئەوەی دراوسێیەکەی لەبەر دەستدا بوو. ئەورۆ تەندوور لە زۆربەی گوندەکان و کۆمەڵگە زۆرە ملییەکان هەیە.

**تەندوور کردن**

ژن یان پیاو، بەو شێوە تەندووری لە ماڵان یان لە دوکانان دەکات.

گڵی سوور، لەبەر ئەوەی زیاتر بەرگری گەرما دەگرێت و درەنگتر سارددەبێتەوە و چاکتر لەناو یەک حەل دەبێت، لە شوێنێک دەینن و بۆ ئەوەی گرمتەکانی لێ بگیرێت جوان لە بێژنگێکی نیمچە وردی دەدەن. گڵەکە، بۆ ئەوەی تێر ئاوبێت، دەکرێت بە حەوز و ئاوی، تێدەکرێت و

یەک دوو ڕۆژان لێی دەگەڕین. پاشان هەندێک خوری یان مووی ورد قرتێندراو یان بەرکای پێ دادەکەن و بۆ شێلان، بە پێی پەتی، دەچنە ناوی و جوان جوان دەیشێلن. چەند کاتژمێرێک، بۆ ئەوەی بخووسێتەوە، لەبەر سێبەرێ دایدەنێن.

تەختەییێکی پان دادەنێن و هەندێ بەرکای پێوەدەکەن. هەندێک قوڕی دەکەنە لوولە و بە خڕێ لەسەر تەختەکەی دایدەنێن و بە پەنجەکان و ناو لەپەکان پانی دەکەنەوە پاشان لوولەی دووەم و سێیەم و چوارەم ... هتد لەسەر یەک و بەهەمان شێوە پان دەکرێنەوە. تەندووری خاو، بۆ کزربوونەوەی، چەند ڕۆژان لەبەر ڕۆژی دادەندرێت. لە هەندێ شوێنانیشدا (گوندی کنگربان)، لە چاڵێک تاکو وەکو دەندوکی کەو سۆردەبێتەوە، سۆر دەکرێتەوە.

نرخی یەک تەندووری ماڵان، لە هەندێ شوێندا، سی هەزار دینارە و نرخی تەندووری سەر شەقامەکانیش، لەبەر ئەوەی سێ ئەوەندەی تەندووری ماڵان دەبێت و کردنەکەی کاتی زیاتر دەبات، سێ چوار کەڕەت گرانترە. بە نموونە، نانەواکانی هەولێر جۆتێک تەندووری لە کەرکوک بە سەد و سی هەزار دینار دەکڕن. ئەگەر بێتوو کرێی پیکاب و خەرجی چوون و هاتنشی لەگەڵ حسێب بکرێت ئەوە نرخەکە بۆ دوو سەد و پەنجا هازار دینار زیاد دەکات.

تەندوور بە گوێرەی گەورە و بچووکی و شوێنی دامەزراندن و مەبەست و ژمارەی ئیشکەر و ڕەگەزی ئیشکەر و ڕۆژانە دوو جۆرە:

### ء. تەندووری ماڵان

ئەمەیان، بە گوێرەی شوێنی دامەزراندن، سێ جۆرە.

**تەندووری سەر عەردی** ـ ئەمەیان لە حەوشە یان لە دەرەوەی حەوشە، بە رووتی دادەندرێت. دەورەکەی بە خشت و قوڕ دەگرێت (وێنەی ٦٥). دیواری بۆ ناکات و سەریشی ناگرێت. دووکەڵی تەندوور، لەو حاڵەتەدا، بە ئاسمان پەرت دەبێت و شوێنەواری نامینێت.

تەنـدووری سـەر عەردی،لەبـەر ئـەوەی کـەمتر چەمانـەوەی دەوێـت، مرۆڤی کەمتر تووشی پشت ئێشە و بێزاربوون دەکات.
**تەنـدووری نـاو عـەردی** ـ ئەمـەیان دەخرێتـە نـاو قـۆرتێکی، کـە بـۆ ئـەو مەبەستە لێدراوە، بەقەدەر بەژنی تەندوورەکە. ئینجا دەورەکەی بە گڵ پڕ دەکرێتـەوە و سـەرەکەی بـە قـوڕ مـارنـج دەکرێت. خۆڵەمێشـەکەی بـە بێرۆکەی زبڵی یان هەر شتێکی دیکەی لەو بابەتەوە پاک دەکرێتەوە.
تەندووری ناو عەردی، ئەگەر چی درەنگ سارد دەبێتەوە، نانکەری، لە بەر ئەوەی زۆر دادێتەوە و هەڵدەستێتەوە، تووشی پشت ئێشەی دەکات.
**ئۆجاغ**
هەندێ کەس تەندووری، لە ئۆجاغ (ژوورۆکە) دادەنێت. ئۆجاغەکە لە قوڕ و خشت و هەندێ جار بلۆک و چیمەنتۆ دروست دەکرێت(وێنەی ٦٦). بـەرزی دیوارەکـان دوو مـەترێک و ئەسـتووریان بیسـت سـانتیمەترێک دەبێت. ئۆجـاغ سێ لای دیـوارە و لای چوارەمیشـی دیـواری بـۆ نـەکراوە. دێوارەکان، بۆ ئەوەی دوکڵ لـە ژوورۆکـە پـەنگ نەخواتـەوە، دەلاقـەی سێ گۆشەیی لەسەر شێوەی پیتی ئێمی ئینگلیزی بۆ کراوە. بانـەکەی بـە دار و قوڕ گیراوە. تەندورەکەش لە قولنچێک لە قوڕ و خشت گیـراوە. ژوورۆکـەی بلـۆک، بـە هـەمان شێوەی ئـەوەی سـەرەوەیە، وەلـێ دەلاقـەی تێدانییـە و بچووکتریشە و تەندوورەکە لە ناوەڕاستی ژوورۆکە داندراوە.
**ئامرازەکانی تەندووری ماڵان**
ئامرازەکانی هەویرشێلان و پانکردنەوە و پێوەدان ئەمانەن:
**مـادە** ـ ئـامرازێکی خـڕ و پانـە و کـەمێک رووچاڵـە. تیرەکـەی پـەنجا سانتیمەترێک دەبێت. لـە خـوری و ئیسـفەنج و قەسـەر دروست دەکرێت. بەرگێکی سپی، بۆ ئەوەی نانەکە بە مادەکە وەنەنووسێت، تێدەگیرێت.
**دەرخۆنـە** ـ ئـامرازێکی خـڕ و پانـە و تیرەکـەی بەقـەدەر هـی مادەیـە. لـە تەختە(کەمەڕە ـ ٣٠ سم. ئەستووری ـ ٣ سم) دروست دەکرێت(وێنەی ٦٧). هەندێ کەس لە شوێنی دەرخۆنـەیدار کاشـی(درێژی ـ ٣٠ سم. پانـی ـ ٣٠ سـم. ئەسـتوری ـ ٣ سـم) بـەکار دەینێت. کاشـی ئـەنگوتکی لەسـەر پاندەکرێتـەوە.

**کەور**- ئامرازێکی چوارگۆشەییە. درێژی و پانی مەترێک دەبێت. رادەخرێت ئینجا مادە و ئەنگوتک(گونک) و ئاردی لەسەر تاوتوێ دەکرێت.

**سەرتەندوور**- ئامرازێکی خڕ و پانە. تیرەکەی کەمێک لە تیرەی دەمی تەندوور گەورەترە. لە پلێت دروست دەکرێت. لە ناوەڕاست، بۆ دانان و لادان لەسەر تەندوور، دەسکی بۆ کراوە. بان تەنوور، بۆ ئەوەی تینی ئاگر دەرنەچێت، دەمی تەندووری پێ دەگیرێت.

تەندووری مالان، لە هەندێ شوێناندا بە دار و لە شوێنی دیکە بە قشپل و تەپالە گەرم دەکرێت.

**ب. تەندووری کۆلانان(فڕنی)**

مەبەست لەو تەندوورەیە کە لە کۆلانەکان و سەر شەقامەکان بۆ نانبرژاندن و فروشتنی بە خەلک داندراوە. دوو دانە تەندوور، بە دووری مەترێک لێک دوور، لە تەنێشت یەک لە لاییێکی دوکان لە خشت و قوڕ دەگیرێت و بە پەرەمێزی نەفت یان گاز گەرم دەکرێت(وێنەی٦٨).

تەندووری سەر کۆلانەکان ، بۆ ئەوەی بە شێوەییێکی ڕێک و پێک کار بکات، سێ کەسی بە ناوەکانی خوارەوە پێویستە:

**شاتر**- ئەو کەسەی ئەنگوتکی بە دەستی پان دەکاتەوە و بە تەندووری وەدەدات. وەستا نانی بە تەندوورێک وەدەدات تاکو ئەوان دەبرژێن بە تەندوورەکەی تەنیشتی وەدەدات. ئیشی وەستا دوای ئامادەبوونی ئەنگوتک دەست پێدەکات.

**هەویرشێل**- ئەو کەسەی هەویری، جاران بە دەستی و ئەوڕۆ بە مەکینە، لە مەنجەلێکی گەورە دەشێلیت و دوای هەلاتنی هەوێرەکە دەست بە ئەنگوتک بڕین دەکات. ئەنگوتکبڕەکان(هەویرشێلەکان)، لە ئەنجامی دووبارەکردنەوەی کارەکەیان، ئەنگوتکەکان وەکو یەک(١٣٠ گرام) دەبڕن. هەویرشێل. پێش شاتر و شەدا دەست بە ئیش دەکات.

**شەدا**- ئەو کەسەی تەندووری گەرم دەکات و بە پارچە گوشێکی تەڕ پاکی دەکاتەوە و بە مەقاش نانی لێ دەردەینێت.

کاری تەندووری سەر شەقامەکان پیاو دەیکات. وەلێ لە شارەدێی

سەنگەسەر پیاوێک و دوو ژن هەوێری دەشێلن و نانی پێوەدەدەن و نانی لە تەندوور دەینە دەرێ و بە خەڵکی دەیفرۆشن.

**ئامرازەکانی تەندووری کۆڵانان**

ئامرازەکانی هەویرشێلان و پانکردنەوە و پێوەدان ئەمانەن:

**مادە**

هەمان مادەی تەندووری ماڵانە.

**ماشە**

ئاسنگر لە شیشی باریک دروستی دەکات. شیشەکەی، لە ناوەڕاستەوە دەچەمێنیتەوە وەکو پیتی ئووی ئینگلیزی لێ دەکات. هەر سەرێکی پارچە ئاسنێکی خڕی بچووکی بە ئۆکسجین، بۆ نانگرتن، لێ لەحیم دەکات.

**پرێمز**

تەنەگەچی، بۆ ئەوەی بەرگەی فشاری ناوەوەی بگرێت، لە پلیتێکی ئەستووری رەق دروستی دەکات. پەمپێکی ترومبێلی، بۆ پەممدانی نەفت، لێ قایمکردوە. بۆرێکی یەک ئینجی بۆ ناو تەندوور، تێگرتووە.

**مێز**

مێزێکی لاکێشەی گەورە یان بچووکە، بۆ رێزکردنی ئەنگوتک و نان هاویشتنەسەرە. بە زۆری لە پلێت دروستکراوە و پارچە پەرۆکێک یان گوشێکی لەسەر ڕاخراوە.

**سەرتەندوور**

هەمان سەرتەندووری تەندووری ماڵانە. وەلێ سێ کەڕەت بە قەدەر ئەو گەورەیە.

**مەنجەڵی هەویری**

ئەمەیان لە پلیتێکی ئەستوور دروستکراوە و کەمێک لە مەنجەڵی ساواری بچووکترە. ئارد و خوێ تێدەکرێت ئینجا ئاوی بەسەر دادەکرێت و مەکینە، جاران دەست، لە ناوی دەسورێ تاکو ئارد و ئاوەکە بەتەواوی لەناو یەک حەل دەبێت. ئینجا، بۆ ئەنگوتک بڕین، هەر جاری هەندێک، لە تەشتێک دەکرێت.

تەنـدووری کۆڵانـان، بـە نـەفتی سپی، گـەرم دەکرێـت. هـەر سـێ ڕۆژ (نزیکەی هەشت کـاتژمێر) یـەک بـەرمیلـی چـل و دوو گـالۆنـی دەسووتێنـی. تاکتاک تەندوور، بەو دوایی، لـە جیاتـی نـەفت بە گاز (یەک دەبـە گـاز بـە ٦ هەزار دینـارە) گەرم دەکرێت.

**کەرپوچ**

ئـەمـەیان، بـە گوێرەی بڕین، دوو جۆرە:

**ء. کەرپوچی دەستی**

ئامرازێکی لاکێشەی بـە درێژی بیست سانتیمەتر و پانـی دە سانتیمەتر و بـەرزی حـەفت سـانتیمـەرە. بـەو شێوە دروست دەکرێت: قوڕ لـە خـۆڵـی سـۆر دەگیرێتـەوە. یـەک دوو ڕۆژان، بـۆ ئـەوەی بخووسێتـەوە، دەستـی لـێ نادرێت. پاشان بە پێ دەشێلدرێت تاکو بەتەواوی حەل دەبێت. ئینجـا لـە قالـب دەکرێـت، دوای ئــەوەی بــە قــوڕکێش بــۆ شــوێنی کــەرپوچ بــڕین دەبردرێت.

کەرپوچ، لەوەتـەی کوورەچییەکان وازیـان لـە کـوورە هێنـاوە و کەسانـی بـە باوباپیر غـەیرە کوورەچی دەستییان داوەتێ، جوانـی و قـایمی جارانـی نەماوە. کەرپوچی ئێستا، دڕە و زوو هەڵدەوەرێت.

**ب. کەرپوچی کارگە**

ئامرازێکی لاکێشەی بـە درێژی بیست سانتیمەتر و پانـی دە سانتیمەتر و بـەرزی حـەفت سانتیمەترە. ئەمـەیان لوس و ڕێک و هەشت کون و ڕەنـگ سپییە. هەندێ کەس، بۆ جوانـی، خانووی لـەو جۆرە کەرپوچانـە دەکات.

**کوپەی ئاوێ**

گۆزەکارەکان دوو جۆرە کوپەی دروست دەکەن.

ء. **کۆجیلانی** ـ ئـەوەیان مـەترێک و دە سانتیمـەتر درێژە. لـە قونکـەوە بـەرەو دەمـەکـەی بـەرەبـەرە فرەوان دەبێت (وێنـەی٦٩). شێرەکـی لـە خـوارەوە، بـۆ ئاو لـە جـام کـردن تێدەکـەن. کوپـە، بـۆ ئـەوەی بـای لـێ بـدات و ئاوەکـەی سارد بکات، لـە کوپدان(کوڵـەنان) دایدەنێن.

ب. **مەیلـە و خـڕ** ـ ئـەوەیان سـەرو بنـەکـەی بـە قـەدەر یـەک گـەورەیـە. دوو

قـولّپی، بـۆ هـەڵگرتن، لـەم سـەر و لـەو سـەر بـۆ کـراوە (وێنـەی ٧٠). ئـەو چەشنە کۆپە، لە کفری و دەوروبەری زیاتر لە شوێنی دیکە بەکار دێت.

**شەربە**

ئـــامرازێکی لولـــەیی پـــەنجا ســـانتیمەتر درێـــژ و کـــەمـــەڕەی ســـی سـانتیمەترە. ملێکـی بـۆ ئـاو بـۆ کـراوە. دوو قولـپ بـۆ گـرتن لـە ملەکـە قایمکراوە.

**مەڕکان**

ئامرازێکی لە شێوەی مەنجەڵ وایە. وەلـێ نـە قولـپ و نـە قـەپاغی بـۆ کراوە. ئەندازەی بچووک و گەورەی هەیە. بە گوڵەوە، بۆ جوانی لە ژووری مێوانان و دانیشتن، لە قولینچێک دادەندرێت.

**هیزەدان**

ئامارازێکی لاکێشەیی چل و پێنج سانتیمەتر درێژ و سی و پێنج پان و بیست و پێنج بەرزە (وێنەی ٧١). ئەندازەی تریشی هەیە. هیزەی روونی کە لـە پێستە ئامادەکراوە بـە روونـەوە، بـۆ ئـەوەی خـراپ نـەبێت، دەخرێتـە ناوی و ئەو قەپاغەی بۆی دروستکراوە دەخرێتە سەری و بە قوڕ نەفەسبڕ دەکرێت. هیزەدان، ئەوەی من لە ماڵی مـەڕدارێکی گونـدی بـاوای سـەر بـە ناحیەی قەرەحەسەن دیوومە، وەکو کوپە و شەربە، سوور ناکرێتەوە.

**قوڕینەی مێش**

ئامرازێکی لولەیی پەنجا سانتیمەتر درێژ و کەمەڕە سی سانتیمەترە. دەمەکـەی بـە شـەپکە یـان پـەڕۆ دەگیرێت. کـونێکی، بـۆ هـاتوچۆکردنی مێشەهەنگوێنەیکان، لە قونەکەی بۆ هێشتراوەتەوە. قوڕینـەی مێش، لـە شوێنی غەڵێف و سەندوقی مێشان، لە گوندی باوادا، بەکار دێت.

هەنـدێک لـەو ئامرازانـەی کـە جـاران بەدەسـتی گۆزەکـەران دروست دەکـران و ئـەمڕۆ لـە مۆزەخانـە و بـە دەگمـەن لـە مـاڵان بـەرچاو دەکـەون ئەمانە بوون: جەڕە. گۆسکە. جەلحە (وێنەی ٧٢).

# سەربابەتی چوارەم
## خانووبەرە

خانووبەر ئەنجامی کۆمەڵێک فاکتووری سروشتی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسین. وەلێ رۆڵی ئەو فاکتەرانە لە سەردەمێک بۆ سەردەمێکی دیکەی مێژوو جودایە.

**ژێربابەتی١. کەرستەکانی خانووبەرە**

ئەمەیان، لە رووی سەرچاوە و پێکهاتە و شێوەوە، دوو جۆرە.

**ء. کەرستەکانی ترادیسیۆنی**

ئەمەیان لە سروشت، بە خۆڕایی یان کەمێک ماندووبوون، دەست دەکەوێت. کەرستەکانیش ئەمانەن:

**قوڕ**ـ گڵ لە ئاو دەکرێت و هوردەکای لێ دەدرێت و بە خاکەناس تێک دەدرێت و بە پێ دەشێلدرێت. قوڕ بۆ سەربانگرتن و دیوار سواغکردن وخشت لێک قایمکردن و دەرزپڕکردنەوە، بە پەقرەج و تەنەگە بەسەر دەخرێت و بە قوڕکێش و عارەبانەی دەستی لە شوێنێک بۆ شوێنیکی دیکە دەبردرێت.

**خشت** ـ قوڕی خوساوە، واتە قوڕی گیراو دوای یەک دوو رۆژ، لە قالبێکی لاکێشەیی سی سانتیمەترم درێژ و بیست سانتیمەرم پان و دە سانتیمەتر بەرز دەکرێت. چەند رۆژێک، بۆ ئەوەی وشک ببێتەوە، لە شوێنی خۆی دەستی لێ نادرێت. پاشان، بۆ شوێنی مەبەست، بە پشتی و لاغ و لە خشت کێش یان ترومبێلی بار هەڵگر دەگوازرێتەوە.

کچ و کوڕ لە گوندەکاندا، بۆ خانووبەرەی خۆیان، پێکەوە قوڕی دەگرنەوە و خشتی دەبرن و سەری بان سواغ دەدەن و هەندێ کاتیش قوڕی لەسەر دیوار پاندەکەنەوە و خشتی بە وەستا دەدەن.

**بەرد** ـ ئەمەیان، لە نێوچە شاخاوییەکاندا، بە شێوەی تلیشەبەرد و بەردی گەورە و بچووک و تەختەبەرد، هەیە. ئەوەی پێویستە بکرێت شکاندن و هەڵقەناندن و هینانە، لە شوێنێک بۆ شوێنێکی دیکە. هەندێ کەس، بۆ جوانی و دیوارڕاستی، بەردەکان نەقار دەکات.

**کاریته** ـ قەدی دارئەسپینداریکی سێ چوار مەتر دریژ و سی چل سانتیمەتر ئەستووره. بە پانی دەخرێتە سەر دیواری هۆدان. نێوان کاریتەیێک و کاریتەیێکی دیکە، بە گوێرەی ئاوهەوای ناوچەکە شاش و چڕ دەبێت. بانی خانووی گوندەکانی نێوچە شاخاوییەکان، بۆ خۆگرتن لەبەر قورسایی بەفر، کاریتەیان پڕ دەهاویشترێتێ. بە نموونە، خانووێکی حەوت مەتر درێژ و سێ مەتر پان، تاکو سی کاریتەی لەسەر دیوارەکانی ڕیز دەکرێت(وێنەی٧٣). بانی خانووەکانی نێوچە دەشتاییەکان، لەبەر نەبوونی بەفر، کاریتەی شاش دەهاویشترێتێ. بە نموونە، خانووێکی پێنج مەڕ درێژ و سێ مەتر پان، بۆ دە کاریتەی دەهاوێنێ.

**شەقرە** ـ لقی دارئەسپینداریکی( جاران داربەڕوو) دوو سێ مەتر درێژ و پازدە سانتیمەتر ئەستووره. بە درێژی دەخرێتە سەر کاریتەوە. بان چەندی شەقرەی زیاتر بهاوێترێ ئەوەندە زێتر خۆی دەگرێت.

**حەسیر** ـ لە پەلکی دارخورما دروست دەکرێت. لەسەر شەقرە، بۆ ئەوەی ڕێگە لە گڵی هەڵوەری و هاتوچۆی مشک و مار بگریت، یەک بە بانەکە، رادەخرێت.

**چرپ و چاڵ** ـ لقە هەرە باریکەکانی دار بییە. چرپ و چاڵ، بۆ ئەوەی حەسیرەکان سک نەدەن و کونیان تێ نەبێت، بە سەر کاریتان ڕادەخرێن.

**گورگە** ـ لقی دار بەڕوویکی مەترێک و بیست سانتیمەتر درێژ و پازدە سانتیمەتر ئەستووره. سەرەکی، لە نێوان کاریتەکان، دەخرێتە سەر دیوار و سەرەکەی دیکە دێتە دەری و لە بۆشایی رادەوەستێت. ئەوە بۆ ئەوە دەکرێت، تاکو باران لە دیوارەکە نەدات و ئاوی بانیش پێی نێتەخوارێ.

**سەردەر**ـ دوو سێ داری دوو مەترێک درێژ و بیست سانتیمەترێک ئەستووره. بۆ هەڵینجانی دیوار، دەخرێنە سەر دیواری دەرکەی هۆدە و حەوشەوە.

**دەرکە** ـ ئەمەیان بە گویرەی شوێنی بەکارهێندراو، نەوەکو هەر بەناو بەلکو بە مەتریالی لێ دروستکراو و شێوە، جۆراوجۆرە.

ء. دەرکەی حەوشە ـ ئاسنگر، دەری لە پلێتی دوو سانتیمەتر ئەستوور و چوارچێوە لە ئاسن، دروست دەکات و بە ئۆکسجین لێکییان دەدات.

دەرکـــەی یـــەک دەری و دوو دەری هـەیـــە. پـانـی و بـــەرزی دەریـــەکان بـــە چـالآکـی ئـابووری خـاوەن مـاڵ پابـەنـدە. بـە نموونـە، دەرکــەی حـەوشــەی مـەڕدار و کـەشـتیار، لـەبـەر ئـەوەی بڵنـد و بـەرین دروستکراوە، مێگـەل و تراکتۆری بـە ئـاسانـی پێدا هـاتوچۆ دەکـات. هـی کاسبکار و مووچـە خـۆر، جگە لـە مرۆڤ، دەرێ و ژووری پێ ناکرێت.

**ب.** دەرکـەی ماڵـەوە ـ دارتـاش لـە تـەختـە و فـایبـەر و چوارچێـوەی دار و ئاسنگر لە پلێت، یەکەمیان بە بزمار و دووەمیان بە ئۆکسجین دروستییان دەکـــات. خـــاوەن ماڵـــەکان، دەرکـــەی یـــەک دەری و دوو دەری لـــە خـانووەکانییـان دەگـرن. دەرکـەی ماڵـە دەوڵەمـەنـدەکان لـە هـی ماڵـە دەستکورتـەکان بـەرزتر و باشتر و رێکوپێکترە.

**پ.** دەرکەی ژوورەوە (هۆدە. چاوە)

دارتـاش ـ لـە تـەختـە یـان لـە فـایبـەر یـان لـە هـەردووکیان دروستییان دهکـات. درێــژی و پـانـی دەرکـەی چـاوی هــەبوونێک کــەمێک لــە هــی دەستکورتێک گەورەترە.

**بـاگوردان** ـ بــەردێکی لوولــەیی، هەنـدێ جـار کـۆنکریتیش، هەشـتا سـانتیمەترێک درێـژ و چـل سـانتیمەترێکیش ئـەسـتوورە (وێنـــەی ٧٤). دەسـکەباگوردانێکی شـیش یـا داری تێخـراوە. کەسـێک، کـاتی گێـران، دەسکەکەی دەگرێت و لـەمسـەر بـۆ ئـەوسـەری بـان و لـە دوای بـەفر بـارین یان باران بارین بۆ ئـەوەی بان دڵۆپە نـەکات دەیگێرێت.

**بـەفرماڵ (شـەپالۆخ)** ـ پێنج شـەش شـەپکە دار بـە بزمار لێک قـایمکراون و دەسـکێکی داری مـەتر و پـەنجا سـانتیمەترێک درێـژ و دە سـانتیمەترێک ئـەسـتووری بـۆ کـراوە (وێنـەی ٧٥). بـەفری سـەربانی خـانووی گوندەکانی نێوچە شاخاوییەکانی پێ رادەماڵدرێت.

**ب. کەرستەکانی مۆدێرن**

ئـەمـەیان بـە پـارە، لـە کارگـەکانی کەرستـەی بینـاکردن، دەکڕێت. کەرستەکانیش ئەمانەن:

**چیمـەنتۆ** ـ لـە هـاڕینی بـەردی تایبـەت بـە چیمـەنتۆ لـە کارگـەی چیمـەنتۆ دروست دەکرێت.

**کۆنکریت** ـ شلە پەیتەیێکە لە تێکەڵ کردنی چیمەنتۆ و زیخ و چەگل و ئاو دەگیرێتەوە. بان و حەوشە و بەردەرکەی پێ چیمەنتۆڕێژ دەکرێت.

**بلۆک** ـ بریتییە لە قالبێکی لاکێشەیی، چل سانتیمەتر درێژ و بیست پان و بیست بەرز، کۆنکریتی. زۆربەی هەرەزۆری بینایە لە نێوچە دەشتاییەکاندا و بەشێکی زۆری ئەوانەی لە نێوچە شاخاوییەکاندا بە بلۆک دیوارەکانییان دەکرێت. بلۆک لە شوێنی خشت و بەرد و کەرپوچ بەکار دەهێندرێت.

**شیش** ـ ئاسنێکی پێنج مەتر درێژ و سێ چوار سانتیمەتر ئەستوورە. لەسەر بانی خانوو یان لە سەر عەردی بینا یان کۆڵەگە، بەر لە چیمەنتۆڕێژکردن، دەبەسترێت.

**پەنجەرە** ـ وەستای دەرکە و پەنجەرە، لە سێ کەرستە دروستیان دەکات.

ء. دار و شیش ـ دارتاش، سی ساڵێک لەمەو بەر، لە دار و شیش دروستی دەکرد. پێنج و سێ و دوو فەردەییان هەیە. فەردەکان لاکێشین( درێژی ـ ١١٠ سم. پانی ـ ٤٥ سم) و بۆ چوار چاوی لاکێشی (درێژی ـ ٤٠ سم. پانی ـ ٢٥ سم) جام تێگیراو دابەشکراوە.

ب. شیش ـ ئاسنگر، سێ ساڵیکە، لە شیش لە دوکان دروستیان دەکات. جیاوازی لەگەڵ پەنجەرەی لە دار و شیش نییە. چوارچیوەکەشی، وەکو ئەوەی سەرەوە، نارزیت.

پ. دیڤیس و ئەلەمنیۆم ـ پازدە ساڵێک دەبێت، بە مەبەستی پێش گرتن لە هاتنی تۆز و باو گەرما و سەرما بۆ ژوورەکان، پەنجەرە لەو دوو مادە دروست دەکرێت. ئەگەر چی رێکوپێکن وەلێ خۆیان ناگرن و پاش یەک دوو ساڵان شەت دەبن و تێک دەچن.

**شێلمان** ـ ئاسنێکی سێ چوار مەتر درێژە بەرزیەکەی پازدە سانتیمەترێک دەبێت. بە لانکانی دەخرێتە سەر دیواری خانوو. ئینجا هەنگڵاین و حەسیر و قامیش دادەندرێت. پاشان خۆڵ هەندێ جار کۆنکریت لەسەر خۆڵەکە روو دەکرێت.

### ژێربابەتی٢. چەشنەکانی خانووبەرە

پۆلێنکردنی خانووبەرە، لەسەر بنەمای شوێنی جوگرافی و چەشنی

چالاکی ئابووری و کەرستەی بیناسازی و سیاسەتی دەوڵەت و ترادیسییای نەتەوەیی ئەنجام دەدرێت. خانووبەرە لەو لێکۆڵینەوە مەیدانییەدا،لەسەر بنەمای کەرستەی بیناسازی، پۆلێن کراوە.

**١. خانووی قوڕ و خشت**

دیوارەکانی لە خشت وقوڕ دەکرێت و سەرەکەی کاریتە و شەقرە و چرو و کەبەر و هاوشێوەی ئەوانەی دەهاویشترێتێ و خۆڵەبان دەگیرێت(وێنەی ٧٦). کەرستەکان بە خۆڕایی لە سروشت یا بە نرخێکی هەرزان دەست دەکەوێت.

گڵەبان، لەهەر شوێنێک بێت، خۆڵ بۆ سەربان بردنە و پەرتکردنیتی. لە گوندی سێناوە بەو شێوەیە. خۆڵ لە شوێنێک بە قازمە(تەور) هەڵدەقەندرێت. ئینجا:

بیدار ـ بە خاکەناس لە گوش(تەلیس) یا جەواڵی دەکات.

کەرکێش ـ دەرکی گوشەکەی لول دەدات و پشتی تێدەکات.

هەردۆک ـ دوو کەس، یەک لەم لا و یەک لەو ، قونکی گوشەکە دەگرن و بڵندی دەکەن و بە پشتی کەرکێشی دادەدەن. کەرکێش، بۆ سەربان، بە پێیلڤان هەڵدەگەرێت.

مەڕوان ـ گوشەکەی لە کەرکێش وەردەگرێت. قونکی گوشەکەی دەگرێت، بۆ ئەوەی هەڵی رێژیت، بڵندی دەکات. خۆڵەکەی، بە قەدەر یەک ئەستوور، پەرت دەکات.

شەوڵەبان(باگوردان) ـ هەندێ کا بە خۆڵەکە دادەکرێت. بۆ پەستانەوەی خۆڵەکە، شەوڵەبانی لەسەر دەگێرن.

سەرلەبەری خانووبەرەی هەندێ گوندان،بە نموونە، قەرەنگوێ (جگە لە سێ بینایەیی دەوڵەت)، ئۆمەڕگوومەت (جگە لە یەک خانوو و بینایەکی دەوڵەت). کۆیلێ(گشت خانووەکان)، سۆلاخ (گشت خانووەکان) لە قوڕ و خشت کراوەن.

هەوای خانووی قوڕ لە چاو هەوای خانووی کۆنکریتی، لەبەر ئەوەی کەرستەکانی بیناسازی، درەنگ گەرم دەبن و درەنگیش سارد دەبنەوە، لە وەرزەکانی ساڵدا، خۆشترە.

خانووی قوڕ و خشت، لەبەر ئەوەی کاتی بەفر کەوتن و باران بارین خۆڵی بانەکەی شل دەبێتەوە و کە شلیش بووە دلۆپەی دەکات، باگوردانی لەسەر دەگێڕن. هەندێ کەس، بۆ ڕێ لە دلۆپەگرتن، نایلۆنی شین بە سەری بانەکەی دادەدات. خڕکە بەرد یان کێسەی زیخی دوو کیلۆیی، بۆ ئەوەی با هەڵی نەگرێت، لەسەر نایلۆنەکەی دادەنێت.

**٢. خانووی قوڕ و بەرد**

دیوارەکانی لە بەرد و تلیشە بەرد و قوڕ دەکرێت. کەرستەکان، بە خۆڕایی لە سروشت و بە نرخێکی هەرزان دەست دەکەوێت(وێنەی٧٧). خانووی لە قوڕ و بەرد، جگە لە بەرد، جیاوازی دیکەی لەگەڵ خانووی لە قوڕ و خشت نییە.

**٣. خانووی تێکەڵ**

دیوارەکانی لە قوڕ وخشت و بلۆک و هەندێ جاریش کەونە کەرپووج و دەکرێت(وێنەی٧٨). سەرەکەی، وەکو ئەوەی پێشوو، بەکاریتە و شەقرە و خۆڵ و نایلۆن دەگیرێت. کەرستەکان، بە خۆڕایی یان بە نرخێکی هەرزان یان لەم لا و ئەو لا یان لە تێکدانی خانووێکی لەشکری عێراق، دەست دەکەوێت. خانووی لە بلۆک و خشت، جگە لە بلۆکەکان، جیاوازی دیکەی لەگەڵ خانووی لە قوڕ نییە.

**٤. خانووی چیمەنتۆ و بلۆک**

بە گوێرەی، چەشنی سەربانەکەی، دوو جۆرە

**ء. سەربان چیمەنتۆڕێژ**

دیوارەکانی لە بلۆک دەکرێت و سەرەکەی چیمەنتۆڕێژ کراوە. کەرستەکان، ڕێکخراوە خێرخوازییەکانی مەسحییەکانی ئەوروپی بە خۆڕایی بە خەڵکییان داوە یان لە بازاڕ کڕاوە یان دەوڵەت خانووەکانی کردووە و بە خەڵک دراوە.

خانووی چیمەنتۆ و بلۆک(وێنەی٧٩)، دوای ڕاپەڕین و ئاوەدان کردنەوەی گوندەکان، لە شوێنی جوداجودا، پەیدابوو. بە نموونە، گشت خانووەکانی میراوە و کۆلکێ لە بلۆک کراون.

هـەوای ئـەو خـانووانـە، لـە چـاو هـی خـانووی لـە قـوڕ و خشـت، لـەبـەر ئـەوەی کـەرستـەکـانـی بیناسـازی، زوو گـەرم دەبـن و زووش سـارد دەبنـەوە، لـە وەرزەکـانـی سـاڵدا، یـەک هـەوا نییـە. هاوینـان گـەرم و زسـتان سـاردە. خـەڵکی، بـۆ خۆشـکردنی هـەوای خانووەکانییـان، لـە هاوینـدا پـەنا بـۆ موبـەردە و سـپلێت و لـە زستـاندا بـۆ سـۆپەی نـەفتـی و سـۆپەیدار وسـپلێت دەبـەن.

**ب. سەربان خۆڵەبان**

سەربانـی ئـەو خانووانـە، لـەبـەر ئـەوەی خاوەنـەکانییان یـان ئـەوەتـە بـە پێویستـی نازانن یان ئـەوەتـە دەستیان ناڕوات، وەکو خـانووی قـوڕ و خشـت بـە کاریتـە و شـەقرە و خۆڵـەبان دەکرێت و نـایلۆنـی شینـی بۆ ئـەوەی تووشی کێشـەی دڵۆپـە نـەبێت، لـەسـەر رادەخـەن و کیسـەی پڕ زیـخ یـا بـەردی، بـۆ ئـەوەی بـا هـەڵـی نـەگرێت، لـەسـەری دادەنـێن(وێنـەی ٨٠). ئـەم خـانووانـە، جگـە لـەسـەر بـانـەکانییان، جیـاوازی دیکـەی لـەگـەڵ خـانووی سـەر چیمـەنتـۆڕیژ نییـە.

**٥. ڕەشماڵ(کوین)**

کۆچـەرەکان، بـە تایبـەتی ئـەوانـەی سـاڵـێ بـە دوازدەی مـانـگ بـە دوای گیاوگۆڵ لـە شوێنیک بـۆ شـوێنیکی دیکـە دێـن و دەچـن، ژیـانـی رۆژانـەیان، بگـرە لـە دانیشـتن و نووسـتن و نـانخواردن و چێشـت لێنـان و خـۆ لـەبـەر گـەرما و سـەرما گرتن و مێـوان بـە ڕێکـردن، لـە ژێـر ڕەشـماڵ دەگـوزەرێنن. واتـە کـەلوپـەلێکی یـەکجار، بۆ ڕەوەندان پێویستـە.

ڕەشـماڵـەکانـی ڕەوەنـدان، لـەبـەر ئـەوەی هـی تـازەیـان لـێ دروسـت ناکرێت، بـەشێکییان ئـەوانـەن کـە دەیـان سـاڵ بـەر لـە ئـەورۆ بـە دەسـتـی ژنـانـی ڕەوەنـدان لـە هەوارگـەیێکی زسـتانـی(گـەرمییان) یـان هـاوینـی(کوێسـتان)، چنـدراوە. لـەبـەر هەنـدێ تـەختـەکانـی لێـرە و لـەوێ کونییان تێبووە و بـە گوشـی نـایلۆنـی ڕەنـگ سپی، پینـەکراوە. ڕەوەنـدەکان، لـە جیـاتـی ئـەوەی ڕەشـمـاڵـی تـازە دروسـت بکـەن، کۆنـەی لـە وانـەی دەستییان لـە ڕەوەندایـەتی هەڵگرتووە، دەکرنـەوە. بۆ نموونـە، ڕەوەنـدێکی

خۆشناو ڕەشماڵەکەی بە ١٨٠ هەزار دینار لە هەرکییەک کڕیوەتەوە.

گەورە و گچکەی ڕەشماڵ، دەوەستێتە سەر سەرخێزان. ڕەشماڵی دەوڵەمەند و بە منداڵ، بە دوو ستوون، لە هی ئەوانی دیکە، گەورەترە. ڕەشماڵ، ئەوانەی من لە شوێنی جوداجودا دیتومن، دوو ئەندازە ـ پێنج ستوونی و سێ ستوونی ـ بوون. ڕەشماڵ (وێنەی ٨١) لەو پارچانە پێکهاتووە:

*تەختە ـ لە موو دەچیندرێت. درێژیەکەی دە مەتر (چل تاکو چل و دوو پێ) و پانییەکەی پەنجا سانتیمەترە (دوو پێ). تەختەکان هاوتەریب، بە بەنموو و شوژن، لێک دووروراون.

*ستوون ـ لە داری سپیندار ئامادە دەکرێت. درێژی دوو مەتر و پەنجا سانتیمەترە. ئەستووری پازدە سانتیمەترە. ڕەشماڵی گەورە پێنج و هی گچکە سێ ستوونی هەیە. مەودای ستوونێک و ستوونێکی دیکە یەک مەتر و پەنجا سانتیمەترە. ستوون، بۆ ئەوەی ڕەشماڵی بە پێوە ڕابگرێت، دەدرێتە بەرێ. هەر ستوونێک لە کونێکی بە قفری لە موو دروستکراو، دەچێتە دەرێ.

*چیغ ـ لە قەمیش دروست دەکرێت. هەیانە پێنج مەتر و هەشیانە سێ مەتر درێژە. بەرزاییەکەی یەک مەتر و پەنجا سانتیمەترە. چیغ دەوری ڕەشماڵی پێ دەگیرێت. ڕوونتر بۆ ڕەشماڵ دیوارە.

**٥. چادر (خەیمە)**

بەکارهێنانی چادر لە شوێنی ڕەشماڵدا، چڵ ساڵێک بەر لە ئەوڕۆ دەستی پێکردووە. فاکتەرەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سوکی و دەست کەوتنی، لە کاتی پێویستدا، لە بازاردا بە نرخێکی هەرزانتر لە رەشماڵدا. هەندێ مەڕدار، ساڵێ نۆ مانگ لە چادر دەژێت (وێنەی ٨٢). هەندێ رەوەندیش، چادرێکی لە تەنیشت رەشماڵ، بۆ میوان هەڵداوە.

**٦. کەپر**

مەبەست لە کەپر، شوێنی تێداژیان بۆ چەند مانگێک لە ساڵدا. کەپر لە ستوون و چیغ و حەسیر و چڕۆ و گوش و مەتریالی دیکە دروست دەکرێت. چەشنەکانی کەپر ئەمانەن:

چیغدار -ڕەوەندەکانی نیمچە شاخاویەکان، لە حوزەیرانەوە تاکو تشرینی یەکەم، لەبەر ئەوەی هەوای ناو ڕەشماڵ لە ئەنجامی بەرزبوونی پلەی گەرما ناخۆش دەبێت، لە ناو کەپران دەژین. من لێرە باسی ئەو کەپرەی دەکەم کە ڕەوەندێک (فرحان قادر احمد) لە سەر رووباری بەستۆڕە و لە خوار چوارڕیانی دەربەندی گۆمەسپان، دروستی کردبوو(وێنەی٨٣).

مانگی حوزەیران(٣ حوزەیران ٢٠١٠)، شوێنی کەپرەکەی لە بەرد و دڕک پاککردووتەوە و تەختیکردووە. شازدە کۆرەگە(دوو گوێ) ی لەسەر شێوەی لاکێش(٦ مەتر + ٢٠مەتر) حەوت کۆرەگە لە ناوەڕاستدا و نۆش لە دەرەوە. بە دوری چوار مەتر لە یەکتر لە عەردی راکردوون و بە خرە بەرد و تلیشە بەرد قایمی کردوون.

کۆرەگەکان پردیان(کاریتەی درێژە بنەکەی لە ناو دوولقێکە و سەرەکەشی لە ناو دوولقەکەی تەنیشتیتی ) خراوەتە سەر. پاشان شەقرەیان(لقی دار بی یان دار بەڕوو بە درێژی دوو بۆ سێ مەتر و دە سانتیمەترێک ئەستوور) خراوەتە سەر. ئینجا بە چرو سەریان داپۆشیووە. بە چیغ (بەرزی ١٦٠ سانتیمەتر و درێژی ٥ مەتر) دەوری کۆرەگەکان گیراوە.

کەپر بە ناوبڕەیەکی چیغ کراوە بە دوو بەشی جودا بە رووپێو و وەزیفەی رۆژانە. گەورەکەیان کە دەکەوێتە دەستە چەپ (چوار کۆرەگە) بۆ دانیشتنی پیاوان و مێوانان تەرخان کراوە. لێرە رایەخ (لباد. نیمدەر. ئیسفەنج. مافور. کۆمبار) ڕاخراوە. لەسەر هەر ڕایەخەکی یەک دوو بالیف(سەرین. پشتێنە) داندراوە. شتی دیکەی لێ دانادرێت. بچووکەکەیان کە دەکەوێتە دەستە ڕاست (سێ کۆرەگە) بۆ دانیشتنی ژن و منداڵان جوداکراوەتەوە. لێرە ستێڕک(هەرزارە. شوقەلێت) بۆ لەسەر دانانی پێخەف بە قەدکراوی و کولین(وێنەی٨٤) لە سوچی دەستە ڕاست بۆ دانانی جامی ماست و مەنجەڵی شیر و هیزە بۆ هەڵگرتنی مەیرە و هیربار بۆ چێشت تێ لێنان و ئاگردان بۆ چێشت لێنان و فلینە بۆ ئاوی سارد داندراوە.

کەپر یەک دەرکەی هەیە. ئەویش، بۆ ئەوەی ڕێگە لە بای شەماڵ نەگریت و تیرۆژیش لەژوورەوە نەدات، ڕوویان لە باکوور کردوە. مرۆڤ بەو دەرکەی هاتوچۆ دەکات.

چرودار- کەرستەی کەپری چرودار بریتییە لە داربی و چروی دار بەڕوو. چوارداری دووگوێ دوومەتر درێژ و بیست سانتیمەتر ئەستوور لە عەردی دەچەقێندرێن و بە بەردی قایم دەکرێن. چوارداری دیکە دوومەتر بۆ سێ مەتر درێژ و بیست سانتیمەتر ئەستوور، دەخرێنە سەر دارە دوو گوێەکان. داری باریکتر لەم سەر بۆ ئەم سەر دەخرینە سەر ئەو دارانەی دوایی. پاشان سەری کەپرەکەی بە چرو دادەپۆشرێت. نێوان دوو گوێەکان، بۆ سێبەر، بە چرو یان حەسیر دەگیرێت. کەپری چرودار، بە زۆری لە ناو شینایی و باخچان، وەکو قۆناغ دروست دەکرێت.

گوشدار- دوو لقی داربێ، یەک دوو مەتر بەرز و پازدە سانتیمەترێک ئەستوور لە عەردی دەچەقێندرێت و بە بەردی قایم دەکرێت. پارچە جانگەکی گەورە یان دوو سێ گوشی لیک دوورواو، دوو سەری بە دارەکان دەبەسترێتەوە و دوو سەرەکەی دیکە لە سنگی دار یان دوو گاشە بەرد دەخرێت. کەپری گوشدار، بە زۆری لە ناو بێستانی گندۆرە و تەرۆزی و لە هاوینان دروست دەکرێت.

#### ژێربابەتی ٣. خانووکردن

خانوو، پێش ئەوەی بۆ حەوانەوە بشێت و لە هەر شوێنێک بێت، چوار قۆناغی هەیە.

#### بناغە لێدان

بە قوڵایی پەنجا و پانی چل سانتیمەتر لێدەدرێت. ئینجا بە هورتکەبەرد یان گاشەبەرد پڕدەکریتەوە. هەندێ کەس لە شوێنی قوڕ، بۆ ئەوەی قایم بێت،کۆنکریتی بەسەر دادەکات. دوای یەک دوو ڕۆژ دیواری لەسەر دەکرێت.

**دیوارکردن**

بۆ ئەوەی دەرز نەبات و نەتەپێت، بە خشت و بەرد و بلۆک و قوڕ و چیمەنتۆ، لەسەر بناغە دەکرێت. کاتی دیوارکردن ڕەچاوی ئاووهەوا و شوێنی جوگرافی دەکرێت. بە نموونە لە نێوچەشاخاوییەکاندا، لە ترسی نزمی پلەی گەرما و باران و بەفر لە دوو مەتر کەمترە و تاکو مەترێکێش ئەستوور دەبێت. لە دەشتاییەکاندا، لەبەر بەرزی پلەی گەرما و کەمی باران و نەبوونی بەفر، لە دوو مەتر زیاترە و نیو مەترێکیش ئەستوور دەبێت.

دیوار- بۆ قایم بوون و لەبەر یەک نەترازان، داری دوو سێ مەتر درێژ داوێنەی دیوار و دیواری لەسەر دەکەن. داردانان، وەکو لە کاری پراکتیکی بۆم دەرکەوتووە، هەر لە نێوچە شاخاوییەکان ماوەتەوە.

دیوار ـ لەو شوێنانەی لە خشت و قوڕ کراوە، بۆ ئەوەی باران لێی نەدات و نەخوسێتەوە و ئاو راینەماڵێت، سواندەی لەدار و قوڕ بۆ دەکەن یان پلێتی تەنەگەی لەسەر دادەنێن.

**مارنجکردن**

چیمەنتۆ لە عەرد و گێچ لە مەنجەڵ دەگیرێتەوە. پێش ڕەقبوون و پەیت بوون، مارنجی ئاسنی لێ دەدرێت و لە دیوار هەڵدەسوێت. ئینجا بە ماڵنجی دار، ئەگەر چیمەنتۆ بێت و بە ماڵنجی ئاسن ئەگەر گێچ بێت، لوس دەکرێت.

**کەفماڵ**

قوڕ لە عەردی دەگیرێتەوە و بۆ ئەوەی باش بخوسێتەوە، شەوورۆژێک کەمتر زیاتر لە شوێنی خۆی دەستی لێنادرێت. ڕۆژی دوایی بە تەختەقوڕ یان عارەبانەی دەستی بۆ شوێنی مەبەست دەبردرێت. ئینجا لەپ لە قوڕەکە دەدرێت و لە دیوار هەڵدەسوێت یان بانی پێ سواخ دەدرێت.

کەفماڵ ـ ژن و پیاو، هەر دووکییان پێکەوە یان هەر یەکە و بۆ خۆی، دەیکات. وەلێ ژنان،لەبەر ئەوەی زیاتر ئارەزووی پاک و خاوێنی دەکەن، کەفماڵی ناو ماڵەکان دەکەن.

**سەرگرتن**

کاریتە و شەقرە و قامیش و حەسیر و گڵ، یەک بە دوای یەک، بۆ سەرگرتن، دەهاویشترێتە خانووان. خانووسەرگرتن، لە شوێنێک بۆ شوێنێکی دیکە، کەمێک جیاوازی هەیە. بۆ روونکردنەوە باس لە هی چەند شوێنان دەکەم.

**تۆبزاوە**

سەری یەک لە خانووەکانی ئەو گوندەی کاکەییان لە ناحیەی داقووق بەو شێوە سەری گیرابوو.

* شێلمان ـ پێنج دانە شێلمان مەشکانی و بەقەدەر یەک لێک دوور هاویشترابوونە سەر دیواری پێش و پاشی خانووەکە.

* هەنگڵاین ـ چەند دانەیەک بە درێژی لەسەر شێلمانەکان داندرابوون.

* قامیش ـ بە سفتی لەم سەر بۆ ئەو سەر ریزکرابوون و بە بەن لێک جەلەکرابوو.

* حەسیر ـ کە لە پەلکی دارخورما (خوص) چندراوە، لەسەر قامیشەکان، لەسەر پشت، ڕاخرابوو.

* گڵەبان ـ گڵ لەسەر حەسیرەکە ڕووکرابوو.

* سواغ ـ بە قوڕێکی کەمێک شل سەری گڵەبانەکە سواغ درابوو.

**کانی عەبدی**

سەری یەک لە خانووەکانی ئەو گوندەی ئێزیدییان لە ناحیەی سەنتەری شنگاڵ بەو شێوە سەری گیرابوو.

* مەند (کاریتە) ـ بنە ئەسپینداریکی پازدە سانتیمەترێک ئەستوورە و سێ مەترێک درێژ مەشکانی خرابووە سەر دیواری پێش و پاش. نێوان مەندەکان، بۆ ئەوەی بانەکە سک نەدات، پانی خشتێکی مەشکانی (بیست سانتیمەتر) بوو.

* قیتک ـ لقە ئەسپینداریکی دوو مەترێک درێژ و هەشت سانتیمەترێک

ئەستوورە. بۆ ئەوەی حەسیر و قەسەر و قوڕ نەکەونە خوارەوە و مار و دووپشک و مشک لە ژوورەکە بە دوور بن، بە پڕی لەسەر کاریتەکان درێژ کرابوو.

* حەسیر ـ لە قامیش دروست دەکرێت. دوو مەترێک درێژ و مەترێک پانە. لە سەر قیتک، پڕ بە بانەکە، ڕاخرابوو.

* پەچەک ــ باسکی وشکبووی گەنم یان جۆیە. لەسەر حەسیر، بە ئەستورایی دە سانتیمەترێک، پەرت کرابوو.

* قوڕ ـ پەیت بە قەسەر لە سەر پەچەکە پەرت کرابوو.

* سواغ ـ بە قوڕێکی مەیلەو شلی کا تێکراو، سواغ کرابوو.

**سێناوە**

سەری یەک لە خانووەکانی ئەو گوندەی سورچییان لە ناحیەی خەلیفان بەو شێوە سەری گیرابوو.

* داریخانوو(کاریتە. دارهۆدە) ـ چەند بنە دار ئەسپیندار بە درێژی سێ مەترێک و پازدە سانتیمەترێک ئەستوور لەسەر دیواری پێش و پاش ڕێزکرا بوو. نێوانی داریخانووەکان بیست سانتیمەترێک دەبوو.

* لەوەن ـ لە قەمیش دەچێت. لەسەر داریخانوو لە تەنیشت یەک و پڕ بە هۆدەکە ریز کرابوو.

* دارقسپ ـ لەسەر لەوەن بە شاشی داندرابوو.

* کواشک ـ پەلکە چروی وشک بوو لەسەر قسپ پەرت کرابوو.

* خۆڵەبان ـ خۆڵی لەسەر کواشک پەرت کرابوو و بە شەوڵەپان پەسترابۆوە.

**ژێربابەتی ٣. پلانی خانووبەرە**

خانووبەرە، لە رووی پلانەوە واتە رووپێو و ژمارەی نهۆم و ئۆدە و هەیوان و حەوشە و بەرزی دیوار و دەرکە و پەنجەرە و ناندین و سەرشۆر و ئاودەست، لە نێوچەیەک بۆ نێوچەیێک و لە گوند بۆ شار جیاوازە. پلانەکانی خانووبەرە ئەمانەن.

**ترادیسیۆنی**

پلانی ناوبراو،لە گەڵ ئەو هەموو گۆڕانکاریانەی بەسەر باری ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی ژیانی کوردەوە، لەو چەند ساڵەی دوای، هاتووە گۆڕانێکی ئەو تۆی بە خۆوە نەبینیوە بۆ باسکردن بشێت.

پلانی خانووبەرەی ترادیسیۆنی، چۆن لە ڕابردوودا ئەوهاش لە ئێستادا، پابەندە بە دەست ڕۆیی و چەشنی ئاووهەوا و شوێنی جوگرافی. پلانی خانووبەرە، لەسەر ئەو بنەمایانە، دەکرێ بە دوو بەش.

**١. نێوچە شاخاوییەکان**

خانووەکانی نێوچە شاخاویەکان، لە ڕووی نهۆمەوە، دوو جۆرن.

**ء. یەک نهۆمی**

خانووی یەک نهۆمی، بە زۆری لەو شوێنانە بەدی دەکرێت کە زەوی تەختاییان کەم نەبێت. پلانی خانووی یەک نهۆمی چەندی پێت خۆش بێت ئاسایی و جۆراوجۆرن. باسی پلانی دوو خانووان لە دوو گوندان، وەکو نموونە، دەکەم.

**ڕەشەکەڵ**

گوندێکە لە ناحیەی سەنتەری قەزای چۆمان. پلانی یەک لە خانووەکانی بەو شێوە بوو(هێلکاری٣)

* ژووری خەوتن ـ دوو ژووری وەکو یەک پان(سێ مەتر) و درێژ (حەوت مەتر) و بەرز( دوو مەتر)ە. هەر یەکەو، بۆ ڕۆناکی، یەک پەنجەرەی بۆ لە دیواری پێشەوە بۆ کراوە. جگە لە نووستن، جێگەی دانیشتن و خواردن و خواردنەوە و مێوانە. هەر بۆیە، سۆپەی بۆ گەرمکردنەوە لە وەرزی زستاندا و پانکە بۆ فێنککردنەوە لە وەرزی هاویندا، لێدانراوە و بە ساپیتە وەکراوە.

* نانڎین ــ پانی دوو مەتر و درێژی سێ مەتر و بەرزی دوو مەترە. دەرکەیێکی، بۆ دووکەڵ دەرچوون، گەورەی بۆ کراوە. چێشتی نیمەڕۆیان و نانی حەفتانەی لێدەکرێت. ئەو ژوورە لە بەر دەرکەی ژووری نووستن کراوە.

* ئاودەستخانە- ژوورێکی مەترێک پان و مەترێک و نیو درێژ و دوو مەتر بەرزە. دەرکەی، بە رووی ناندین، بۆکراوە.

**ب. دوو نهۆمی**

چەشنی چالاکی ئابووری وەکو کشتوکاڵ و مەڕداری و گەورە و بچووکی خێزان و رووپێوی زەوی تەختایی چەند فاکتەری ئەو جیاوازییانەن کە لە ژمارەی نهۆم و پلانی خانووەکانی ئەو نێوچە جوگرافیا بە دی دەکرێت. پلانی خانووی دوو نهۆمی، وەکو هی یەک نهۆمی، چەندی ئارەزوو بکەیت ئاسایی و هەمە چەشنەن. باسی خانووبەرە لە چەند گوندان، بە مەبەستی روونکردنەوە، دەکەم.

**کۆیلێ**

یەکێکە لە گوندەکانی ناحیەی قەسرێ سەر بە قەزای چۆمان لە ئەستانی هەولێردا. شوێنەیکەی لە بناری قەندیلە و دانیشتوانەکەی هاوینان، لەبەر ئەوەی خەڵک بۆ شینایی کردن و دەغڵ چاندن و باخچە دەگەڕێتەوە، ئاوەدانە. زستانان، لە بەر نزمی پلەی گەرما و بێکاری و هەبوونی خانوو لە شوێنی دیکە و خۆ نەگرتن، چۆل دەکرێت. پلانی ئەو خانووەی کە دوو شەو، لای خاوەنەکەی مێوان بووم، بەو شێوە بوو(هێلکاری ٤)

ئەو خانووە لە قوڕ و خشت و کاریتە و شەقرە دروستکراوە. روو بەرەو باشوورە. پشتی لە خانووەکانی سەرووی خۆیتی. جادەی گوندی بە پشتی گوزەر دەکات. دوو نهۆمییە. پێشەکەی، بۆ رێگە لە حەیوانی کێوی گرتن و ئەم لا و ئەو لا، پەرژین کراوە. دەرکەی حەوشە خراوەتە دەستە چەپ.

**نهۆمی یەکەم**

نهۆمی ژێرەوەی ئەو خانووە لە سێ ژوور، جودا بە رووپێو و بە کارهێنان، پیکهاتووە. ژوورەکانی بێ پەنجەرە و دەلاقەن. دیواری ژوورەکانی، بۆ ئەوەی نهۆمی دووەم رابگرێت، نزیکەی مەترێک بەرین کراون. هەروەها ئەوانەی پشتەوە لەبەر ئەوەی بە عەردی وەنووساوە، ڕاست نین. لەو نهۆمە سێ ژوور دروستکراوە:

**هۆڕی ڕەشەوڵاغ**

شوێنی داکردنی ڕەشەوڵاغە لە شەوان و ڕۆژانی بە بەفر و باران. کۆریتیش، بۆ چنەکردنی جۆی لە دەمی ڕەشەوڵاغ کەوتوو، لە ناو یان لەبەر دەرکەی گەوەڕ دروستکراوە.

**کادین**

شوێنی داکردنی کایە. کەوتووتە نێوان گەوەڕ و عەنبار. کونێک لە بانەکەی، بۆ کا تێکردن، کراوە. کونەکە دوای تەواوبوونی کا بە پارچە پلێتەک یان پارچە چەپەرێک ، تاکو ساڵی ئاینده، دەگیرێت. کا، لە دەرکەی کادین، بە چارۆگ یان سەبەتە یان تەنەگە، دەردەهێندرێت و لە ئاخوڕان دەکرێت.

**عەنبار**

شوێنی هەڵگرتنی کەرستەی جۆتکردن و دروێنەی و کوتان و ڕەز و باخچە و بێستان و شتی دیکەی لەو بابەتانەیە.

**نهۆمی دووەم**

نهۆمی سەرەوەی ئەو خانووە لە نان‌دین و دوو ژووری نووستن و ژوورێکی دانیشتن و هەیوانێک پێکهاتوور. ژوورەکان پەنجەرەی(١٠٠سم x ٧٠ سم) ئاسنی جام تێگیراویان هاوشترایتیٚ. دیوارەکان، لەبەر ئەوەی لەسەر بانی نهۆمی یەکەم دروستکراوە، خواروخێچ نین و بە قوڕ مارنج کراون. ژوورەکان ئەمانەن.

**ژووری خەوتن** - دوو ژووری خەوتنی(٧م x ٤م) ڕووبەڕوو هەیە. ئەوەی دەستەڕاست هی دایک و باوکە ئەوەی دەستەچەپیش هی کچەکانە. شوێنی کوڕەکانیش بە زۆری لە ژووری دانیشتن دایە. ژوورەکان، جگە لە خەوتن، شوێنی کانتۆڕ و هەڵواسین و گۆڕین جل و بەرگ و شتی دیکەی لەو بابەتانەیە.

**ژووری دانیشتن** - شوێنی نانخواردن و دانیشتن و هەندیٚ کەرەت نووستنی، بە تایبەتی لە وەرزی زستاندا، خێزان و مێوانە. لە نێوان هەردوو ژووری

خەوتندایە. دەرکەکەی کەمێک لە دەرکەی ژوورەکانی دیکە گەورەترە و کەمێکیش(٧م x ٣م) لە وان بچووکترە.

**هەیوان (تارمە) ـ** بۆشاییێکی گەورە(٧م x ٦م) یە لە پێش ژوورەکانی نووستن و دانیشتنیندا. لە ڕاستیدا بانی هەر سێ ژووری نهۆمی یەکەمە.

پێشەکەی، بۆ نانخواردن و نووستن لە هاویندا و بۆ با لێدان و تەماشاکردنی سروشت، والا هێشتراوەتەوە. لای دەستەچەپی دیواری دەستەڕاستی خانووی تەنیشتییە. لای دەستەڕاستیشی دیواری دەستەچەپی ناندینە. سەرەکەی بە دار و چرو گیراوە.

**ناندین ـ** شوێنی نانکردن(بە تایبەتی لە وەرزی سەرماوسوڕدا) و سەرشۆر و زەخیرەیە. رووی دەرکە، کە لە پلێتێکی تەنک بۆی کراوە و لە چوارچیوەێکی ئاسن گیراوە، بە پێچەوانەی ژوورەکانی دیکە، لە باکوورە. پەنجەرەییێکی بچووکی بۆ لە دیواری پشتەوە کراوە. بۆشاییێک بە قەدەر مەترێک لە نێوان ناندین و یەکەم ژووری نووستن، بۆ هاتوو چۆکردن هەیە.

**سەرشۆر ـ** شوێنێک لە ناندین، بە قەدەر سێ مەتر چوارگۆشە، لە قولنچکی دەستەڕاست چیمەنتۆ رێژکراوە. کونێک، بۆ ئەوەی ئاوی بۆ دەرەوە پێ دابڕوات، لە دیوارکراوە و سولاوکەی تێگیراوە.

**ئاودەستخانە ـ** ئەمەیان لە خانووەکەدا نییە. ژن و پیاو، لە کانی ژنان و کانی پیاوان، دەست بەئاو دەگەینن. دەست بەئاو گەیاندنی سوکیش لە بندارەکان و پشت پەرژینەکان دەکرێت.

### ٢. نێوچە دەشتاییەکان

جیاوازێکی زۆر لە رووپێو و کەرستە و ژمارەی نهۆم و پلانی خانووبەرە لەو نێوچە جوگرافیادا بە دی دەکرێت. جیاوازیشی لەگەڵ خانووبەرەی نێوچەی شاخاوی، بە تایبەتی لە ژمارەی نهۆم و کەرستەی دروستکردن کەم نییە. باسی خانووبەرە لە چەند گوندێک، بە مەبەستی روونکردنەوە، دەکەم.

**کانی عەبدی**

یەکێکە لە گوندەکانی ناحیەی سەنتەر قەزای شنگاڵ. شوێنەیکەی تەختاییە. لە شارۆچکەی شنگاڵ دە پازدە کیلۆمەتر دوورە. سەرجەم دانیشتوانەکەی کوردی ئێزیدین و، کاروپیشەیان مەڕداری و فەلاحەتییە. یەک لە خانووەکانی ئەو گوندە، کە سەرم پێ داگرت، بەو شێوە بوو (هێلکاری ٥)

**دکان** ـ ژوورێکە لە بنەبانێ بە پانی سێ مەتر و درێژی پێنج مەتر و بەرزی دوو مەتر. دەرکەی لە ئیواندایە. پەنجەرەیکی، بۆ رۆناکی، روو لە حەوشەی پشتەوە، بۆکراوە. ئەو ژوورە، لەبەر ئەوەی شوێنی نووستنە، کانتۆڕی نوینانی لێ داندراوە.

**ئیوان** ـ ژوورێکە، بە هەمان پانی و درێژی و بەرزی، لە نێوان دکان و پێبلقەدا. سێ دەرکەی، یەکەکیان لە حەوشەوە بۆ هاتنە ژوورەوە و یەکێکی بۆ پێبلقە و ئەویتری بۆ دکان، بۆ کراوە. پەنجەرەیکی، بۆ رۆناکی، روو لە حەوشەی پشتەوە، بۆ کراوە. ئەو ژوورە، لەبەر ئەوەی شوێنی دانیشتن و میوانە، رایەخی لێ راخراوە.

**پێبلقە** ـ لە نێوان ئیوان و نان‌دین. بۆ ئەوەی ئاوی باران و دز و بیانی لەسەربانەوە بۆ ناو ژوورەکان نێن، دروستکراوە. پانی مەترێک و بەرزییەکەی بەقەدەر بەرزی ئیوان دەبێت. چوونە سەربان و هاتن خوار، بەو پێبلقە دەکرێت.

**ناندین** ـ ژوورێکە، بە پانی دوو مەتر و درێژی پێنج مەتر و و بەرزی دوو مەتر. دوو دەرکەی، یەکەکیان بۆ پێبلقە و ئیوان و ئەوەی دیکە بۆ حەوشەی پێشەوە، بۆ کراوە. پەنجەرەیکی، بۆ رۆناکی و دوکەڵ دەرچوون، روو لە حەوشەی پشتەوەی بۆ کراوە. ناندین، لەبەر ئەوەی شوێنی چاڵینان و چێشتکردنە، تەباخ و قاپوقاچاغی لێ داندراوە.

**تاقە ژوورێک** ـ ژوورێکە، بە پانی سێ مەتر و درێژی پێنج مەتر و بەرزی دوو مەترە. دەرکەی، لەبەر ئەوەی لە حەوشەی پشتەوە کراوە، کەوتووتە حەوشەوە. پەنجەرەیکی، بۆ رۆناکی، لە دیواری پشتەوەی بۆ کراوە.

**حەوشە** ـ دوو حەوشەی، یەک لە پشتەوە(درێژی دە مەتر و پانی شەش مەتر) و یەک لە پێشەوە( درێژی پازدە مەتر و پانی سێ بۆ حەوت مەتر و بەرزی دوو مەترە)، بۆ کراوە.

**تەندوور** ـ دوو تەندوور، بۆ نان و ئەستورک کردن، لە قولنچکی حەوشەی پێشەوە بۆ کراوە.

**ئاودەست و سەرشۆر** ـ دوو پەناگەی بچووک و لە تەنیشت یەکن. دەرکەیان، کە دەروانێتە حەوشەی پێشەوە، بۆ نەکراوە.

**حەوشە** ـ دیوارێکی دوو مەترێک بڵندە. ئەو پەرژینە، بۆ پاڕاستنی سامان و بەرچاوگرتن دروست کراوە. هەندێک خانوو، لەبەر ئەوەی خاوەنەکەی هەست بە ترس ناکات، حەوشەی بۆ ناکات.

**دەرکەی حەوشە** ـ دوو دەرکەی، گەورەکەیان لە حەوشەی پێشەو و بچووکەکەیان لە حەوشەی پشتەوە، بۆ هاتن و چوون، بۆ کراوە.

**بیر** ـ لە حەوشەی پشتەوە و لە تەنیشت تاقەژوورەکە، لێدراوە.

**باخچە** ـ پازدە مەترێکی چوارگۆشە، لە حەوشەی پێشەوە، بۆ سەوزە، دابڕاوە.

**حەواڵە** ـ گشت بانی خانووەکانی ئێزیدییەکان بە مەبەستی بەرچاوگرتن، حەواڵەی لە هەرچوار لاوە، بە قەدەر بەژنی زەلامێکی لە سەر عاردی دانیشتوویان، بۆ کراوە. سێ کون، بۆ بینینی دەوروبەری خانووەکان، لە دیواری دەرەوەی حەواڵەکە کراوە.

**ئەنیشک حەواڵە** ــ هەر چوار قولینچکەکانی ئەنیشک حەواڵە، چل سانتیمەترێک لە دیواری شورەکە بڵندترە.

**ڕەنگی خانوو** ـ ڕەنگی رووی دیواری خانووەکان، لەبەر ئەوەی بە گڵێکی سپی مارنج دەکرێت، سپییەکی تەلخە. بە دەگمەن چاوت بە خانووێکی رەنگ خاکی دەکەویت.

**رووی خانوو** ـ ئێزیدیەکان رووی خانووەکانییان، لەبەر پیرۆزی رۆژ لە ئاینەکەیاندا، لە رۆژێ دەکەن. بە نموونە، خانووەکانی گوندی ئەشکەفتە، بێ دەرهاویشتن، روویان لە رۆژهەڵات کراوە.

خەڵکی گوند، بۆ ئەوەی خانووەکەیان زووتر بۆ تەواو بکرێت و کەمتر پارەی بە نژیار و کرێکار بدات، زبارەی بۆ یەکتر دەکەن. ئەویش نانی نیمەڕۆیان، پڵاو بە گۆشت و مەڕەگە و نان و چاو و میوەیان بۆ ئامادە دەکات.

**تۆبزاوە**

یەکێکە لە گوندەکانی ناحیەی مەرکەز لە قەزای داقوقدا. چەند کیلۆمەترێک لە شارۆچکەی داقوق دوورە. دانیشتوانەکەی کوردی کاکەیین. تۆبزاوە، لەبەر پیرۆزی، شوێنێکی تایبەتی لە ژیانی پەیڕەوانی ئەو ئایینە هەیە. کاروپیشەیان مەڕداری و فەلاحەتی کردنە. یەک لە خانووەکانی ئەو گوندە، کە سەرم پێ داگرت، بەو شێوە بوو(هێلکاری ٦)

**ژووری نووستن** ـ ئەو خانووە، لەبەر ئەوەی کوڕەکان هێشتا ماڵی خۆیان نەکردووە، دوو ژوورە. یەکەکییان، کە هی کوڕەکەیە، لاکێشەییە و بێ هەیوانە و رووبەڕووی دەرکەی حەوشەیە. دووەمییان، کە هی دایک و باوە، لاکێشەییە و دەرکەی لە هەیوانی پێشیتی. هەر یەک لەو ژوورانە، بۆ رۆناکی یەک پەنجەرەی تێدایە.

**ژووری مێوان** ـ ژوورێکی لاکێشەییە. لە ریزی ژووری نووستنی دایک و باوکە. دەرکەی کەوتووتە هەیوانەی پێشی. پەنجەرەی، بۆ رۆناکی، تێکراوە.

**هەیوان** ـ ژوورێکی چوارگۆشەییە لە نێوان ژووری مێوانان و ژووری نووستنی دایک و باوک. دەرکەی هەردوو ژوورەکان لەناو هەیوان دان.

**قەمتەرە** ـ ژوورێکی گەورەیە. دیواری پێشەوەی دەرکەێکی گەورەی، بۆ پێ داهینانە ژوورە و بردنە دەرەوەی ترومبێل تێدا کراوە. دیواری پشتی بۆ نەکراوە.

**ئاودەستخانە** ـ ژوورێکی بچووکە لە قولنچکی دەستەچەپی قەمتەرە کراوە.

**سەرشۆر** ـ ژوورێکە لە نێوان ئاودەستخانە و قەمتەرە.

**حەوشە** ـ پارچە عەردێکی فرەوانە لە ناوەڕاستی ژوورەکاندا.

خانووی ترادیسیۆنی، لە چاو خانووی مۆدێرن، لە هاوینان ساردترە و لە زستانان گەرمترە. هۆکارەکەی بۆ خەسڵەتی قورِ لە خێرایی وەرگرتن و دانەوەی سەرما و گەرما دەگەرِێتەوە.

خانووی ترادیسیۆنی، بەرەبەرە دەروخێندرێن و لە شوێنەیکەی خانووی بە بلۆک و چەمەنتۆ دروست دەکرێتەوە. وەلێ ئەو گۆرِانکاریە بە زۆری لە کۆمەڵگایەکان، بە نموونە کۆمەڵگەی دووگریێ، لەبەر باشبوونی باری ئابووری خەڵک، دەکرێت.

**سەردەمییانە**

مەبەست ئەو خانووانەن کە ژوور و نانندین و سەرشۆر و ئاودەست لە ناو یەکدان و دیوار بە بلۆک و چیمەنتۆ دروستکراوە و سەریان کۆنکریتریژە و دەرکە و پەنجەرە لە دار و ئاسن و پڤس(PVC) و ئەلەمنێۆم ئاسن بۆ کراوە.

پەیدابوونی ئەو پلانە، بۆ سەرەتای راگواستنی دانیشتوانی گوندەکان و هەندێ شارەدێ بۆ ئۆردوگا زۆرەملییەکان و جێ هێشتنییان لە لایەن خەڵکەوە دەگەرِێتەوە.

**ژووری مێوان** ــ ژوورێکە بۆ دانیشتنی ئەو مێوانانەی کە لەگەڵ گشت ئەندامانی خێزان تێکەڵاویان نییە.

**ژووری دانیشتن** ــ ژوورێکە بۆ دانیشتن و هەندێ رۆژ بۆ نانخواردنی ئەندامانی خێزان و کەس و کاریان.

**ژووری نووستن** ــ ژوورێکە یان دوو ژوور بۆ نووستن. دایک و باوک لە یەکەکییان و منداڵەکان لە ئەوەی دییکەیان. وەلێ کچ و کورِی گەورە، بە گوێرەی توانا، لە ژوورێک ناخەون.

**ئاودەستخانە** ــ ژوورێکی بچووکە و بە زۆری لە تەنێشت یان بەرامبەر سەرشۆرە. ئەگەر خێزانکە گەورە بێت یەکێکی دیکە لە قولنچێکی حەوشە دەکەن.

**سەرشۆر**- ژوورێکە بە زۆری لە بەرامبەر ئاودەستخانە کراوە.

**بەیتوونە** - ژوورێکە لەسەربان و لە پێش پێبلقە، بۆ دانانی شتمەکی زیاد، دروستکراوە.

**هەیوان ـ** خانووی دوو نهۆمی، بە دەگمەن نەبێت، هەیوانی بۆ لە پێش ژووری نهۆمی سەرەوە کراوە. سەیر لەوەدایە. ئەو هەیوانانە لەگەڵ ئەو هەموو خەرجییەی بۆی دەکرێت، بە درێژایی تەمەن، لەبەر ئەوەی دانیشت و ڕاوەستان و تەماشاکردن شەرمێکی گەورەیە، بۆ جارێکیش بێت کەس لێی دانانیشێت.

**باخچە ـ** خانووەکانی بەر لە نۆهەتەکان، بە دەگمەن نەبێت، باخچەیان لە حەوشە بۆ کراوە. ئەوانەی دواتر، لەبەر دەست نەڕۆیشتن، لە شوێنی باخچە چەند مەترێک عاردی، بۆ هاتوچۆکردن، بە بەتاڵی هێشتووتەوە. ئەوانەی فێری باخچەن، لەو خانوانە بە زەحمەت ئۆقرە دەگرن.

**گەراج ـ** خانووەکان، ئەوانەی رووبەرەکەیان بە بەریانەوە هەیە، شوێنێکییان لە حەوشە بۆ راگرتنی ترومبێل تێدایە. گەراج، ئەگەر چی راگرتنی ترومبێل لە بەر دەرکەی حەوشە و لە پێش ماڵەوە مەترسی نییە، رۆژ بە رۆژیش، لەبەر کڕینی ترومبێل، پێویستیتر دەبێت.

### ژێربابەتی٤. کەلوپەلی ناو ماڵ

مەبەست گشت ئەو کەلوپەلانەیە کە مرۆڤ لە ژیانی رۆژانەیدا بەکاریان دێنێت. کەلوپەلەکان رۆژ بە رۆژ، لە ئەنجامی پێشکەوتنی تێکنیک و کۆنتاکت بە کولتووری میللەتانی دیکە و بەسەرچوونی زەمان، گۆڕانیان بەسەر دادێت. کەلوپەلی تازە، زۆر بە خێرایی، دەکەویتە بازاڕ ئینجا ماڵان و هی ترادیسیۆنی نامینێت. کەلوپەلی ناو ماڵ بە گوێرەی چەشن و بەکارهێنانیان، ئەمانەی خوارەوەن:

**نووین (پێخەف)**

مەبەست گشت ئەو کەلوپەلانەیە کە مرۆڤ بۆ نووستن پێویستی پێیان دەبێت. نووستن، بە تایبەتی لە وەرزی زستاندا بێ نووین، سەختە و نابێت. نووین، لە ئەوانەی خوارەوە، پێک دێت.

**لێف ـ** لە پەمۆ و سووف وخوری و پۆلستەر دەدورێت. لێفی یەک نەفەری و دوو نەفەری هەیە. لێف، لەبەر پەیدابوونی پێخەفی هاوشێوەی، ئەورۆ لە چاو سی ساڵ لەمەوبەر کەمتر بەکار دەهیندرێت.

**بەتانییە** ـ لە پۆلستەر و سووف دەچندرێت. بەکارهێنانی، لەبەر سووکی، ئەورۆ باوە.
**جاجم (مووچ)** ـ لە خوری دەچندرێت. بەکارهێنانی، لەبەر بەتانییە و لێف، زۆر لەوەی سی ساڵێک بەکار دەهێندار کەمترە.
**دۆشەک** ــ ئەمەیان لە پەمۆ و خوری و سووف و ئیسفەنج دەکرێت. ئیسفەنجەکەیان، ئەگەر چی پشتی ئەزیەت دەدات، لەبەر هەرزانی و سووکی، زۆرتر لە ئەوانی دیکە بەکار دەهیندرێت.
**مافور** ـ مافوری کارگە کە لە خوری و سووف دچندرێت لە هەموو ماڵێک هەیە. ژوورەکان، بە تایبەتی هی مێوانان، مافوری بۆ لەسەر دانیشتن یان بۆ بن پێیان، لێراخراوە.
**لباد** ـ کە لە لوای بەرخ دەکرێت لە ژوورەکان بۆ لەسەر دانیشتن و نووستن راخراوە. بەکارهێنانی، لەبەر مافووری مەکینە و کۆمبار، یەکجار کەم بووە. ئەوانەی بەکاریشی دەینن بەرگی تێدەگرن ئینجا لە سەری دەنوون.
**کۆمبار** ـ ژوورەکان بە گشتی، لەبەر ئەوەی لە رایەخی دیکە هەرزانترە و بە گوێرەی ئەندازەی پێویست دەست دەکەوێت و بە ئاسانی رادەخرێت و هەڵدەگیرێت، کۆمباریان لێ راخستراوە.
**جۆدەلی** ــ بۆ لەسەر دانیشتن یان لەسەر نووستن لە سەر کۆمبار رادەخرێت. ئەمەیان لە پەمۆ دەکرێت.

فۆرمی هەموو ئەوانەی باسکران، کومبار نەبێت. لاکێشەییە. پانی هەشتا سانتیمەتر و درێژی سەد و هەشتا سانتیمەترێک دەبێت.
**بالیف (سەرین)** ـ لە تووکی مریشک و قاز و مراوی و سۆنە و عەلەشیش و پەمۆ و خوری و سووف و ئیسفەنج دەکرێت. دوو جۆرهی هەیە.
ء. لاکێشەیی ـ پانی سی سانتیمەتر و درێژی شێست سانتیمەترە کاتی نووستن سەر و کاتی دانیشتن هەنیشکی دەخرێتەسەر. هەندێ جار، بۆ ئەوەی پشت بە دیوار نەکەوێت، لە نێوان پشت و دیوار دادەندرێت.
ب. خڕ ــ بۆ هەمان مەبەستی ئەوەی سەرەوە بەکار دەهێندرێت.

فۆرمەکەی جۆنییانییە و ئەمسەر و ئەوسەری، بۆ ئەوەی وێک بێتەوە، دەکرێت بە پزی (سەرخوز) و بەن یان لاستێک تێهەڵدەکێشرێرت.

**هیربار(قاپوقاچاغ)**

مەبەست گشت ئەو کەلوپەلانەیە کە بۆ لێنانی خواردن و خواردن تێکردن و پێخواردن و هەڵگرتن و ئاوتێکردن و ئاوخواردنەوە رۆژانە بە کار دێت. لە خوارەوە باسی هەندێ هیربار دەکەم.

**مەنجەڵ (قەزان)** ـ چێشت تێلێنان و ئاوتێکردن و تێهەڵگرتن و تێگەرمکردن و تێکولاندن، لە مەنجەڵی بە قەبارە گەورە و بچووک ئەنجام دەدرێت. مەنجەڵ لە فافۆن و تیفال و ستیل و مس دروست دەکرێت. جۆرەکانی مەنجەڵ ئەمانەن: مەنجەڵی چێشتی. مەنجەڵی ئاوگەرمکردن. مەنچەڵی ساواری.

**مڵاک**ـ خواردن لە دەمکردن و ئاو بە دەمکردن و لە قاپ و فەخفوری کردن بە مڵاک دەکرێت. مڵاک لە فافۆن و ستیل و پلاستیک و دار دروست دەکرێت. دوو جۆرە مڵاک لە ناندینەکاندا هەیە.

ء. مڵاکی قوڵ ــ بۆ ئەوەی پەیتە و شلەی پێ هەڵبگریت، کەمێک درێژووکانی هێلکەیین. هەندێک لە جۆرەکانی ئەمانەن ـ مڵاکی چا. مڵاکی شەکر. مڵاکی چێشت خواردن. مڵاکی چێشت تێکردن(ئەسکۆ). مڵاکی دۆ. مڵاکی ماستاو.

ب. مڵاکی پەل ـ خڕی پانە و ناوەکەی کونکونە. بۆ پەیتە لە قاپ کردن بەکاردەهیندرێت. جۆرەکانی: کەوگیر.

**قاپ و فەخفوری** ــ پەلەکانییان بۆ پەیتە و قوڵەکانییان بۆ شلە بەکار دەهیندرێن. ئەوانە لە فافۆن و ستیل و گڵی سوورکراوە دروست دەکرێن

**چەقۆ (کێرد)** ــ بڕین و پارچەکردن و کوزکردن و لەتکردن و سپیکردن و شەقکردن بە چەقۆ دەکرێت. جۆرەکانی چەقۆ ئەمانەن: ئاسایی و قەڵەمبڕ.

**ساتوور**ـ پارچەکردن و هوردکردن بە ساتوور دەکرێت.

**کەندو(کەنو)** ـ ئارد و برنج، لە گوندان، لە ترسی مشک و تۆز،لە کەندوو دەکرێت. دوو جۆر کەندوو هەیە.

ء. کەندوی تەنەگە ـ فۆرمێکی لوولەیی هەیە. بەرزی مەترێک و کەمەڕە پەنجا سانتیمەتر دەبێت (وێنەی ٨٥). سەرەکەی، بۆ تێکردن و دەرهێنانی ئارد، والایە. بە قەپاغ سەری دەگیرێت.

ب. کەندوی گڵ ـ فۆرمێکی لاکێشی بە پانی پەنجا سانتیمەتر و بەرزی مەترێک و سی سانتیمەترێک هەیە (وێنەی ٨٦). سەرەکەی بە قەپاغ دەگیرێت. کونێکی، بۆ دەست تێڕاکردن و ئارد دەرهێنان، لە تەنیشت بۆ کراوە. پەرۆکێکی تێ دەئاخەندرێت. ئەمەیان، لەبەر تەندوری تەنەگە و کەرستەی نایلۆن، رەنگە بەکار نەهیندرێت.

**تاخمی چا**

بریتییە لە کتلی و چاپەست و پیاڵە ـ بنپیاڵە و سەماوار و قوتی شەکر وقوتی تۆچا و کۆتەک و تەپشووی قەند و سنی پیاڵە وتازی پیالان. ئەو کەرستانە لە فافۆن و ستیل و دار و فەخفوری دروست دەکرێت.

**ئامرازی بیستن و تەماشاکردن**

مەبەست رادیۆ و موسەجلە و مۆبایل و تەلەفزیۆنە. ئەورۆ، ماڵ نییە، با لە سەنتەری شارەکانیش دوور بێت، دوو سێیانێکی لە مانە لە ماڵەوە نەبێت و ناوناوە تازەیان نەکاتەوە.

# سەربابەتی پنجەم

## خواردن و خواردنەوە

نانـدینی کـوردی، لــە پـەنجا سـاڵی بۆڕیـدا، لــە ئـەنجامی کۆمـەڵێک فاکتەری ئـابووری و کۆمەڵایـەتی و سیاسـی وەکـو پێشوەچوونـی تێکنیک و ڕاگوسـتن و ئاشـنابوون بــە کولتـووری بیـانـی بــە تایبــەتی ئــەوروپی و زیـادبوونی دەرامــەتی سـالانە لــە ئــەنجامی نــەفت فرۆشـتن و هــاتنی نـەتـەوەی دیکە بۆ کـارکردن لـە باشووریی کوردستاندا، گـۆڕانـی بـەرچاوی لە رووی جۆرەوە و چەشنەوە بە خۆی بینیووە. هەندێک لە خەسڵەتەکانی خۆراک و خواردنـەوە ئەوانـەی خوارەوەن.

ـ هەندێ خواردن، وەکو، نـانـی بـەروو. تـەرەساز. لۆلکـە . پیرخـەنی. نـان و پیاز. نان و دۆ لـەناوچوون و هەندێکی تازەی وەکو فەلافل و پیتزە و لحم بعجین و کۆرڤ(نقنق. سۆسچ. باسترمە) و هەمبرگـەر و بـابۆڵـە (لـەفـە) ی فەلافل و گـەس پەیدابوون.

ــ منـداڵ و هــەرزەکارەکان لــە جیـاتی دۆڵمــە و کفتــە و سـاوار ئـارەزووی پـەتاتـەی سۆرکراو و بـابۆڵـەی گۆشت و مریشک و فـەلافل دەکـەن.

ــ ژەمـی بـەیانییان، کـە جـاران بـەیانیان زوو بـوو . ئـەوڕۆ تـاکو درەنـگ نـاخورێت. ژەمی نیمەڕۆیان لـە دوازەی نیمـەڕۆ بـو بـە دووی پاشنیمـەڕۆ. ژەمی ئێواران کەم دەخورێت.

ــ خواردنــەوەی خۆشـاوی کیمیـاوی لــە جیـاتی خۆشـاوی سروشـتی و دۆی خۆماڵی.

### ژێربابەتی ١. خواردن

مـەبـەست گشت ئـەو خواردنانـەیە کـە لـە هـەوێر و دانـەوێلـە و سـەوزە و شیر یان هەر شتێکی دیکەی لـەو بـابـەتانـەوە ئامادە دەکرێت.

**ء. خواردن لە هەویر**

مەبەست گشت ئەو خواردنانەیە کە لە هەوێر، دوای برژاندن یان کوڵاند یان لە روون سوۆرکردنەوە، دروست دەکرێت. هەندێک لە خواردنەکان ئەوانەی خوارەوەن.

**. نان**

یەکێکە لە خواردنە هەرە گرنگەکانی رۆژانەی کورد. خواردنی نان لەگەڵ چێشت یەکێکە لە بەرچاوترین سیمای خواردن لە ناو کورددا. ئەوانەی نانی لەگەڵ هەر سێ ژەم ناخۆن رەنگە لە دەوری پێنج لەسەدی سەرجەمی کورد تێ پەڕ نەکات. هەر لەبەر ئەوەشە خەرجی و کاتێکی زۆری بۆ فەراهەمکردنی گەرەکە.

نانکردن لە مالآن دیاردەیێکی کۆنە لە گوند و شارەکاندا. ژن، لەبەر ئەوەی پیاو بە هیچ شێوەییێک دەست بۆ نانکردن نابات، ئیش و کارەکانی نانکردن دەکات. هەندێ ژن، لەبەر ئەوەی خانەوادەکەی(بە نموونە خیزانێک لە گوندی شێخ لەنگەر) داوای نانی گەرم دەکات، هەموو بەیانییان نان دەکات. هەندێ ژنی دیکە، لەبەر خەرێک بوونی بە ئیش لە دەرەوەی ماڵدا (فەرمانبەر. مامۆستا. خزمەتکار) حەفتەی رۆژێک نانی یەک حەفتە دەکات.

نان لە ئاردی گەنم یان جۆ، سێ ساڵێک لەمەو بەر ئاردی مزاش (گەنم و جۆی تێکەڵ) یش ، دەکرێت .

ئارد لەگەڵ ئاوی مەیلەو شلتێن( بۆ ئەوەی زوو هەڵبێت) و خوێ بە قەدەر پێویست و هەویر ترش (خومرە) لە تەشتی هەویر یان هەر شتێکی دیکەی لەو بابەتەوە دەکرێت. پاشان دەست بە تێکدان و سەروبن کردن دەکرێت. ئینجا تاکو ئاو و ئارد لە ناو یەک بە تەواوی حەل دەبێت دەشێلدرێت. هەویر بە دەستی پیاوان و ژنان و لە مالآن و دوکانان خواردنی جۆراوجۆری لێ دەکرێت. هەندێکییان ئەمانەن.

**چەشنەکانی نان**

نان بە گوێرەی شێوەی برژاندن و تەنک و ئەستووری و ماوەی نانکردن چەند جۆرە.

ء. **نانی تیری**ـ ئەمەیان خڕ و پانە. کەمەڕەکەی شێست سانتیمەترە و ئەستووریەکەی دوو ملیمەترە. نانی تیری، کە بە زۆری لە نێوچەی دەشتایی دەکرێت، بۆ ئەوەی بکرێت بە پاروو، چەند خولەکێک پێش خواردن لە سەر سەبەتەی نانی یان لە پەڕۆکی نانی دەرشێندرێت.

ئەو ژنانەی بۆ خۆیان نانیان بۆ ناکرێت، بیست و پێنج هەزار دینار و تەنەگە ئاردێک و بای نانەکە نەفت بە نانکەری مالان دەدەن. ئەویش لە بەیانییەوە تاکو نزیک رۆژئاوابوون خەریکی نانکردن دەبێت.

ب. **نانی مادە (هەورامی)** ـ ئەمەیان وەکو نانی تیری، خڕ و پانە. بە قەدەر ئەمیش گەورە و ئەستوورە. نانی مادە، لەبەر ئەوەی نەرمە، پێش خواردن نارشێندرێت. درنگتریش لە نانی تیری خراپ دەبێت.

**. ئەستورک**

ئەمەیان سی سالێک دەبێت، زیاتر لە نان لەسەر سفرە، بە تایبەتی لە شارەکاندا، دادەندرێت. هەندێک لە چەشنەکانی ئەستورک ئەمانەن.

ء. ئەستورکی مالان ـ ژنان رۆژانە یان حەفتەی دوو کەرەت بە تەندووری ناو حەوشە یان ئەوەی دەرەوەی حەوشە ئەستورک دەکەن.

ئەستورکی مالان خڕە و پانە. کەمەڕەکەی سی و پێنج سانتیمەتر و ئەستورییەکەی دوو سانتیمەترە. ژن بە تەندووری گڵ یان کانزایی دەیبرژێنیت. ئەستورک مالان، چەندی گەرمتر بێت، ئەوەندە بەتامترە.

ب. ئەستورکی نانەواخانان(نانی فرنی) ـ رۆژانە، هەر لە بەیانیانەوە تاکو پاش نیمەڕۆیان سێ پیاو لە نانەواخانەکانییان نانی پێوەدەن. لە هەندێ شوێندا، بە نموونە یەکێک لە نانەواخانەکانی سەنگەسەر کە خۆم بینیوومە، دوو ژن و پیاوێک ئەو کارەیان دەکرد.

ئەستورکی نانەواخانان، وەکو هی مالان، خڕ و پانە. کەمەڕەی

تاکەکەیان(سەد و سی گرام) بیست و پێنج سانتیمەترە و  دوو سانتیمەتر ئەستوورە. کەمەرەی دەبڵەکەیان( دوو سەد و شێست گرام) سی و پێنج سانتیمەترە و دوو سانتیمەتر ئەستوورە.

**- کولێرە بە روون**

ئەمەیان، وەکو ئەستورک، خڕ و پانە. کەمەرە بیست و پێنج سانتیمەترە و  دوو سانتیمەتر ئەستوورە. رووێکی ئەنگوتکەکە لە کونجی دەدرێت. دوای پانکردنەوە بە روون چەور دەکرێت و دەخرێتە سەر کەرەک و بۆ ناو تەندوور درێژ دەکرێت. بە هەمان شێوە، دوای برژان، بۆ دەرەوە رادەکێشرێت.

**- سەموون**

مێژووی پەیدابوونی سەموون لە لیستی خواردندا، بۆ ساڵانی پەنجا لە سەدەی بیستەمدا دەگەڕێتەوە. بە نموونە، سەمونخانەیەکی ئۆتۆماتیکی لە سەرەتایی شەستەکانی سەدەی بیستەم لە گەرەکی تەعجیل داندرا. وەلێ ئەوەندەی نەبرد، لەبەر گرفتی تەکنیکی لەکار کەوت و جارێکی دیکە نەکەوتەوە کارکردن. سەموون بە گوێرەی شێوازی برژاندن دوو جۆرە:

ء. حەجەری ـ نانێکی لاکێشی بیست و سێ سانتیمەتر درێژ و دەش پانە. ئەنگوتک، دوای ئەوەی  لەسەر شێوەی سەموون پان دەکرتەوە دەخرێتە ناو تەختەی دار و لە پێش نانبرێژ دادەندرێت. ئەوێش یەک بەیەک هەڵیاندەگرێت و دەیخاتە سەر کەرەک و بۆ ناو تەندوور درێژی دەکات.

ب. کارەبایی ـ نانێکی شێوە جودایە. هەیانە خڕ و پان و هەشیانە جۆنییانیە. ئەنگوتک، دوای پانکردنەوە دەخرێتە ناو سێنی و لە پێش نانبرژێنەر دادەندرێت. ئەویش بە سێنییەوە، بۆ برژاندن لە فرنی کارەبایی  داوێت.

**. ناوساجی**

ئەمەیان خڕ و پانە. کەمەرە بیست سانتیمەتر و ئەستوری دوو سانتیمەترە. شلاوی هەویر، بە ئەسکۆ، لە مەقری سەر ئاگر دەکرێت.

مەقرییەکە، بۆ ئەوەی شلاوەکەی پێوەنەنووسێ، کەمێک بە زەیت یان روون چەور دەکرێت.

**. پاقلاوە وکولیچە**

ئەمەیان لە دوکانان بە کاکڵە گوێز و خورما یان هەر هەویری رووت پڕ بە سنی ئامادە دەکرێت و بە شێوە و قەوارەی جودا دەبڕدرێتەوە و دەخرێتە فرنی کارەبایی بۆ برژاندن. پاشان بە کیلۆ بۆ فرۆشتن دەخرێتە بەر چاوان. نرخی یەک کیلۆ پاقلاوەی بە گوێز دوو ئەوەندەی بێ گوێزە هەمان شت بە گوێزەی کولیچە وایە. ئەورۆ دەیان دوکانی پاقلاوە فرۆشی لە شارەکاندا کار دەکەن. لەساڵی دووهەزار و هەشت و بە دواوە چەند پاقلاوەچی بیانی بە نموونە ئێرانی و تورکی(بەیزادە لەسەر شەقامی ئیسکان ـ ٢٠١٠) و سوری و و عێراقی و لوبنانی دوکانیان کردووتەوە.

پاقلاوە و کولێچە، چێژنان و رەمەزانان و هەندێ جار لە شاییان و پرسان و بە خێری مردووان، لە ماڵان ئامادە دەکرێت و لە فرنییانی سەر شەقامەکان دەبرژێندرێت.

**ئامرازەکانی خواردنکردن لە هەویر**

ئامرازەکانی، لەبەر ئەوەی خواردنەکان زۆرن و وەک یەک نین، جۆراوجۆرن. هەندێک لە ئامرازەکان لە نیو خواردنەکاندا هاوبەشە هەندێ دیکە هەر یەک خواردنی پێ دەکرێت. ئێمە لێرە هەر باسی ئامرازەکانی نان برژاندن، لەبەر ئەوەی رۆژانە بەکار دێت، دەکەین.

**تەشتی هەویری** ـ ئامرازێکی خڕ و پانی لێوادارە. گەورە و بچووکی هەیە. لێوارەکەی، بۆ ئەوەی ئارد و ئاو و خوێ نەرژێت، دە سانتیمەترێک بەرزە.

**تیـرۆگ** ـ دارێکی درێژی حەفتا سانتیمەترێک درێژ و دوو سانتیمەرێک ئەستوورە. ئەنگوتکی پێ لەسەر فەرشە پاندەکرێتەوە و بۆ سەر سێر پێ هەڵدەگیرێت.

**ناوبرێشک** ـ دارێکی پانی درێژی شێست سانتیمەتر و دوو سانتیمەتر ئەستوورە. سەرەکەی، بۆ ئەوەی بە ئاسانی لە ژێر نان رابچێت، کەمێک خڕە. دەسکەکەی، بۆ گرتن و نەخزین، خۆشکراوە.

**فەرشــە (پنــە)ــ** تەختــەیێکی داری پــانی خــرە و کەمەرەکــەی شێســت سانتیمەترێک و ئەستوریەکەی سێ سانتیمەترێک دەبێت. تەختەکە لە سەر سێ پێچکەی بە بەرزی بیست سانتیمەرێک و ئەستووری هەشت سانتیمەترێک دەبێت. جگە لە رەنگی سپی، رەنگی دیکەی نییە.

**کەور ـ** پارچە قوماشێکی چوارگۆشەی بە زۆری رەنگ سپییە. لە ژێر فەرشە، بۆ ئەوەی ئارد نەکەویتە سەر عەردی، رادەخرێت.

**سێر (ساج) ـ** تەختە پلیتێکی روو چاڵە و دەخرێتە سەر سێ کوچکەی بەرد یان قوڕ و ئاگری لە ژێرەوە بۆ نانەهەویر برژاندن دەکرێتەوە.

**شیشــی ئــاگری ــ** شیشــێکی پــەنجا ســانتیمەتر درێــژ و دوو ســانتیمەتر ئەستوورە. ئاگری ژێر سێری پێ تێک دەدرێت.

## ب. خواردن لە دانەوێڵە

مەبەست گشت ئەو خواردنانەیە کە لە دانەوێڵە وەکو گەنم و برنج و نیسک و نۆک و ماش و هاوشێوەکانییان لێدەندرێت. هەر یەک لەوانە، خواردنی جۆراوجۆری بە شێوەی پەیت یان شل لێ ئامادە دەکرێت.

**گەنم( ساوار)**

گەنمی رەشگوڵ ئەو جارانەی نەبێت سۆرگوڵی دنک گەورە و ئاو، بۆ کولاندن، لە مەنجەڵی ساوار دەکرێت. ئاگر، تاکو گەنمەکە نەرم دەبێت، لە ژێر مانجەڵەکە دەکرێتەوە. پاشان، بۆ وشکبوون، لەسەر پارچە قوماشێک لەبەر رۆژی بە تەنکی پەرت دەکرێت. ناوەناوە، بۆ ئەوەی هەموو ساوارەکە وەکو یەک وشکبێتەوە، هەڵگێڕ وەرگێڕ دەکرێت.

**ساوارکوتان**

ئەمەیان بە دوو شێوە، دەکوترێت،

**شـێوەی ترادیسـیۆنی ـ** قۆرتێک بە قۆڵایی سی سانتیمەترێک لە حەوشە لێدەدرێت. بە قوڕ سواغ دەدرێت. جاجم و شتی دیکەی لەو بابەتەوە لە دەوری قۆرتەکە رادەخرێت. ئێوارەکەی، ژنان ساواریان لە تەشتان کەمێک تەڕ دەکرد و هەڵگێڕ ورگێڕیان دەکرد و لە قۆرتێیان دەکرد.

گەنجان، بە کوتکی دار، ساوارەکەیان دەکوتا تاکو پەڵکەکەی بەردەدا. بەو شێوە پرۆسەکە دووبارە دەکرایەوە تاکو ساوارەکە تەواو دەبوو. ئێوارەی ساوار کوتان، بۆ گەنجان، لەبەر ئەوەی بەسەر یاری خۆیان هەڵدەگوت و توانای خۆیان دەردەخست، ئێوارەی خۆشی و شادی بوو.

ساوارکوتان بە شێوەی ترادیسیۆنی، لەبەر کەمبوونی خەڵک لە گوندان و پەیدابوونی مەکینەی ئاگری و بێجێیی لە شارەکان و هاوردەی ساوار، ماوە وەلێ زۆر کەم بۆتەوە.

**شێوەی مۆدێرن** ـ ساوارەکە بە ساغی، بۆ پەڵکۆ کردن، دوای ئەوەی کەمێک ئاوی پێدادەکرێت و تێک دەدرێت و لە مەکینەیەک بە ناوی هەباشە دەکرێت(وێنەی٨٧). پاشان، بۆ کوتان لە مەکینەیێکی دیکە دەکرێت. ئینجا، بۆ جیاکردنەوەی کەپەک و ساوار، لە بێژنگ دەدرێت. دنکە درشتەکان لە مەکینە دەکرێتەوە. پرۆسەکە بەو شێوە دووبارە دەکرێتەوە تاکو تەواو دەبێت.

ساواری کوتراو، بە گویرەی درشت و هوردی دەنکەکانی، سێ (درشت ـ ساوار. ناوەنجی ـ برِوش. هورد ـ پیرخەنی) جۆرە. هەر یەکەیان بۆ چەند خواردنێک دەشێت.

**چێشت لە ساوار**

ئەمەیان تاکو کۆتایی شەستەکانی سەدەی بیست خواردنی سەرەکی رۆژانەی خەڵک بوو. چێشتی ئێوارانی چوار پێنج رۆژانی حەفتە ساوار بوو. ساوار، لەبەر قورِسی لە هەرسکردندا، باوی جارانی نەماوە. ئەورِۆ، هەندێک ماڵ مانگێک یان دوو مانگ لێی دەنێن هی واش هەیە بە یەکجاری وازیان لێ هێناوە . ساوار چێشتی جۆراوجۆری لێ ئامادە دەکرێت. هەندێکییان ئەمانەن:

پڵاوساوار. ساواری سۆر. شلە ساوار. ساوار بە تەماتە. ساوار بە تۆڵکە. ساوار بە کەنگر. ساوار بە گۆشت. ساوار بە جەرگوناو و هیدیکە.

**چیشت لە بڕوش(بڕوێش)**

ئەمەیان چێشتی جۆراوجۆری لێ ئامادە دەکرێت. وەلێ لە ساوار کەمتر. هەندێکییان ئەمانەن: کفتە. کوبەی ساواری. یاپراغی بڕوش.

**چیشت لە پیرخەنی**

ئەمەیان بە دەگمەن نەبێت ناکرێت بە چێشت. هەندێ کەس بۆ گەورەکردنی جوجکەی پەلەوەر، پەرپۆڕەی لێ دەکات.

**برنج**

ئەمەیان لە سەرەتایی حەفتاکانی سەدی بیستەمدا، هاتووتە پایەیی یەکەم لە مینۆی خواردندا. ئەگەر جاران جێژنە و جێژنە لێ بندرابوایە یان لە پێش مێوانێکی خۆشەویست دابنرایە یان لە شایێک بە خەڵک بدرابوایە ئەوە ئەورۆ، ئەگەر هەر حەوت ژەمی نیمەڕۆیان برنج نەبێت یان لەگەڵ خواردنێکی دیکە لەسەر سفرە دانەندرێت، پێنجیان برنجە. خواردنی جۆراوجۆر لە برنج دەکرێت. بە نموونە، برنجی سۆر. برنج بەشیر. پڵاو برنج. عروق. کوبەی برنج.

**نیسک**

یەکێک لەو خواردنانەی کە لە نیسک و ئاو و خوێ و زەیت و بیبەری کوتراو و پیازی سوارکراوە و هەڕشتە لێدەندرێت ـ نیسکێنەیە. خواردنی دیکەم نەبیستووە.

**نۆک**

ئەمەیان بە چەند جۆر دەخورێت.

**نۆکی کوڵاو**ـ نۆک و ئاو و خوێ لە مەنجەڵێکدا بەسەر دەندرێت. پاش کوڵانی نۆکەکە دەپارزندرێت. نۆکەکە و ئاوەکە لە مەنجەڵان دەکرێت. بەیانییان، لەگەڵ نانی گەرم، دەخورێت.

نۆک فرۆشەکان، تاکو کۆتایی شەستەکانی سەدەی بیست، نۆکی کوڵاویان، بۆ ئەوەی سارد نەبێتەوە، لە کیسەی چاوپانیان دەکرد و گەرمیان دادەپۆشت. بەیانییان، لە سەبەتەیێکی شوورکدا، لە کۆڵانان دەیانگێڕاو. بە دەنگێکی بەرز گاسییان(بانگییان) دەکرد: لۆبیای گەرم. گەرمە لۆبیا.

**نۆکاو**- نۆک و ئاو و خوێ و بیبەر و پیاز و لولە(هێسکی لاقی رەشەوڵاغ بۆ تام خۆشکردن) لە مەنجەڵدا، تاکو هەموو شتەکان شیلە دەدەنەوە، بەسەر ئاگر دەندرێت.

**فەلافل** - نۆک و ئاو و خوێ لە مەنجەڵدا، تاکو نۆکەکە دەتوڵێتەوە، بەسەر ئاگر دەندرێت. پاشان دەپارزندرێت. نۆکەکە دەهەنجرێت و بە مڵاک لە قالبی فەلافل دەکرێت. ئینجا لە ناو روونی قرچاو، تاکو سوور دەبێتەوە، بەتاڵ دەکرێت.

مێژووی پەیدابوونی فەلافل بۆ هەشتاکانی سەدەی بیستەم دەگەڕێتەوە واتە بۆ ئەو کاتەی ژمارەیێک لە کرێکاری مسری، بە مەبەستی سیاسی و ئیشکردن لە شوێنی کرێکاری خۆماڵی لە باشووریی کوردستان نیشتە جێکران.

**ماش و برنج (پلاڤ ماش)** ـ ماش و برنج، تاکو لیچق بوون، لە ئاودا دەکوڵێندرێن. رۆن و پیازی سورکراوەیان تێدەکرێت. ئینجا، بۆ ئەوەی هەموویان لەناو یەک حەلبن، لە مەنجەڵیکدا بەسەر ئاگر دەندرێن.

**ئامرازەکانی لێنانی خواردن لە دانەوێڵە**

دانەوێڵە بۆ ئەوەی بخورێت و بە ئاسانی هەرس بکرێت، پێویستی بە ئامراز و هیرباری جۆراوجۆر هەیە. هەندێکییان ئەمانەن:

**پرێمز**- دوو جۆرە پرێمز هەیە، کە هەر یەکەیان بۆ ئامادەکردنی خواردنی جودا بەکار دەهیندرێن.

ء. پرێمزی چێشتلێنان ـ ئەمەیان دەیان ساڵە لە ماڵان، بۆ چێشتلێنان بەکار دێت. وەلێ، لەبەر دەنگ و پەیدابوونی تەباخ، ئەورۆ کەم بەکار دێت.

ب. پرێمزی نانی - پەیدابوونی ئەو ئامرزاە بۆ حەفتاکانی سەدەی بیستەم دەگەڕێتەوە. ئەو کاتەی کە دانیشتوانی گشت گوندەکان بە ناحەق بۆ ئۆردوگاکان گواسترانەوە. لە شوێنی تازە، لەبەر نەبوونی دارودور بۆ ئاگر، پرێمزی نانی بەکار هات.

**تەباخ** ـ چەند جۆرە تەباخ بۆ ئامادەکردنی خواردن لە ماڵان و لە

چێشتخانان هەیە. سەرەتا تەباخی نەفتی ئنجا تەباخی کارەبایی دوا بە دوای ئەوانە غازی پەیدا بوو. ئەورۆ، ناندین لە گوند و شار نییە یەک لەو تەباخانەی لێ دانەندرابێت.

**چەقۆ (کێرد)** ـ سەوزە هوردکردن و میوە کەرتکردن و حەیوان سەربڕین و گۆشت پارچەپارچەکردن لە ناندینەکانی ماڵان و چێشتخانان بە چەقۆی جۆراوجۆر دەکرێت.

**قاپ** ـ خواردنی پەیتە لە قاپی پەل و هی شلە لە قاپی قوڵ بۆ خواردن لە پێش مرۆڤ دادەندرێت. ناندینی ماڵان و چێشتخانان دەیان قاپی جۆراوجۆری لە فافۆن و نیکل و فەخفورییان تێدایە. هەر خواردنێک، بە تایبەتی لە چێشتخانەکان لە قاپی جودا لەسەر مێز دادەندرێت.

**ملاک (کەوچک)** ـ خواردن لە مەنجەڵ تێکدان و لە قاپکردن و لە دەوکردن، بە کەوگیر و ئەسکۆ و ملاکی چێشت دەکرێت. ناندینی ماڵان و چێشتخانان دەیان ملاکی جۆراوجۆری لە فافۆن و نیکلیان تێدایە.

ملاکی دار، چی ئەوانەی دۆمەکان و چی ئەوانەی ئەزیزییەکانی هەورامان، تاکو سەرەتایی شەستەکانی سەدەی بیستەم، بۆ دۆ و ماستاو خواردنەوە و بۆ چێشتخواردن لە ماڵان باوبوو. ئەورۆ، ملاکی دار لەگەڵ کۆتکی دار، وەکو ئامرازێکی فۆلکلۆری، لە ماڵان و مۆزەخانان و ئەنتێکخانان بەرچاوخراون.

**مەقلی** ـ سوورکردنەوەی پیاز و گۆشت و کوبەی ساوار و کوبەی برنج و پەتاتە و هێلکە و رۆن، لە مەقلی دەکرێت. ناندینی ماڵان و چێشتخانان دەیان مەقلی جۆراوجۆری لە فافۆن و نیکل و تیفالیان تێدایە.

**مەنجەڵ** ـ چێشتلێنان و گەرمکردنەوەی چێشت لە مەنجەڵ دەکرێت. ناندینی ماڵان و چێشتخانان چەند مەنجەڵی گەورە و ناوەنجی و بچووکی جۆراوجۆری لە فافۆن و نیکل و تیفالیان تێدایە. دوو جۆرە مەنجەڵ ـ ئاسایی و هەڵمی ـ هەیە.

هەندێ کەرستەی دیکەی پێلێنان و تێلێنان و پێخواردن ، کە هەبوونیان لە ناندینی ماڵان و چێشتخانان پێویستن ئەمانەن: بیبەردان.

خوێدان. چیلکی ددان. ساتوور. سیخی گۆشت. شیشی کەباب. قیمەکێش. مەورەد.

**پ. خواردن لە سەوزە**

مەبەست گشت ئەو خواردنانەیە کە لە پەلک و سەلک و قەدی رووەکی بە مەبەستی خواردن چێندراو لێدەندرێت. ئیجا کاڵ یان کوڵاو یان زەردکراو بێت. ئەو چێشتانەیە، بۆ ئەوەی تێرت بکات، لەگەڵ چێشتی لە دانەوێڵە دەخورێت. سەوزە، بە زۆری شلەی لێدەکرێت. بە نموونە، ئەوانەی خوارەوە:

**شلەی بامیە** ــ کەرستەکانی: بامیە. ئاو. ئاوی تەماتە. پەراسوی حەیوان (ئەگەر هەبێت). خوێ (بە مانا). زەیت. سیر (چەند دنکێک بۆ تام خۆشکردن). خواردنێکی یەکجار باوە. حەفتەی جارێک دوو جار لێدەندرێت.

**شلەی باینجان** ـ کەرستەکانی: باینجان. ئاو. ئاوی تەماتە. خوێ (بە مانا). پیازی هوردکراو. زەیت. هەمووی بۆ کولاندن لە مەنجەڵ دەکرێت و دەخرێتە سەر ئاگر.

**شلەی پەتاتە** ـ کەرستەکانی: پەتاتە. ئاو. ئاوی تەماتە. خوێ (بە مانا). هەمووی لە مەنجەڵ دەکرێت و دەخرێتە سەر ئاگر.

خواردنی پەتاتە بە شلەیی و سوورکردنەوە لە رووندا، لە مێژ نییە. لە شەستەکانی سەدەی بیستەمدا، کە تازە پەیدابوو، خەڵک بە بێزەوە دەیانکرد بە مەڕەگە و هەندێ کەس، بۆ خواردنی خۆی، چەند کیلۆ پاتەی لە بن عەردی دەنا. ئەورۆ، ئەگەر خواردنێکی رۆژانە نەبێت، حەفتەی یەک دوو جەم دەخورێت.

**شلەی کودی (کودو)** ــ کەرستەکانی: کودی (ی دۆڵمە. زەرد). ئاو. ئاوی تەماتە. خوێ (بە مانا). زەیت. هەمووی، بۆ ئەوەی بوکڵێت، لە مەنجەڵێکدا، لەسەر ئاگری تەباخ یان ئاگردان دادەندرێت.

**شلەی فاسولیا** ــ کەرستەکانی: فاسولیای تەڕ. فاسولیای وشک (پێش لەسەرنان لە ئاوێ دەکرێت). ئاو. ئاوی تەماتە. خوێ (بە مانا). زەیت. هەمووی لە مەنجەڵ دەکرێت و دەخرێتە سەر ئاگر.

**تەماتە ـ** جگە لەوەی بە خاوی دەخورێت، لەگەڵ چەندین سەوزەی دیکە دەکوڵێندرێت و خواردنی لێدەکرێت. بە نموونە، مەرەگەی بامیە. مەرەگەی باینجان. مەرەگەی کودو. پیازاو. تەماتە و رۆن. و هیدیکە.
**بەلەچەکی کودی ـ** کودی زەرد (کودی هێسک. کودی شامی) قاشقاش دەکرێت. قاشەکان لە لینجاوی دۆشاو دەکوڵێندرێن. چەندی بکوڵێندرێت، ئەوەندە زیاتر شیلەکەی دەداتەوە و چەندی شێلەش زیاتر بداتەوە ئەوەندە دۆشاوەکە بە لەزەتر دەبێت.

**ت. خواردن لە گیایی سروشتی**

ئەوانەی خوارەوە، هەندێک لەو خواردنانەن کە مرۆڤ لە گییا خۆرسکەکانی وەرزی بەهار دەستی دەکەوێت. هەندێکییان بە خاوی دەخورێن. هەندێکی دیکەیان، بۆ ئەوەی بخورێن، دەبی بکوڵندرێت.
**تۆڵکە(تۆرکە) ـ** لە ئاوێدا دەکوڵێندرێت و لەگەڵ رۆن سوور دەکرێتەوە یان لەسەر پشتی سێڕێ دەبرژێندرێت یان ورد دەکرێت و لەگەڵ ساوار(شلە ساوار بە تۆڵکە) تێکەڵ دەکرێت.
تۆڵکە تاکو سەرەتایی نۆهەتەکانی سەدەی بیستەم تەنیا لە وەرزی بەهار پەیدا دەبوو. ئەورۆ، لەبەر ئەوەی وەکو سەوزە لە باخچەکان دەچیندرێت، لە بازاڕ نابڕێت.
**کاردی (کاردوو) ـ** لە ئاوێدا دەکوڵێندڕیت و لەگەڵ گەنمەکوتا و کشمیش و سماقاو و خوێ و زەیت تێکەڵ دەکرێت و دەخرێتە سەر ئاگر. بە ناوی کاردی بە ترش دەخورێت.
**کوارگ (کارگ. قارچک) ـ** هورد دەکرێت و لەگەڵ زەیت و خوێ لە مەنجەڵ دەکرێت و دەخرێتە سەر ئاگر. بە ناوی کوارگی کوڵێندراو دەخورێت.
کوارگ تاکو نۆهەتەکانی سەدەی بیستەم، لە وەرزی بەهاران نەبووایە، لەسەر سفرەی خواردن نە دەبیندرا. ئەورۆ، لەبەر ئەوەی لە دەرەوە دەهاوردرێت و لە خانووی نایلۆنبەند دەچیندرێت لە بازاڕ نابڕێت.

جۆرەکانی کوارگ لە گوندی سێناوە ئەمانەن: بزن. بەراز(ژەهراویە ناخورێت) سۆتانی. گویشک. گیا. مەڕ. هەوێز.

**کەنگر(کنگر)** ـ سپی دەکرێت و دڕکی سەری و قونکی بە چەقۆ دەبڕێت و لە ئاوێ دەکوڵێندرێت. لە رۆن سۆردەکرێتەوە یان لەگەڵ ساوار و رۆن و خوی و ئاو دەخرێتە سەر ئاگر. بە ناوی کەنگری زەردکراو یان ساوار بە کەنگر دەخورێت. هەندێ جار لە هێلکەی شلقاوی هەڵدەینن و لە رۆن سۆری دەکەنەوە. بە ناوی کەنگر کەباب دەخورێت.

**ج. خواردن لە میوە**

ئەوانەی خوارەوە، هەندێک لەو خواردنانەن، کە لە بەری دارمیوەکان دەکرێن یان وشک دەکرێنەوە.

**دۆشاوی ترێ**

ئەمەیان، بە دوو شێوە، دەکرێت.

ء. **حەوزــ** دەوری تاشە بەردێکی گەورە بە قوڕ دەگیرێت. کونێکی لە ژێرەوە بۆ دەهێڵنەوە. سولاوکەیێکی بچووک(سولک بە بادینی) لە پەلکی دارئەسپیندار لە کونەکەی قایم دەکەن. مەنجەڵێکی گەورە لەبەر دەمی سولاوکەکە دادەنێن.

وشییە ترێیەکان، دوای شووشتنەوە، داوێنەی ناو قۆرتەکە. یەک دوو پیاو، پاش پێ شووشتن، دەچنە ناو قۆرتەکە و بە پێیان دەکەونە سەر ترێیەکە و دەیشێلن. شیلەکە بە کونەکەدا دیتە خوارێ و دەچێتە ناو مەنجەڵەکە. شیلەکەی بەرەبەرە بە جامان لە مەنجەڵێکی دیکە، تاکو پڕ دەبێت، دەکەن. مەنجەڵەکەی هەڵدەگرن و دەیبەن لەسەر کوچکی ئاگری دادەنێن. کارەکە بەو شێوە دووبارە دەبێتەوە تاکو هەموو ترێیەکە تەواو دەبێت. ئینجا کەمێک خۆڵەمێش(کەڵەخۆڵ بە بادینی)، بۆ ئەوەی شیلەکە نەترشێت، لە مەنجەڵەکان دەکرێت. ئاگر، تاکو شیلەکە بە کوڵ دێت و خەست دەبێت، لە بن مەنجەلەکان دەکرێتەوە. پاشان

مەنجەڵەکەی لەسەر کوچکە، بۆ ئەوەی شیلەکە سارد بێتەوە، دەینە خواریێ. هەندێک خۆڵە مێشی دیکەی، بۆ ئەوەی ئەو خۆڵەمیشەی لەگەڵ ترێیەکە کوڵاوە بنیشێت، تێ دەکەن و دەستی لێ نادەن. دوای ساردبوونەوە لە دەبەی پلاستیک دەکرێت.

**ب. کۆل ـ** ترێی شۆردراوە، لە گونییە دەکرێت. گونییەکە دەخرێتە ناو کۆلێکەوە. ترێگوش، دوای ئەوەی قاچەکانی دەشوات، بەسەر گونییەکە دەکەوێت. دەست بە پەستان دەکات. لە ئەنجامی ئەو کارەدا لینجاوێکی سووری مەیلەو پەمبە لە قونکی گونییەکە پەیدا دەبێت و بە سولاوکەی کۆلەکەوە، بۆ ناو تەشتەکەی بەر دەمی سولاوکەکەوە، دێتە خوارێ. دوای پڕبوونی تەشتەکە، بە جامێک، لە مەنجەڵێکی گەورە وەکو هی ساوار یان هی چێشتی شایان و تازیان، دەکرێت.

مەنجەڵی پڕ لە لینجاو، دەخرێتە سەر ئاگردان و ئاگری لە ژێر دەکرێتەوە. دوای بە کوڵهاتنی لینجاوەکە، گڵێکی سپی تایبەت بە دۆشاو تێدەکرێت. لینجاوەکە بە گڵەکەوە دەبێت بە دۆشاو. ئەگینا هەر بە شلی و تفتی و بێتامویۆ و چێژ دەمینێتەوە.

**دۆشاوی توو**

ئەمەیان، وەکو دۆشاوی ترێ، لە دەنکەتوو دەگیرێتەوە. تامی، ئەگەر خۆشتر نەبێت، ناخۆشتر نییە. دۆشاوی توومم لەگەڵ کەرە لە ماڵی مەڕدارێکی گوندی باوە خواردووە.

**سرکە (برمە هەنار)**

دەنگی هەنار، دوای کوتانی هەنار، جاران لە تەشتێک دەکراو و بە پای پەتی دەچوونە ناوی و دەیان توڵخاندەوە. ئەورۆ لە گونییەکی سپی دەکرێت و زارەکەی دەبەسترێت و دەخرێتە مەنجەڵەوە و بە پای پەتی دەشێلردرێت. شیلەکەی، کە رەنگێکی پەمبەیی هەیە، بۆ ئەوەی خەست بێت و رەنگی باینجانی مەیلەو رەش بێت لە مەنجەڵێکدا، دەکوڵێندرێت. گڵی سپی، ئەگەر لە شلەی هەنار بکرێت و بکوڵێندرێت، لە جیاتی ئەوەی شلەکە ببێتە سرکە وەکو شەربەتێکی ترش و شیرینی لێ دێت.

**مرەبایی هەنجیر**

هـەنجیری شـوراوە و شـەکر بـە قـەدەر کێشـی هەنجیرەکـە، بـۆ ئـەوەی لەناو یـەک حـەل بـن و دەنکـە هـەنجیرەکان بـە سـاغی بمینێنـەوە و تێک نـەچن، تاکو بڵقدان، لـە مـەنجەڵ دەندرێتە سـەر ئـاگر. مرەبـایی هـەنجیرم لـە گوندی ناوپردان زۆر خواردوە.

**کەتکە هەنجیر**

هـەنجیری تـەر، بـۆ ئـەوەی وشـک بێتـەوە و بـۆ زسـتان هـەڵبگیرێت، بـە داو(بــەن. حـەسـیر) وەدەکرێـت و لــە بــەر رۆژی بــە سـینگ یــان رسـتـە وەدەکرێت.

**ئەستورکە هەنجیر**

هـەنجیری تـەڕ، بـۆ ئـەوەی وشـک بێتـەوە و بـۆ زسـتان هـەڵبگیرێت، بـە قەدەر ئـەستورکێک پان دەکرێتـەوە و دەخرێتـە سـەر یـەکتر و لـە تـەنیشت یــەک دادەنــدرێت. ئینجــا لـەســەر سـێنی یــان چەپــەر لـەبــەر رۆژی دادەندرێت.

**لەتکە**

ســێو قــاش دەکرێــت و هــەرمی و بــی(بــەهێ) و زەردەلــو و هەروچکـە(هـەلوژە) لـەت دەکرێت. ئینجـا لـەسـەر سینی یـان چەپـەر، بـۆ ئـەوەی وشک بێتـەوە و بۆ زستان هەڵبگیرێت، لـەبەر رۆژ دادەندرێت.

**چ. خواردن لە شیر(سپیاتی)**

باسەکەمان بـە شیر، لـەبـەر ئـەوەی بنـەمای گشت سپیاتییەکانـە، دەست پێدەکەین.

**شیر**

مـەڕدارەکانـی دەوروبــەر یـان نزیکـی شـارەکان، شـیری بـە خـاوی بـە شیرکڕەکانی شـارەکان دەفرۆشن. ئـەوانیش دەیکـەن بـە ماست و پـەنیر و لۆر و بـە ماستفرۆش و خـەڵکی نـاو شـار دەفرۆشن. یـەک کیلـۆ شـیری خـاو پار لـە چەنـد گونـدێک بـەو پـارە(نرخـەکان بـە گـوێرەی وەرز دەگۆڕێت) بـوو:

تەڵەخێمی گەورە - هەشت سەد و پەنجا دینار. جولحان - هەزار و دووسەد و پەنجا دینار. مەڕدارەکان ئارەزووی فرۆشتنی شیر، بە خاوی ناکەن. پێیان باشە شێرەکەی بکەن بە ماست و پەنیر ئینجا بیانفرۆشن. بەو شێوە پارەیان زیاتر بۆ دەکات. بۆ روون کردنەوە دەڵێم: بیست و سێ کیلۆ شیر بیست کیلۆ ماستی تێدەکەویت. ئەگەر یەک کیلۆ شیر بە نۆسەد دینار دابنێین ئەوە نرخێ شیرەکە دەکاتە بیست و یەک هەزار دینار و ئەگەر یەک کیلۆ ماستیش بە دوو هەزار دینار دابنێین ئەوە نرخی ماستەکە دەکاتە چل هەزار دینار. کەوابێت جیاوازیەکە نۆزدە هەزار دینارە.

**ماست**

شیر لە مەنجەڵێک دەخرێتە سەر ئاگردان و ئاگری قشپلی یان دارودوڕی لە ژێر دەکرێتەوە. شیرەکە بەرەبەرە گەرم دەبێت و کەفی دەکات. کە هەڵچوو ئاگرەکەی دەکوژێنەوە. ئینجا بە جامان یان ئەسکۆیان لە مەنجەڵی بچووک - دوو سێ کیلۆیی - دەکرێت. ئینجا هەوێن(یەک مڵاک ماستی دوێنێ) لە گشت مەنجەڵەکان دەکرێت. پاشان بە قوماشێکی سپی سەریان دەگیرێت. ئینجا گەرم،بۆ ئەوەی هەوێن بێت، واتە شیرەکە بمەیێت و ببێتە ماست، دادەپۆشرێت. بەیانی بەتانییەکە یان جاجمەکە یان لێفەکە یان گونیەکەی لەسەر لادەدەن. پەڕۆکێکی سپی بەسەرمەنجەڵەکان دادەدڕێت و بە بەن، بۆ ئەوەی نەرژێت، دەبەسترێت. جامی ماستی، هەندێ جار گیا یان قەرسیل یان تۆڵەکە یان قەسەری لەسەر پەرۆکی مەنجەڵی ماست دادەندرێت، ئینجا دەبەسترێت. ئەوە مەرج نییە، هەر دەم، پەیڕەوی لێ بکرێت. ماست لە شیری مەڕ، لە چاو ماستی لە شیری بزن و چێڵ، پەیتر و چەورترە. هەربۆیەش هەردەم نرخەکەی پێنج سەد بۆ هەزار دینار گرانترە

نرخی یەک کیلۆ ماست، بە گوێرەی وەرز دەگۆڕێت. بە نموونە، بەهاران، لەبەر ئەوەی زۆرە، دادەبزێت. لە زستانان، لەبەر ئەوەی کەمە، هەڵدەستێت. نرخی یەک کیلۆ ماستی مەڕ لە مانگی شوباتی ئەم

ساڵ لە دوکانی ماستفرۆشان دوو هەزار دینارە ـ نرخێکی ستاندار نییە ـ ئەوانیش بە هەزار و پێنج سەد دینار لە مەڕدارەکان وەردەگرن.

**پەنیر**

شیر بە ساردی هەوێنی تێ دەکرێت. هەوێن لە شیلکی ڕەشان دەگیرێتەوە. شیلک دوای وشک کردنەوەی، بۆ ئەوەی ببێتە تۆز، هورد دەکرێت.

شیری گیراوە، تاکو دەبێتە دەرەمە، لە بوزی دەکەن. پاشان دەرەمەکەی، بۆ ئەوەی ببێتە سەلک، دەگرن و بۆ ئەوەی ئاوەکەی لێ بچۆڕێتەوە، دەیکوشن (وێنەی ٨٨). ڕەوەندەکان، بۆ ئەوەی تامی پەنیر خۆش بێت، گیای تێدەکەن. بە نموونە، ئەوانەی گوێستانی هۆڕنێ قوڕادە و هەندێ جار کەنگر و هی ئەوانەی وێزێ بێزە.

نرخی یەک کیلۆ پەنیر، لە دوکانی ماستفرۆشان پار بە هەشت هەزار دینار بوو. ئەوانیش بە شەش هەزار دینار ـ ئەو نرخە ستاندارت نییە ـ لە ڕەوەندان وەردەگرن.

نرخی یەک کیلۆ پەنیر لە گوێستانی هۆڕنێ پار دوازدە هەزار دینار و هی ژاژیش حەوت هەزار دینار بوو. لە بازاڕی هەولێریش شازدە بە یازدە هەزار دینارە.

پەنیرفرۆشەکان بۆ کڕینی پەنیر و ژاژی، دەچنە لای ڕەوەندەکان لە گوێستانان. بە نموونە، سید طیب لە هەولێر بۆ لای حسن ابراهیم ئاغا لە گوێستانی هۆڕنێ دەچێت.

ماست و پەنیر، گەر چی بەرهەمی شیرن، دژی یەکترن. ئەو هیربارەی پەنیری تێدا دەگیرێتەوە، تاکو بۆنەکەی نەڕوات، ماستی تێک دەدات.

**کەرە**

ماست لەگەڵ کەمێک ئاو جاران لە مەشکە و ئەورۆ لە خەڵاتە دەکرێت. ئینجا، بۆ ئەوەی چەوری و دۆ لێکجوداببنەوە، کاتژمێرێک کەمتر زیاتر دەهەژێندرێت. پاشان لە مەنجەڵیک دەکرێت. کەرەکەی لێدەگرن و دۆیەکەش دەکرێت بە سپیاتی دیکە.

کەرە، بۆ ئەوەی بکرێت بە روون(رۆن)، لە مەنجەڵێکدا دەقرچێندرێتەوە. پاشان خڵتی سەری بە مڵاکێک دەگیرێت. دوای ساردبوونەوەی دەمەیی و دەبێتە کەرە.

نرخی یەک کیلۆ کەرە، پار لە بازاڕی حاجیاوا هەشت هەزار دینار و لە هی چۆمان دە هەزار دینار بوو.

**شیرێژ**

دۆ لە مەنجەڵێکی فافۆن لەسەر سێکوچکەی ئاگر دادەندرێت. قشپل یان دارودوڕی لە بنی رادەکرێت. ئینجا ئاگری پێوەدەندرێت. دۆ، تاکو خەست دەبێت، دەکوڵێندرێت. پاشان، بۆ ئەوەی ئاوەکەی چک بکات، لە جانگ دەکرێت.

شیرێژ، بۆ ئەوەی تامی خۆش بێت، گیاو گۆری بەهاری لە کوێستانی هۆڕنێ ـ قوڕادە تێدەکرێت. ئینجا لە پێستە یان دەبەی پلاستیک دەکرێت. پاشان بە ماست و پەنیر فرۆشان دەفرۆشرێت.

بێری، بۆ ئەوەی هەست بە ماندووبوون و بێزاری نەکات، بە گۆرانی مەشکەی دەهەژێنیت. بە نموونە، گۆرانییەکی دەڤەری

**دۆسکی ژۆری، ئەمەیە**

**مەشکا من یا گامێشان**

**روین کەفتێ بۆ دەرویشان**

**دۆ کەفتێ بۆ سەرخۆشان**

**مەشکا من یا نێری یا**

**روین کەفتێ بۆ زەریا**

**دۆ کەفتی بۆ پەریا**

**مەشکا من یا بەرانا**

**روین کەفتێ بۆ مێڤانا**

**دۆ کەفتێ بۆ جیرانا**

**کەشک**

دۆی کولاو، بۆ ئەوەی ئاوەکەی چک بکات، لە جانگ دەکرێت. پاشان لە تەشتێک دەکرێت. ئینجا، مشت مشت لە ناو لەپان خڕوپان دەکرێت. پاشان، بۆ ئەوەی وشک بێتەوە، لە تەشتان دەکرێت یان لەسەر تەختەی رەشماڵ پەرت دەکرێت و لەبەر هەتاو دادەندرێت.

**لۆر**

ئاوی پەنیری، واتە دوای گرتنی پەنیر لە شیری بە شلکێنە هەوێن کراو بۆ پەنیر، لە مەنجەڵێک، دەخرێتە سەر ئاگر. لۆرەکە، دوای کولان، بەسەر دەکەویت. ئینجا  بە کەوگیر دەگیرێت و مەنجەڵێک دەکرێت.

ماستفرۆشەکان، پار کیلۆی لۆریان لە ڕەوەندەکان بە حەوت هەزار ـ ئەو نرخە ستاندارت نییە ـ دینار وەردەگرت و بە هەشت هەزاری بە خەڵک دەیانفرۆشتەوە.

**فرۆ**

شیری مالاتی تازە زاو، بۆ ئەوەی بکرێت بە فرۆ، هەندێک دەکوڵێندریت و بۆ ئەوەی ئاوەکەی لێ بچورێتەوە لە بوز دەکرێت.

**مەیرە**

نرخی یەک کیلۆ مەیرە پار لە بازاڕی حاجیاوە دوازدە هەزار دینار بوو. لە بازاڕی چۆمان دە هەزار دینار بوو.

**ژێربابەتی ٢. خواردنەوە**

مەبەست ئاو و خۆشاوە کە مرۆڤ بە شێوەی سروشتی یان دەستکرد دەستی دەکەوێت و دەیانخواتەوە.

**. ئامرازەکانی ئاو خواردنەوە**

هەندێک لە ئامرازەکانی تێڵینان و پێڵینان و خواردنەوە ئەوانەی خوارەوەن:

**جام**

زۆربەی خەڵک، تاکو کۆتایی شەستەکانی سەدەی بیستەم ئاویان لە

ماڵەوە و لە دەرەوە (چایخانە. چێشتخانە) بە یەک جام دەخواردەوە. جام لە فافۆن یان نیکل دروست دەکرێت.

**بەرداغ**

خواردنەوەی ئاو بە بەرداغ لە ماڵەوە و لە چایخانە و چێشتخانان لە کۆتایی شەستەکانی سەدەی بیست دەستی پێکرد. ئەوڕۆ، جگە لە هەندێ خێزانی گوندنیش، ئاو بە بەرداغ نەبێت ناخورێتەوە.

**دەبەی ئاو**

مەبەست ئاوی کانی یان بیرە کە دوای وەلادانی مادە کیمیاوییەکانی زیانبەخش بۆ لەش لە دەبەی نایلۆنی یەک لتری و زیاتر دەکرێت و بۆ بازاڕ دەبردرێت.

کاربەدەستانی دەوڵەت، دە پازدە ساڵێک لە مەوبەر، خواردنەوەی ئاوی شێرەیان بۆ خواردنەوە لە گەڵ چێشت لە جێشتخانان و چاو و قاوە لە چایخانان، لە ترسی نەخۆشی کولێرە، قەدەغەکرد. خەڵک، ئەگەر چی بە خەرجی زیادییان دەزانی، بەرەبەرە لێ ڕاهاتن.

دەبەی ئاوی جۆراوجۆر لە بازاڕدا هەیە. بە نموونە، تایەن. رۆسە. ژین. سەفین. کانی. لایف. مازی. مسافی. هەیات و هیدیکە.

**دۆلکەی ئاوێ**

یەک دوو لتر ئاو لە دۆلکە دەکرێت. ئینجا، بۆ خواردنەوە، لە بەرداخ دەکرێت. خواردنەوەی ئاو بە دۆلکە باو نییە.

**ئامرازەکانی چا و قاوە و نسکافی و عارەق و بیرە خواردنەوە**

ئامرازەکانی تێکولاندن و تێلێنان و پێخواردنەوە ئەمانەن:

**ئاوکولاندن** - ئاو لە کتلی (فافۆن. نیکل)، دەخرێتە سەر تەباخ یان سێکوچکە (ئاسن. بەرد) ی ئاگردان. یان لە سەماواری نیکل (کارەبایی. نەفتی) جاران سەماواری مس (رەژوو)، بۆ کولاندن.

**چالێنان** - ئاوی کولاو لەگەڵ تۆچا لە چایپەست (فافۆن. نیکل. چینکۆ) دەکرێت. ئینجا، بۆ کولان و دێم کێشان، دەخرێتە سەر ئاگری تەباخی غازی یان نەفتی.

**قاوەکردن** ـ ئەمەیان بە دوو جۆر دەکرێت.

ء. قاوەی ئامادەکراو لە کوپێکی پڕ ئاوی کوڵاو دەکرێت. ئینجا مڵاکێک شەکری تێدەکرێت و تێکدەدرێت.

ب. قاوەی هاڕدراو لە جەوزەیکی پڕ ئاوی کوڵاو دەکرێت. بۆ ئەوەی دێم بکێشت دەخرێتە سەر ئاگری رەژوو لە مەنقەڵەدا.

**چاخواردنەوە** ـ چا لە پیاڵە و بن پیاڵە(شوشە) و بەرداخی چای (شوشە) و کوپی چای (شوشە. نیکل) دەخورێتەوە. هەندێ کەس، لە جیاتی ئەوەی پیاڵەی بەدەمی خۆی وەبکات، چایەکە، بۆ ئەوەی سارد بێتەوە، لە بن پیاڵە دەکات و فڕی دەکات.

**قاوە و نسکافی خواردنەوە** ـ قاوە و نەسکافی لە فنجان و کوپی فەخفوری دەخورێنەوە.

**عارەق و بیرە** ـ ئەمانە لە بەرداغی بە فۆرم جودا و گەورە و بچووک دەخورێنەوە. فروشگای عارەق و بیرە فرۆشتن لە شارەکان، تاکو ئەوڕۆ، ئازادە. لە یانەکان وریستۆرانەکانیش، هەن بۆ خواردنەوە.

ئامرازەکانی دیکەی چا و قاوە و نسکافی خواردنەوە ئەمانەن: مڵاکی چای. مڵاکی شەکری. قووتوی شەکری ورد. قووتوی قەند. قوتووی تۆچا. سینی پێاڵان .سوزگی و هیدیکە.

**. ئامرازەکانی ساردکردنەوە**

ئاو و خۆشاو لە دوو ئامرازی جودادا سارد دەکرێتەوە.

**ئامرازی گڵێنەیی**

چەند لیتر ئاو، بۆ خواردنەوە و ساردکردنەوە، لە شەربە و کوپە و جەلحە دەکرێت. ئینجا لە شوێنێکی باگرتە دادەندرێن. چەندی بایان زیاتر لێبدات ئەوەندە ئاوەکەیان ساردتر دەبێت.

ئامرازەکانی گڵێنەیی، تاکو شەستەکانی سەدەی بیستەم. زۆر باو بوو. ئەوڕۆ، لەبەر پەیدابوونی ئامرازی کانزایی بۆ ساردکردنەوە، زۆر کەم بووە. کوپەم لە حەوشەی ماڵێکی گوندی تۆبزاوە سەر بە ناحیەی داقوق و

لـه گۆڕستـانـی کفـری و جـەلـحـەم لـە ژێـر کـەپـری نـاو بـاخـچـەیـەکـی گـونـدی بـاریـی بچووک دیتووە.

**ئامرازی کانزایی**

ئـاو بـۆ سـاردکرنـەوە، لــە دەبــەی نـایـلـۆن و دۆلکــەی ئـاوێ دەکرێـت و لەگــەڵ خواردنــدا دەخرێتــە یەخچاڵــەوە. یــان دەبــەی موبــەردەی لــێ پڕدەکرێـت و دەخرێتــە ســەر موبــەردەی ئــاوێ. خــواردنیش، بــۆ ئــەوەی تێکنەچێت و بۆگەنی نەبێت لە فریزەر هەڵدەگیرێت.

دانیشـتوانی گونـدەکانی نێوچەشـاخاویەکان و ڕەوەنـدەکان، هیـزە و دەبە و تەنەگەی پەنیر و ژاژیـان، بۆ ئـەوەی تێک نـەچن، لـە بـەهارێ ڕا تاکو زستانێ لە ئەشکەفتان دایان دەنێن. بە نموونە، ئەشکەوتی کونەبا لە گوندی خەزێنە لە دۆڵی باڵەییان. لەو شوێنانەش کە ئەشکەوتی لێ نییـە لـە رۆخـی رووبـارەکـان و لـە ژێـر سـێبـەری داران وەکـو بـی و چـنـار دادەنـدرێت و بـە گـوریس لـە دارەکـان دەبـەسـترێنـەوە. هەنـدێ کـەس، بـۆ ئەوەی تامی پەنیریان خۆش بێت و تێک نەچێت، لە تەنەگـەی دەکـەن و سـەری بـە قـوڕ دەگـرن و لــە دەو رووبـاری لــە ژێـر عـەردی دەنـێن. ئـەو ساڵانەی رووبار دێت، وەکو ئەوەی ساڵی دوو هەزار هەشت لە رووبـاری ناوپردان روویدا، گشت تەنەگە و هیزەکانی لەگەڵ خۆی رامـاڵی و نوقمی لم و لیتاوی کردن.

**ب. چەشنەکانی خواردنەوە**

هەندێک لە خواردنەوەکان، جگە لە ئاو، ئەمانەن:

**چا ـ** گشت لایێک، ئەگەر رۆژانە ئەوەندەی ئاو چای نەخواتـەوە، ئـەوە شتێکی ئەوتۆ لەو کەمتر ناخواتەوە. خێزان نییە رۆژێ سێ جەم کـەمتر چـای لــێ بنێـت. گوندنیشــەکان، لەبــەر نــەبوونی یـان ئارەزوونــەکردنی خواردنەوەی شتی تر، لە شارنیشینەکان زیاتر ئالودەی چا خواردنــەوەن. گەیشتیە هەر ماڵیک، دوای ئاو، چات لـە پێش دادەنـدرێت. هەنـدێ کـەس ئارەزووی چای بێرەنگ و هەندێکی دیکە مەیلی چای بەرەنگ دەکات.

چای شیرین، واتە ئەو چایەیی کە ملاکێک دووان شەکری وردی تێدەکرێت و بە ملاکی چای تێکدەدرێت، زۆرتر دەخورێتەوە لە چای تاڵ(دیشلەمە)، واتە ئەو چایەیی کە کەڵبە شەکرێکی قەند دەخرێتە دەمەوە و چایەکەی لەسەر دەکرێت.

**دۆ** ـ ئەورۆ، لەبەر پەیدابوونی خۆشاو و پێخۆری جۆراوجۆر، کەمتر بەر لە شەستەکانی سەدەی بیستەم دەخورپیتەوە. دۆی ئێران( لالەبناب. کاڵە) لە نۆهەتەکانەوە شوێنی دۆی خۆمانی گرتووتەوە.

خەڵکی کەندێناوە، دوای وێرانکردن و سوتاندن و بە تالانبردنی ناوماڵ و مێگەل و دەست بۆ ژن بردن لە ساڵی ١٩٦٣بە دەستی برا عارەبە موسڵمانەکانی عەشیرەتی حەنەش، بەو شێوە باس لە چارەنووسی خۆیان دەکەن.

**عارەب هات هەشت و نۆ**

**نە نانیان هێشت نە قومە دۆ**

**ئەوجا چبکەین بابە ڕۆ**

**خۆشاو** ـ خواردنەوەی خۆشاو لە کۆنەوە باو بووە. وەلێ لە سەرەتایی نۆهەتەکانی سەدەی بیستەمەوە، باوتر بووە. ئەورۆ لەگەڵ ژەمی نیمەڕۆیان دەخورێتەوە. لە جیاتی چاو و قاوە بە مێوان دەدرێت.

هەندێک لە خۆشاوی قوتوو ئەمانەن: کۆکاکولا. بیبسی. فانتا. میرەندا.

### ژێربابەتی ٣. کێشان

مەبەست هەر شتێکە کە لە تووتن و خەشخاش (مەعچەچە) و مەڕیوانە و هاوشێوەکانی ئامادە دەکرێت. ئینجا بە شقارتە و چەخماخی غازی و چەخماخێ بەردی(ئەمەیان رەنگە نەمابێت) و ستێ ـ بەردەستێ پێدەکرێت و، قومی لێدەدرێت و بۆ ناو سنگ هەڵدەمژرێت.

**ئامرازەکانی کێشان**

جغارە و هاوشێوەکانی بە ئامرازەکانی خوارەوە دەکێشرێن.

دارجغاره ـ جغارەی پێچراو(پەلکە دەفتەری جغارە و تووتن) و جغارەی قامیش، لە سەری دارجغارە رادەکرێت و پێدەکرێت. کلکەکەی بە دەمەوە دەگیرێت و قومی لێدەدرێت.

قەلنە(پایپ) ـ تووتن لە سەری قەلنە دەکرێت. ئینجا پێدەکرێت. کلکەکەی بە دەمەوە دەگیرێت و قومی لێدەدرێت.

**چەشنەکانی کێشان**

ئەمەیان، بە گوێرەی کارکردنی لە لەشی مرۆڤ و هەڵوێستی کۆمەڵگە و نرخ و شێوەی کڕین و فرۆشتن و بەرهەم هێنان، دوو جۆرە.

**جغارە**

ئەمەیان بە گوێرەی ئامادەکردن چەند جۆرە:

ء. مەکینە ـ ئەمەیان لە کارگەی جغارە دەپێچرێت و هەر بیست دانەی لە پاکێتێک دەکرێت. درێژی هەشت سانتیمەتر و ئەستووری یەک سانتیمەترە. فیلتەرێکی، بۆ گێرانەوەی قیری جغارە، لە قونکی گیراوە.

هەندێک لە جۆرەکانی جغارە ئەمانەن: غیدان. مارلبۆرۆ. کینگ.

ب. دەستی ـ جغارەکێش، تووتن وپەلکەقەمیش و دەفتەری جغارە و شقارتە و جەخماخ و ستێ و بەردەستێ لە کیسەی تووتن دەکات. ئینجا لەبەر پشتێنی خۆی رادەکات یان لەباخەڵی خۆی دەنێت. کیسەی تووتنم لە گوندی هەرتەل و گوندی سۆلاخ بینیووە. دوو جۆری هەیە.

پێچراو ـ تووتن لە پەڕەدەفتەری جغارە دەکرێت و، رۆخێکی بە ددان دەقرتێندرێت و تەردەکرێت و بەسەر لایەکەی دیکەی دەنووشتێن درێتەوە.

تێکلاو ـ تووتن لە پەلکەقەمیشێک دەکرێت. ئینجا، بۆ ئەوەی تووتنەکە بچێتە پاڵ یەکتر، دەکوترێت. ئەمەیان دانەدانە تێدەکرێت.

ت. داگیراو ـ سەد پەلکەقەمیشک کەمتر زیاتر لە ناو قایشێک دەدرانە پاڵ یەکترەوە. قایشەکە دەخرایە ناو سینێکەوە. بە چەنگان تووتنیان بەسەر دادەکرێت. بۆ ئەوەی تووتنەکە بچیتە پاڵ یەکتر، دەکوترایەوە. بۆ

ئـەوەی تووتنەکـە نـەرژێت، سـەری قامیشـەکانیان دەنووشـتاندەوە. ئـەو جغـارە تـاکو کۆتـایی شەسـتەکانی سـەدەی بیسـتەم، بـاو بـوو. ئـەوڕۆ نەمبینیووە.

**مادە هۆشبەرەکان**

کێشـانی مـادە هۆشـبەرەکان وەکـو حەشیشـە و نێکـۆتین لـە لایـەن گـەنجانی هەنـدێ ناوچـە (سۆران لـە سـەر زارانـە) وە، لـە نۆهەتـەکانی سەدەی بیستەمەوە، دەستی پێکراوە.

مادە هۆشبەرەکان، وەکو لە هەر وڵاتێکی دیکەوە، بە قاچاغ لـە لایـەن قاچـاغچی و بازرگانـان، بـە خـاک و ئاسـمانی وڵاتـانی دەوروبـەر، بـۆ کوردسـتان دێـت. پاشـان دوور لـە چـاوی پـۆلیس و ئاسـایش بـە خـەڵک دەفرۆشرێت.

کێشانی مادە هۆشبەرەکان، یەکێکە لەو گرفتە کۆمەڵایەتییانـەی کـە هەرگیز پێشـی پێنـەگیراوە و ناشگیرێت. ژیـانیش چەنـدی زیـاتر تێکنێکـی تـێ کـەوێت ئەوەندە ژمارەی کێشەران زیاد دەکات.

**ژێربابەتی٤. ئادابی خواردن و خواردنەوە**

یەکێکـە لـە بابەتـەکانی کولتـووری گیـانی. کـەوابێت، شـیکردنەوەی لێرەدا، دروست نابێندرێت. وەلـێ، ئێمـە ئـەوەمان، لەبـەر ئـەوەی کـردووە چونکە خواردن و خواردنـەوە و ئاداب ، بە جۆتە باسیان لێوە دەکرێت. بۆ روونکردنـــەوە دەڵـــیم. چێشـــت لێنـــان بابـــەتێکی کولتـــووری مادیـــە. خواردنـەکەی بابەتێکی کولتووری گیانییە.

**ء. ئادابی خواردن**

بـاس لـە چەنـد شـت، کـە پەیوەنـدیان بـە ئـادابی خواردنـەوە هەیـە، دەکەم.

- **ژەمەکانی رۆژانە**

سێ ژەم، لە کاتی جودادا، نان دەخورێت.

**بەیانیان** ـ دوای ڕۆژبوونەوە تاکو دەمژمێری هەشت و نیوی پێش نیمەڕۆ. خواردنی بەیانیان، جگە لە نان و چا، ئەمانەن: نۆک و لۆبیا و ماست و هێلکە و کاکڵەگوێز و تەحین(کونجی کوشراو) و پەنیر و نیسکێنە و نۆکاو و هاوشێوەی ئەوانەوە.

جۆرەکانی خواردنی بەیانیان، بە پیشە و شوێنی جوگرافیاوە پابەندە. بە نموونە، زۆربەی خواردنی: ڕەوەندەکان ـ ماست و پەنیر و ژاژیە. هی مەڕدارەکان ـ ماستە. هی کارمەندانی شارەکان ـ نۆک و لۆبیا . هی باخچەدارەکان ـ کاکڵەگوێز. ئیتر بەو شێوەوە.

**نیوڕانـــان** ـــ دوای دوازدەی نیـــوەڕۆ تـــاکو دووی پاشـــنیمەڕۆ. خـــواردنی نیمەڕۆیان، جگە لە نان، بە زۆری، ئەمانەن: برنج و شلەی بێگۆشت یان بەگۆشت. سی ساڵێک لەمەو بەر، بە تایبەتی لە گەندەکان، نیوەڕۆیان چێشت لێ نەنەدرا.

**ئێواران** ـ دوای ڕۆژئاوابوون بە یەک دوو کاتژمێر. خواردنی ئێواران، بە زۆری، ئەو خواردنەیە کە لە ژەمی نیمەڕۆ ماوەتەوە. هەندێ کەس، لەترسی قەڵەوبوون و نەخۆشی، ژمی ئێواران هەر ناخوات یان شتێکی سووکی وەکو میوە یان ماستاو لە باتی خواردن دەخوات و دەخواتەوە.

ماوەی نێوان ژەمەکان، بە گوێرەی ئامۆژگارییەکانی پزیشکانی گەدە و خواردەمەنی، چەندی وەکو یەک بن ئەوەندە بۆ لەش باشترە. وەلێ خەڵکی ئێمە، ڕەچاوی ئەو سیستەمە ناکەن. بە نموونە، مەودای نێوان ژەمی بەیانیان و نیمەڕۆیان، بە زۆری لە گوندەکاندا، چوار پێنج دەمژمیرە. مەوادی نێوان ژەمی نیمەڕۆ و ئێوارانیش شەش حەوت کاتژمێرە.

سیستەمی خواردن لە گوندەکان، بۆ کەسانی غەیرە گوندی، خۆش نییە. کێشەی زۆرم، بە دەستی ئەو سیستەمەوە، تووشهاتووە. هەرچی بکەیت و بڵێت، دادت نادات. خانەخوێت، لەبەر ئەوەی پێی وایە خواردنەکەت بەدڵ نییە یان شەرم دەکەیت، ناچارت دەکات نان بخۆیت.

**خواردن خێزان بە یەکەوە**

ئەنـــدامانی خێــزان وەکــو دایــک و بــاوک و منــداڵ (کــچ و کــوڕ) و کەسـوکاریان، بــە زۆری لەســەر سـفرەیێک و پێکــەوە، ژەمــەکانی ڕۆژێ دەخۆن. نان دادەندرێت و هەر یەکەی بای خۆی لە قاپێک دەکات و بۆ پێش خۆی دەیکێشێت. دوای دەستکێشانەوە، دایک و خوشک. قاپەکان خڕدەکەنەوە و سفرەکەی دەستڕنەوە. باوک یان برای گەورە، پێش ئەوانی دیکە، دەست بۆ خواردن درێژ دەکەن. هەندێ خێزان، لەسەر باوک و بڕا دەوەستن، تاکو لە ئیشێ بۆماڵەوە دەگەڕێنەوە.

**خواردن بە مێوانەوە ـ** ئەو ژەمانەی مێوان لە ماڵەکەدا هەبێت، بە تایبەتی ئەگەر مێوانەکە بۆ جاری یەکەمی بێت یان تێکەڵاوی تازەی لەگەڵ خێزانەکەدا پەیدا کردبێت، جگە لە باوک، ئەندامەکانی دیکەی خێزان، بە تایبەتی مێیینە، نانی لەگەڵ ناخۆن.

پاش خواردن دانان، بۆ مێوان جوان نییە، تاکو فەرمووی لێنەکرێت، لەبەر ئەوەی بەکەسێکی بێ ڕەوشت لەقەڵەم دەدرێت، دەست بۆ خواردن درێژ بکات. هەروەها، بۆ خانەخوێش جوان نییە، لەبەر ئەوەی بە کەسێکی قرچۆک لە قەڵەم دەدرێت، پێش دەست کێشانەوەی مێوان، دەست لە خواردن بکێشێتەوە.

هەندێک لەو داب و نەریتانەی جاران، کە ئێستا زۆر کەم بووێنەی و لە هەندێ شوێناندا نەماوەن بردنی خواردن بۆ یەک بوو. بە نموونە ئەم دراوسێیەیی خـواردنێکی خـۆش(دۆڵمــە. کفتــە) یــان ئەوانــەی ناونــاوە لێدەندران(گەنم بە کاردی. دۆغەوا بە کفتە) یان دەگیرایەوە(تەرەساز. تورشـی) هەندێکی لە قاپێک یان لە جامێک بۆ دراوسێیەکەی دەبرد. هیربارەکــە، دوای ئــەوەی هەنــدێ خــواردنی وەکــو پتــە خوێێک،گۆلمــە ســاوارێک، هەنــدێک شــیرینی تێــدەکرا، ڕۆژی دوای بــۆ دراوســێیەکە دەبردرایەوە.

**ب. ئادابی خواردنەوە**

ئاو و چا، لەبەر ئەوەی تەراتی بە لەشی مرۆڤ دەدەن، رۆژی چەندین جار دەخورێنەوە.

ئاو ـ لە بەرداغ هەندێ جار لە جام دەدرێت و دەخورێتەوە و ئاوی بەرماو، لە ترسی نەخۆشی گرتنەوە، کەس نایخواتەوە. چڵ ساڵێک لەمەو بەر، بە نموونە لە چایخانەکان، دەیان کەس بە جامێک دووان ئاویان دەخواردەوە و بێزیان نەدەکردەوە.

چا ـ لە پیاڵە و بەرداغیچا و کوپیچا دەخورێتەوە وەلێ چایداغ لە ترسی دەم سووتان، بۆ ئەوەی سارد بێتەوە لە بن پیاڵە دەکرێت یان بۆ چەند خولەکێک دەستی لێنادرێت، ئینجا دەخورێتەوە.

پیاڵە، تاکو لێوان، لە چا پڕ دەکرێت ئینجا بۆ خواردنەوە دادەندرێت. ئەگەر وانەبێت، بە تایبەتی بۆ مێوان، لەبەر ئەوەی بێ رێزی دەگەینێت، نادرێت.

دۆ و ماستاو ـ ئەمەیان وەکو ئاو و چا لە بەرداغ و جام دەخورێتەوە وەلێ چڵ سالێک لەمەو بەر لە چێنی و کۆتکیدار دەکرا و بە ملاکیدار دەخورایەوە.

# سەربابەتی شەشەم

## پۆشاک

مەبەست گشت ئەو پۆشاکانەیە کە پیاو و ژن، لەسەریان دەنێن و لەبەریان دەکەن و لە پێیان دەکەن. پۆشاکی کورد، لە رووی شێوە و رەنگ و بڕین و شوێنی جوگرافی و شوێنی نیشتەجێبوون(شار و گوند) و ئاستی خوێندەواری و کۆنتاکت لەگەڵ نەتەوەی دەوروبەر و رەوتی گەشەکردنی مێژوو، جۆراوجۆرە. مرۆڤ، ئەگەر بە دیقەت بێت، بە پۆشاک خەڵکی ئەم نێوچە لەو نێوچە یان ئەم ئاینە لەو ئاینە جودا دەکاتەوە. ئەورۆ دوو چەشنە پۆشاک، کە هەر یەکەیان تایبەتمەندی خۆی هەیە، لەبەر پیاو و ژنانی کورد دەبیندرێن.

**ژێربابەتی ١. پۆشاکی ترادیسیۆنی**

مەبەست لەو پۆشاکە، ئەوانەن کە سەدان ساڵە لەسەر نراون و لەسەر دەندرێن و لەبەر کراون و لەبەر دەکرێن و لە پێکراون و لە پێ دەکرێن. تایبەتمەندیەکانی پۆشاکی ترادیسیۆنی، لە رۆژی ئەورۆدا، ئەمانەن:
* کەمبوونی رێژەی ئەوانەی ئەو پۆشاکە هەمیشە لەبەر دەکەن.
ئەگەر پەنجا ساڵێک لەمەو بەر نۆهەد لە سەدی کورد ئەو پۆشاکەیان لەبەر دەکرد ئەورۆ بە گوێرەی تێبینیەکانی خۆم هەر بیست لە سەد لە بەری دەکەن.
* ئەوانەی رۆژانە پۆشاکی ترادیسیۆنی لەبەر دەکەن، ژن و پیاوی تەمەن لە چل ساڵ بەرەو ژوورە.
* منداڵ، کە دەبووایە لە لەبەرکردنی پۆشاکی ترادیسیۆنییان رابهێنابوایە، بە دەگمەن نەبێت لەبەری ناکەن یان لەبەر ناکات.
* پۆشاکی ترادیسیونی، لە گوندان زیاتر لە شاران، لەبەر ئەوەی هێشتا هەندێ کەس پابەندە بە داب و نەرێتی کوردەواری، لەبەر دەکرێت.
* رێژەی ئەوانەی پیشەیان کشتوکاڵییە دوو سێ کەرەت لە هی ئەوانەی پیشەیان پیشەسازی یان خزمەتگوزارییە زیاترە.

* ڕێژەی دەست بەردارانی پۆشاکیترادیسیۆنی لەو دە ساڵەی دواییدا، لە ئەنجامی لەبەر چاوخستنی ئەم پۆشاکە، بەوەی ئەوەی لەبەری بکات دەشتەکی و دونیا نەدیتەیە، یەک دوو کەرەت لە چاو هی بیست ساڵێک لەمەو بەر خێراترە.

*پۆشینی پۆشاکی ترادیسیۆنی، دوای کۆتایی هاتنی ژیانی ئەوانەی ئەوڕۆ، بۆ زۆربەی هەرەزۆری خەڵک دەبێتە جێگەی پرسیار و سەرنجدان.

پۆشاکی ترادیسیۆنی، بە گوێرەی نێرومێ، بە وردی لە خوارەوە باسییان لێوە دەکرێت.

**یەکەم. پۆشاکی پیاوان**

ڕیشەی ئەو پۆشاکەی پیاوانی کورد بۆ سەدان ساڵ لەمەو بەر دەگەڕێتەوە. ژینگەی جوگرافی(تۆپۆگرافیا. ئاووهەوا) و ڕەوتی گەشەکردنی مێژوو و پەیوەندی ئابووری و کۆمەڵایەتی رۆڵی خۆیان لە هەمە چەشنەیی ئەو پۆشاکانە بینیوە و دەبینێت. پۆشاکی ترادیسیۆنی ئەمانەی خوارەوەن:

**کورتەک و شەرواڵ**

پۆشاکی پیاوێکی بە کورتەک و شەرواڵ لەسەر بۆ پێ، یەک بە دوای یەک، ئەمانەی خوارەوەن:

**١. کڵاو**

بریتییە لە شتێکی خڕ بە قەدەر کەلەی سەری پیاوان. سەرێکی، بۆ ئەوەی تووکی سەر داپۆشیت و کەلەی سەر لە گەرما و سەرما بپارێزێت، تەپانی بۆ کراوە. سەرەکەی دیکەی، بۆ ئەوەی لەسەر بندرێت، واڵا کراوە.

**جۆرەکانی کڵاو ـ** بە گوێرەی ئەو مادەی لە کردنی بەکار دەهیندرێت دوو جۆرە.

**کڵاو لە قوماش ـ** لە دوو جۆرە قوماش دروست دەکرێت.

**خام ـ** قوماشێکی رەنگ بنەوشەییە. جۆرە کڵاوێکی بە ناوی کۆیەیانەی لێدروست دەکرێت. تەپانی کڵاوەکە بە ئاوریشم بە سەنگور پوختە دەچندرێت. دەورەکەی نەخشی جۆراوجۆری، بە ئاوریشمی رەنگاو

ڕەنگ(کەسک و سۆر و زەرد و سپی و ڕەش)، لێدەکەن. هەوێری، بۆ ئەوەی ڕەق بێت و ڕاست بووەستێت، لە ناوەی دەسوون. شێوەی کڵاوەکە، دوای یەک دوو کەڕەت شوشتن، تێک دەچێت و جوانییەکەی لە دەست دەدات. ئەو کڵاوە، لەگەڵ کولتووری مادی کورد، جوان لێک هاتوون.

**شاخبازی ـ** قوماشێکی ڕەنگ سپییە. جۆرە کڵاوێکی بە ناوی مەلایانە و فەقێیانەی لێدروست دەکرێت. دەورەکەی بە کەلەف دەچندرێت. نەخشی پەنجەرەی مزگەوتانی لێدەکرێت. ئەو جۆرە کڵاوە، لە سەرەتایی نۆهەتەکانی سەدەی بیستەمەوە، واتە دوای خورتبوونی ئیسلامی سیاسی، پەرەی ساندووە. ئەوڕۆ، بە مۆتیڤی ئاینی، دەیان کەس بە تایبەتی بۆ نوێژی هەینی لەسەریان دەنێن.

**کڵاو لە دەزوو ـ** لە دوو جۆرە دەزوو دەچندرێت

**دەزوو ـ** ئەمەیان لە دەزووی یەک ڕەنگ یان دوو ڕەنگ بە دەستی ژنان و بە شیش و سنارە دەچندرێت. کڵاوی دەزوو تەنک و نەخشدارە.

**سوف ـ** ئەمەیان لە سوف یەک ڕەنگ یان دوو ڕەنگ بە دەستی ژنان بە شیش و سنارە دەچندرێت. کڵاوی سوف، لەبەر ئەوەی داوەکەی لە دەزوو ئەستوورترە، لە کڵاوی دیکە ئەستوورتر و گەرمترە.

**جەمەدانی (چەفیە. جامانە)**

قوماشێکی چوارگۆشەیە. درێژییەکەی پەنجاوپێنج و پانییەکەی پەنجاوپێنج سانتیمەترە. لە دەزووی ڕەنگ ڕەش و سپی دەچندرێت. فۆندەکەی چوارگۆشەی بچووکە.

**جەمەدانی هۆنینەوە(نواندنەوە)**

داوە ئاسۆییەکانی هەر چوار رۆخی جەمەدانی، یەک دوای یەک و بە دوو پەنجە، دەردەکێشرێت. ئینجا داوە ستوونییەکان، لەسەر شێوەی گوڵینکی وردورد، وەلێ سفت، یانیش ریشاڵ ریشاڵی سەر بە گوڵینگ دەهوندرێنەوە.

**جەمەدانی بەستان ـ** ئەوەندەی ئارەزوو بکەیت، بە شێوەی جۆراوجۆر لەسەر دەئاڵێندرێت. بە دەگمەن نەبێت، دەنا دوو جەمەدانی وەکو یەک لەسەر

نا ئالێندرێت. ئەوەندەی دەکەم بە مەتیڤی ئەو هەموو جیاوازیە ناکەوم. سەیر لەوەدایە، خەڵکی یەک گوند یان یەک نێوچەی جوگرافی جەمەدانییان وەکو یەک نابەستن. مۆتیڤی(مەنتیقی) ئەو جیاوازییە، پێم وایە، ژێنگەی جوگرافی و ڕەوتی گەشەکردنی مێژوو و ڕەوشتی خەڵکە. چەشنەکانی جەمەدانی بەستان ئەمانەن:

**خاو و پان** ـ یەک جەمەدانی بە خاو و پانی لە کڵاو دەئالێندرێت. ئەمەیان لە هەندێ قەزای ئەستانی هەولێر بە نموونە،مەخمور. کۆیە. دەشتی هەولێر، باوە.

**لولدراو**ـ یەک جەمەدانی باریک لولدەدرێت و بە توندی و ڕێک و قایم ، لە کڵاوی دەئالێنن. بە زەحمەت لەبار یەک دەردێت. ئەمەیان لە قەزاکانی سلێمانی وەکو شاربازێڕ و قەرەداغ و هەڵەبجە، باوە.

**هەوری(مشکی)**

پارچەیەکی چوارگۆشەی لە دەزوو چێندراوە. پیاوان لە شوێنی جەمەدانی لەگەڵ کڵاو لەسەری دەبەستن. ڕەنگی ڕەش یان سۆرە.

**کەشیدەی زەرد** ـ قوماشێکی ڕەنگ زەردە. حاجییەکان، بۆ ئەوەی لە ناو خەڵکدا بناسرێنەوە، دوای گەڕانەوەیان لە حەج، لەسەریان دەئالێنن یان لە پشتییان، لە شوێنی پشتێن، دەیبەستن. ڕەنگەکانی ئەمانەن: زەردی کراوە. زەردی تۆخ. پرتەقاڵی خاڵخاڵ سپی.

**کەشیدەی سەوز**ـ قوماشێکی ڕەنگ سەوزە. سەیدەکان، لە شوێنی پشتێن، بۆ ئەوەی خەڵک لە پایەیی ئاینییان بێخەبەر نەبێت، دەبەستن.

**مەندیل**ـ قوماشێکی سپی یەک ڕەنگە. مەلایەکان، بۆ ئەوەی لە خەڵکی دیکە جودابکرێنەوە و خۆیان وەکو پیاوی زانا لە ئاینی ئیسلامدا بە خەڵک بناسێنن، هەمیشە لەسەریان دەبەستن.

**شەدە** ـ قوماشێکی شلکی ڕەنگ سووری تۆخ یان قاوەیی یان ڕەشی تێکەڵاوە. فۆندەکەی گوڵدارە. چینی دەسەڵاتدار(میر. ئاغا. کاک. بەگزادە. شێخ) و پولدار لە سەریان دەبەستن.

**١. كورتەک و شەرواڵ**

قوماشی جیاواز بە رەنگ و باش و خراپ کورتەک و شەرواڵی لێدەکرێت. جۆرەکانی کورتەک و شەرواڵ ئەوانەی خوارەوەن:

**مرادخانی**

یەکێکە لە باوترین جۆرەکانی کورتەک و شەرواڵ. مرادخانی، تاکو چڵ ساڵێک پۆشاکی رۆژانەی پیاوانی بەتەمەنی هەولێر و سلێمانی بوو. ئەورۆ لە زۆربەی شوێنان لەبەر دەکرێت (وێنەی ٨٩).

**کورتەک** ـ ئێقەی مرادخانی دوو جۆرە

ء. سێگۆشەی بەقۆپچە ـ لای ڕاستی بۆ لای ڕاست و لای چەپ بۆ لای چەپ دەنووشتێتەوە. دەمەکەی کونێکی، بۆ ئەوەی لە قوپچەکەی سەری بخرێت، بۆ کراوە.

ب. سێگۆشەی بێقۆپچە ـ وەکو ئەوەی سەرەوە بۆ ڕاست و چەپ دەنووشتێتەوە و لە جیاتی ئەوەی لە قۆپچە هەڵبکێشرێت بە مەکینە لە پشت ملەکە دووررواوە.

قەڵەمچەی مرادخانی، دوو پارەچە قوماشی سفت لێک دووررواوە. لە بەر سینگ دەدوورێت. ئەوەش بۆ ئەوە کراوە تاکو لە کاتی لە بەرکردندا سنکی زەلامی بە دەرپەڕیوی دەربخات.

پشتملی مرادخانی، وەکو قەڵەمچەی مرادخانی، وایە. وەلێ قوماشی هەر دوو دیوی لە قوماشی کورتەکە.

ئێقەی مرادخانی دوو ریز (یەک لە لای ڕاست و یەک لای چەپ) قۆپچەی بە مەکینە یان دەست پێوەکراوە. قۆپچەکان دوو جۆرن. هەیانە کەبس (قۆپچەی لە قوماش گیراو)ە هەشیانە شاخ (قۆپچەی رووت) ە. هەر قۆپچەی کونێک، بۆ داخستن، لە بەرامبەر بۆ کراوە. وەلێ هەندێ کەس کونەکان ناکەنەوە. نێوان قۆپچەکان بە ئەندازەی یەکە. وەلێ شوێنی قوپچەکان، جودایە. هەیانە ئاسۆیی و لە تەنیشت یەکە. هەشیانە شاقولییە. ئەمیان یان ئەویان دەوەستێتە سەر ئارەزووی بەرادانداروە.

کورتەک شەش بەرکی بۆ کراوە. دوو ژێر بەرک، بۆ جوانی، یەک لە

ڕاست و یەک لە چەپ. سەربەڕکێک، بۆ سەعات و قەڵەم و دەستەسڕ، لەسەر ئەوەی چەپ. دوو بەڕک، بۆ پارە و کاغەز، لە ناوەوە. بەڕکەکی بچووک، بۆ خوردە بۆ سەعات، لە خوارەوەی لای ڕاست.

کورتەک بە بەر و بێ بەری هەیە. بە بەرەکەی، بۆ بەرگری لە سەرما، بەرێکی لە قوماشێکی تەنکی پێوە دووروراوە. بێ بەرەکەی، لەبەر بەرزی پلەی گەرما یان هەر بە هەوەس، بەری بۆ ناکرێت.

کورتەکی مرادخانی بێ قۆڵ، گوایە چاو لە قەمسەڵەکراوە، لە نۆهەتەکانی سەدەی بیستەم پەیدابوو. وەلێ نەجوانی بە مرۆڤ بەخشیوە و جوانیشی لە کورتەک بڕیووە.

**شەرواڵ**ـ بە گوێرەی تەسک و بەرینی، سێ جۆرە.

**هەولێری (شوشەیی)**ـ ئەمەیان، بۆ ئەوەی پیاو گورج و گۆڵ دیار بێت و پێڵاوی دانەپۆشیت و لە عەردی نەخشێت، بە قەدەر بەژنی پیاو دەبڕێت. و کەمێکیش لە فش و شۆڵ تەسکترە. کەمێک تەسک دەدورێت.

**سلێمانی (فشوشۆڵ)**ـ ئەمەیان، بۆ ئەوەی هەیبەت بە خاوەنەکەی بدات، کەمێک لە بەژنی پیاو درێژتر دەبڕێت. دەلینگەکەی قومپانی پێڵاو دادەپۆشیت. بەلای منەوە، لەبەر ئەوەی لە عەردی دەخشێ و هەندێ جار دەکەوێتە بن پێیان، دڵگیر نییە.

**کۆیەیانی**ـ ئەمەیان، نە ئەوەندەی هەولێر درێژ و تەسکە و نە ئەوەندەی سلێمانیش درێژ و فشوشۆڵە. بە گشتی هەردوو کییانە.

سەرەوەی شەرواڵ، بۆ ئەوەی لە کەمەرە قایم بکرێت، نیفۆی بۆ کراوە. دۆخینی لە بەنی رەنگ یان لە هەمان قوماش بۆ دەهۆندرێتەوە یان دەدورێت. ئەوەی دوایی بەر لە بیست ساڵێک پەیدابووە.

**ستارخانی**

ئەوەندەی مرادخانی باو نییە. ژمارەی ئەوانەی رۆژانە لەبەری دەکەن، وەکو بۆم دەرکەوتووە، زۆر نییە(وێنەی ٩٠).

**کورتەک**ـ بەر و ئێلەی ستارخانی وەکو هی مرادخانییە. وەلێ شانەکەی

لە شانی چاکێتی پانتۆڵ دەچێت.
**شەرواڵ ـ** هەمان شەرواڵی مرادخانییە.

### رانک و چۆغەڵانی

یەکێکە لە باوترین جۆرەکانی کورتەک و شەرواڵ زۆر کەس لە شوێنی رانک و چۆغەڵ لە بەری دەکات(وێنەی ٩١). ئەوەی لەگەڵ مرادخانی لەسەر دەندرێت و لەبەر دەکرێت و لە پێ دەکرێت لەگەڵ رانک و چۆغەڵیش دووبارە دەکرێتەوە.
**چۆغەڵ ـ** ئیقەکانی، لەبەر ئەوەی قۆپچەی پێوە ناکرێت، لە کاتی لەبەرکردندا، لای ڕاست دەخرێتە سەر لای چەپ. ئەو جۆرەیان لە گشت وەرزەکانی ساڵدا لەبەر دەکرێت. وەلێ لە وەرزی زستاندا، لەبەر هەوا ساردی، فانیلەیەکی ئەستوور( خوری، دەزوو، سوف) ی لەگەڵ لەبەر دەکرێت.
**رانک ـ** هەمان شەرواڵی مراد خانییە.

### کەتافانی

ئەمەیان بەقەدر ئەوانەی سەرەوە، وەلێ لە نێوجەی بادینان، باوە(وێنەی ٩٢).
**کورتەک ـ** ئێقەی وەکو ئێقەی کراس بڕاوە و قۆپچەی پێوە نەکراوە. پارچە قوماشێکی لاکێشەیی بەقەدەر شانی زەلامی و بە دوو قەدی لە سەر هەنیشک پێوە دووروواوە. سەرەکە بۆ لای مل نووشتێندراوەتەوە. بە قۆپچەیەک قایم کراوە. ئەو جۆرەیان بە زۆری لە وەرزی هاوین لەبەر دەکرێت.
**شەرواڵ ـ** هەمان شەرواڵی مرادخانییە. وەلێ ئەوەندی ئەو فشوشۆڵ نییە.
پەیدابوونی کەتفی، کە لەبەر زۆر پیاوانی نێوچەی جوداجودا دەبندرێت، بۆ سەرەتای شەشتەکان روونتر دوای کردنی بە فۆڕمی(جلکی سەبازی) پێشمەرگەکانی کوردستان دەگەڕێتەوە. کەتفی لە هەندێ نێوچەدا، بە نموونە بارزان، بە خاکی ناسراوە.

**چاکەتانی**

پۆشاکی رۆژانەی هەندێ لە پیاوانی هەولێر و سلێمانییە و شوێنی دیکەیە(وێنەی ٩٣).

**کورتەک ـ** شانی کورتەکی چاکەتی، وەکو چاکەتی ئەوروپی کەتافەی بۆ کراوە. ئێقە و سنگی لە هی مرادخانی دەچێت.

**شەرواڵ ـ** هەمان شەرواڵی مرادخانییە.

چاکەتی، ئەگەر چی دەیان ساڵەیی لەبەر پیاوی کورد دەبیندرێت، وەلێ ئەوەندەی ئەو بیست ساڵەی دوای(مەبەست سەرەتای نۆهەتەکانە) باو نەبووە. فاکتەرکەی بۆ هەرزانی چاکەتی چینی دەگەڕێتەوە.

چاکەتی چینی، لەبەر ئەوەی بە قەدی پیاوی نابڕێت، و بە دووروواوی لە بازاڕ دەکرێت، لە دوورەوە هەست بە نامۆیی دەکەیت.

**کراسانی**

یەکێکە لە باوترین جۆرەکانی کورتەک و شەرواڵ لە نێو پیاوانی تەمەن سی ساڵیدا.

**کورتەک ـ** بەرگدوور لەسەر شێوەی کراسی پیاوان، دەیبڕێت و دەیدوریت. وەلێ چۆنییێتی قۆڵی کوورەتەکەی، بەرادانداز بڕیاری لەسەر دەدات. هەندێ کەس داوای سەردەستە (بوزمە) دەکات و هی ئەوهاش هەیە نایکات.

جۆرەکانی کراسی بە گوێرەی، پێوەکردن و پێوەنەکردن، قۆپچە:

* بە قۆپچە ـ پێنج قۆپچەیی(هەر پێنجییان بە ئێقەی دەستە ڕاست وەکراوە. نێوانیشییان وەکو یەک وایە) (وێنەی ٩٤).

* بێ قۆپچە ـ ئەمەیان قۆپچەی پێوەنەکراوە.

* بەزنجیر ـ ناوەکەی لەو زنجیرەی بە ئاتەکی کورتەکەکەوە دووروواوە، لە جیاتی قۆپچە، هاتووە.

**شەرواڵ ـ** هەمان شەرواڵی مرادخانییە.

مێژووی پەیدابوونی کراسی بۆ هەشتاکانی سەدەی بیستەم

دەگەڕێتەوە. ئەو زەمان پۆشاکی، لەبەر خۆشتری لە چاو مرادخانی، وەستای خانووبەرە و شوفێری لۆریەکانی ڕێگەی هەولێر و بەغدا بوو. پاشان خەڵکی دیکە لەبەری کرد.

**سنەیانی**

ئەوەندەی مرادخانی لە ناو پیاوان باو نییە. لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ پیاو لەبەری دەکەن (وێنەی ٩٥).

**کورتەک** ـ جیاوازی لەگەڵ مرادخانییدا لە ئێقەی دایە. هی ئەمەیان کورتە و هی ئەویان درێژە.

**شەرواڵ** ـ هەمان شەرواڵی مراد خانییە.

مێژووی پەیادبوونیشی لە ئەستانەکانی هەولێر و سلێمانی بۆ سەرەتایی نۆهەتەکانی سەدەی بیست دەگەڕێتەوە. بۆ ئەوکاتەی هاتوچۆ لە نێوان ئەم دیو و ئەو دیوی کوردستان ئاسانتر بووە. ناوەکەشی، لە ناوی شاری سنەی سەنتەری ئەستانی کوردستان هاتووە.

**شێخ مەحمودی(مرادخانی سلێمانی)**

یەکێکە لە باوترین کورتەک و شەرواڵ، بە تایبەتی لە نێوان پیاوانی سلێمانی (وێنەی ٩٦).

**کورتەک** ـ هەر یەک لە بەرسنگەکانی نۆ قوپچەی، کە نێوانیان پێنج سانتیمەترە، پێوەکراوە. بەرامبەر هەریەکەیان کونێکی نەکراوە، جگە لەوەی ژێرەوە، بۆ کراوە.

**شەرواڵ** ـ هەمان شەرواڵی مرادخانییە.

مێژووی پەیدابوونی بۆ بیستەکانی سەدەی بیستەم دەگەڕێتەوە. واتە ئەو کاتەی شێخ مەحموود مەلیکی کوردستان بوو. ناوەکەی لە ناوی ئەو پایەدارە هاتووە.

### ٣. پشتێن

پارچە قوماشێکی چیت یان کودەری چوار پێنج مەتر درێژە. پیاو لە سەر کورتەک و شەرواڵ لە ناو قەدی دەیبەستێت.

**پشتێن بەستان**

پشتێن بە دوو شێوە دەبەسترێت.

**قەف (گرێی)**- پشتێن بە قەدەر یەک دوو قەد دەکرێت. ئینجا لە پشتڕا دەخرێتە پشت و هەر سەرێکی بە دەستێکەوە(ڕاست بە هی ڕاست و چەپ بە هی چەپ) دەگیرێت. سەرەکان، ڕاست و چەپ و چەپ ڕاست، تاکو تەواو دەبێت، لێک دەئارێندرێن. ئەوەیان، بە زۆری لە نێوچە شاخاویەکاندا، باوە. فاکتەرەکەی بۆ سەختی هاتوچۆ(هەوراز نشێو. نشێو هەوراز) دەگەڕێتەوە. بەستن بەو شێوە سکی پیاو توند دەکات و پشت لە وەرگەران دەپاریزیت و هێز بە مرۆڤ دەدات.

عەشیرەتی بۆت لە نێوچەی گۆران ئەو شێوە بەستانەیان، لەبەر ئەوەی لە پشتی دراوسێ زیبارییەکان بینیویانە، بە زێباری ناوناوە.

**پان (بێقەف)** ــ سەرێکیی، بۆ ئەوەی توند بکرێت، لە نیفۆی شەرواڵ ڕادەکرێت. سەرەکەی دیکە بە دەوری قەد، تاکو تەواو دەبێت، دەئالێندرێت و سەرەکەی لە بەر پشتێنی ڕادەکرێت. هەندێ کەس، بۆ جوانی، قرفەێکی لە تەنیشتی ڕاستە دەکات. ئەوەیان بە زۆری لە نێوچە دەشتاییەکاندا، باوە. فاکتەرەکەی بۆ تەختی هاتوچۆ دەگەڕێتەوە. بەستن بەو شێوە، وەکو هی قەفی، سکی پیاو توند دەکات و پشت لە وەرگەڕان دەپارێزیت و هێز بە مرۆڤ دەبەخشیت.

پشتێن هاوێنان و پایزان، لەبەر بەرزی پلەی گەرما بە شەووڕۆژ ، کەمتر دەبەسترێت وەک ئەوەی لە زستان و بەهاردا. کورتەک و شەرواڵ بە پشتێنەوە جوانە. نەبەستی ئەو جوانەی ناهێڵێت.

**جۆرەکانی قوماشی پشتێن**

پشتێن لە قوماشی جۆراجۆر دەکرێت. هەندێک لە قوماشەکان کە لە

بازاڕەکانی هەولێر و شارەکانی دیکە دەفرۆشرێت ئەوانەی خوارەوەن:

**جورجێتی هیندی**ـ قوماشێکی تەنکی کەمێک لە دەست دڕە. ڕەنگی ڕەش و کەسک و شینی ئاسمانی و خۆڵێ نەخشێندراوی هەیە. پیاو چوار یان پێنج مەتری لەپشتی خۆ دەبەستێت.

**کێش**ـ جۆرێکی دیکەی قوماشی پشتێنە. پیاو دوو مەتری لە پشتی خۆی دەبەستێت.

**جەرسە** ـ قوماشێکی سپی گوڵ سۆری درشتە. پیاو، بە گوێرەی هەوهەس، چەند مەترێکی لە پشت دەبەستێت.

**غەرگە**

پایز و زستان بۆ خۆ پاراستن لە سەرما، لەسەر کورتەک و شەرواڵ لەبەری دەکرێت(وێنەی٩٧). غەرگە، لە پێستی بەرخ دروستی دەکرێت. وەلێ لەو ساڵانەی دوای، لەبەر کەمی پێست و زەحمەتی خۆشکردنی پێست، لە پارچەێکی وەکو پێستە دروست دەکرێت. غەرگە بە دەستی وەستایەکانی شاری موسڵی کوردستانی و دەوروبەرەکەی دروست دەکرێت و بۆ بازاڕی هەولێر و شوێنی دیکە دەهیندرێت.

**پەستەک**

پایز و زستان، بۆ خۆ پاراستن لە سەرما، لە سەر کورتەک و شەرواڵ لە بەری دەکرێت(وێنەی٩٨). پەستەک، بە دەستی کارگەچییەکانی ڕۆژهەڵات و باکووری کوردستان دروست دەکرێت. بەو دووایەیی لە چین، لەبەر هەرزانی، دەهێندرێت.

**قاپووت**

پایز و زستان بۆ خۆپاراستن لەسەرما لەسەر کورتەک و شەرواڵ لەبەر دەکرێت. قاپووت لە فابریکەکانی ئێران و تورکیا وچین و سوریا دروست دەکرێت. هی واش هەیە بە باڵ لە وڵاتانی ئەوروپا دەهێندرێن.

**کوڵەباڵ**

پایز و زستان بۆ خۆپاراستن لە سەرما، پیاوانی هەورەمان، لەسەر کورتەک و شەرواڵ لەبەری دەکەن. کارگەچی لە لوای ڕەنگ سپی

دروستی دەکات. بازرگانەکانیش، لەو ساڵانەی دوایدا، لە چین، لەبەر هەرزانی، دەیهێنن.

### کراس

پۆشاکی ژێر کورتەک و شەرواڵ لەسەر فانیلەی سپی لەبەر دەکرێت. کراس لە قوماشی رەنگاو رەنگ دەدورێت. دوو جۆری هەیە.
ء. **قۆڵدرێژ** ـ قۆڵی تاکو سەر مەچەک درێژە. سەرەکەی بوزمەی بۆ کراوە و بە دوو قۆپچە قایم دەکرێت. لە هەموو وەرزەکانی ساڵیشدا لەبەر دەکرێت.
ب. **قۆڵکورت** ـ قۆڵی تاکو هەنیشک درێژە. بوزمەی بۆ نەکراوە. هاوینان، بۆ فێنکی لەسەر شەرواڵ لەبەر دەکرێت.

### ٣. پێڵاو

جۆرەکانی پێڵاو بە گوێرەی مادەی لێوە دروستکراو ئەمانەی خوارەوەن:
**قایش** ـ لە قایشی پێستە و دەستکرد و هاوشێوەکانی دروست دەکرێت.
**لاستیک** ـ لە لاستیکی رەنگاورەنگ دروست دەکرێت(وێنەی ٩٩). هەندێ لادێی و کرێکار، لەبەر ئەوەی قوڕ ناگرێت و ئاسان خاوێن دەکرێتەوە، رۆژانە و بۆ ئیشی وەکو: قوڕکاری. چیمەنتۆرێژی. درووێنەی. شوانی. لە پێی دەکەن.
**سەرگەکا** ـ لە لاستیکی رەنگ رەش دروست دەکرێت (وێنەی ١٠٠). جاران لە پێستەی گا، هەر لەبەر هەندێکەش وایان ناو ناوە، بە دەستی دروست کراوە. سەرکەگا، لەبەر سووکی و هەرزانی و ئاسان لە قوڕ پاکردنەوە، خەڵکی بۆ ئیش و هاتوچۆ بە ناوکۆڵانەکانی گوند لە پێی دەکات.
**کلاش** ـ لە دەزوو و چاوپانی رەنگ سپی بە دەستی کلاشکەرانی هەورامان دەچیندرێت(وێنەی ١٠١). لە پێکردنی بە لای هەندێ کەس، لەبەر ئەوەی سووک و فێنکە لە هاویندا، لە پێڵاوی قایش و لاستیک خۆشترە. لە

پێکردنی لەگەڵ رانک و چۆغەڵ جوانێکی سروشتی دەبەخەشێت.
**سەرپێ (سۆل. نەعل)** ـ لە لاستیک و مشەما دروست دەکرێت. سەرپێ، بە زۆری پێڵاوی ناو ماڵ و حەمام و ئاودەستە. هەندێ کەس، لەبەر هەرزانی و سووکی و کراوەیی لە جیاتی پێڵاو لە پێی دەکات.
هەندێک لەو پێڵاوانەی کە ئێستا لەبەر ناکرێن و نەشماون ئەمان: یەمەنی سۆر. کڵاشی خوری بن قاڵتاغ. کڵاشی خوری بن لاستیک. کڵاشی قایشی بن لاستیک. رەشک.
**گۆریە (گۆرەوی)**- سێ چەشنە گۆریە هەیە.
ء. **دەزوو** ـ لە دەزوو و لە فابریکە دەچندرێت. گۆریەی دەزوو، لەبەر ئەوەی زۆر هەرزانە، سەرتاپی خەڵک لە پێی دەکەن.
ب. **سوف** ـ لە سوفی رەنگاو رەنگ کە لە بازاڕ لای دەزوفرۆشان دەست دەکەوێت دەچیندرێت. ژنان لە ماڵان بە شیش و سنارە، بۆ خۆ غافڵاندن، دەیچنن. ژمارەییێکی کەم لە پیاوان بە زستان لە پێی دەکەن.
پ. **خوری** ـ لە بەن دروست دەکرێت. ژنان لە ماڵان بە شیش و سنارە دەیچنن. سەرچاوەی بەنەکە جاجمێکی کۆنی هەڵوەشێندراوە. جاجمەکە ئەگەر هی خۆیان نەبێت لە لای ئۆترەقچی بە نرخێکی هەرزان دەکرێت. بەکارهێنانی گۆریەی خوری لە چوارچێوەێکی زۆر تەسکدایە.

### ۲. رانک و چۆغەڵ

یەکێکە لە باوترین پۆشاکی پیاوان.کرەکە ـ قوماشەکەی ـ لە مووی بزنی مەڕەز، کە جۆڵا بە پێچاڵ دەیچنێت، دەدورێت. زۆرتر لە جەژن و ئاهەنگ و یادەوری نەتەوەیی لە بەر دەکرێت(وێنەی ۱۰۲).
پۆشاکی پیاوێکی بە رانک و چۆغەڵ لەسەر بۆ پێ و یەک بە دوای یەک ئەمانەی خوارەوەن:
**کڵاو جەمەدانی**
هەمان ئەوانەن کە لەگەڵ مرادخانی لەسەر دەندرێن. باسییان، بۆ ئەوەی دووبارە نەبێتەوە، ناکەم.

**رانک**

هەمان شەروالّی مرادخانییە.

**چۆغەڵ**

هەمان کورتەکی کورتەک و شەروالّی رانک و چۆغەڵییە.

**کرەکانی رانک و چۆغەڵ**

کرفرۆشەکانی هەولێر کرەکان بۆ دوو بەش دابەش دەکەن.

**زاخۆیی ـ** ئەو کرانەیە کە لە نێوچەی دياربەکر لە باکووری کوردستان دەچندرێن.

**مەرگەیی ـ** ئەو کرانەیە کە لە نێوچەی مەرگە سەر بە قەزای دوکان دەچندرێن.

کرفرۆشەکانی سابوونکەرانی سلێمانیش، بە کەمێک جیاوازیەوە لە ناوەکان، کری بۆ دوو بەش دابەش دەکەن.

**زاخۆ ـ زاخۆ ـ** ئەو کرانەیە کە بە دەستی جۆلایەکانی زاخۆ دەچندرێن. نرخی ئەو جۆرە کرانە، لەبەر ئەوەی تەڵە مووەکانی باریکە و جوان چێندراوە، لە نرخی کری دیکە گرانترە.

**زاخۆ ـ رانیە ـ** ئەو کرانەیە کە بەدەستی جۆلایەکانی رانیە دەچندرێن. نرخی ئەو کرانە، لەبەر ئەوەی جیاوازی لە تهڵە مووەکان و چنینەکەی لەگەڵ ئەوەی سەرەوە هەیە، کەمێک هەرزانترە.

**رەنگەکانی رانک و چۆغەڵ**

هەندێک لە رەنگەکانی رانک و چپۆغەڵ ئەمانەن: خورمایی. شین. رەش. سپی. زەرد.

**٣. شەل و شەپک** (بەر گویز)

یەکێکە لە باوترین پۆشاکی پیاوانی ئەستانی دهۆک و هەندێ قەزای ئەستانی هەولێر(وێنەی١٠٣). کرەکەی لە مووی بزنی چوێر دەچندرێت. پۆشاکی پیاوێکی بە شەل و شەپک لەسەر بۆ پێ، یەک بە دوای یەک ئەمانەی خوارەوەن:

**کڵاو (کولاڤ)**

لە دەزوو دەچندرێت. دوو جۆری هەیە:

ء. **کـڵاوی بـە گوڵنـگ (بـە گفیـک)** ـ لـە دەزووی سـپی یـان شـین و سـپی دەچنـدرێت. گـوڵنگێکی گـەورەی لـە هـەمان رەنـگ، وەکـو دەسـتووری عەشیرەتی، بـە ناوەنـدی تـەپانەکـەی وەکـراوە. زێبـاری و سوورچییەکان لەگەڵ جەمەدانی رەش لەسەری دەنێن.

ب. **کڵاوی جزیـری** ـ لـە دەزووی سپی دەچنـدرێت. گوڵنـگ پێـوەکردن گوڵنـگ نـەکراوە بـە دەسـتوور. مزووریيـەکان لەگـەڵ جەمـەدانی سـۆر لەسـەری دەنێن.

**جەمەدانی**

وەکو ئەو جەمەدانییە کە لەگەڵ کورتەک و شەرواڵ لەسەر دەندرێت. جەمەدانی بە گوێرەی رەنگ دوو جۆرە:

ء. **جەمەدانی رەش** ـ ئەمەیان رەنگی چوار گۆشـەکانی نـاوی رەش و سپین. زێبـاری و هـەرکی و دۆسـکییەکان و گـەلێ عەشـیرەتی دیکـە لەسـەریان دەنێن.

ب. **جەمەدانی سۆر** ـ ئەمـەیان رەنگـی چوار گۆشـەکانی نـاوی سۆر و سپین. بارزانییەکان و گشت عەشیرەتەکانی کوردی ئێزیدی لەسەریان دەنێن.

**جەمەدانی بەستان**

ئەمـەیان بـە زۆری لـول دەدرێـت و بـە شـێوازی جوداجـودا، لەبـەر جیاوازی رەوشتی مرۆڤ، لەسەر دەئاڵێندرێت.

**شەڵ**

فۆرمێکی دوو لنگی درێژ و فشۆڵی هەیە. بەوە لە ڕانک جیا دەکرێتەوە نیفـۆی ، بـۆ تێهەڵکێشـانی دۆخـین و لەکـەمـەڕە بەسـتان، لەسـەرەوە بـۆ کـراوە. رۆخـی دەلینگـەکان، بـۆ جـوانی، بـە دەزووی رەنـگ سۆر و کەسک وشین دەنەخشێندرێت.

**شەپک**

هەمان فۆرمی چۆغەڵی هەیە. ئێقەکانی و سەر شانەکانی، بۆ جوانی، بە دەزووی رەنگ سۆر و کەسک و شێن دەنەخشێندرێت.

**بنتان**

ئەمەیان لە قوماش دەدورێت. پیاوانی بادینان ئارەزووی رەنگێ رەش یان قاوەیی دەکەن. ئێقەی بنتان بە قەیتان نەخشێندراوە. لە شوێنی قۆپچەی باغە قۆپچەی پشکۆشی بۆ دەکرێت.

**شال**ـ لە خوری یان دەزوو، بە دەستی جۆلای کورد ئێزدی نێوچەی باشیک و بەحزانی و کلدانەکانی ئەلقۆش دەچیندرێت. رەنگی سۆر و زەردی تەڵخە و رەنگی دیکەی هەیە. هەندێ کەس قایشی پشتی لەسەر شال لە پشتی دەبەستێت.

**شوتک**ـ لە قوماش دەدورێت. وەلێ هەردەم بە شێوەی قەف دەبەسترێت. هەر لەبەر هەندێکەش لە هەندێ ناوچەی بۆتان(گوندی دووسەرە) بە زێباری ناو دەبرێت.

**رەنگەکانی شەل و شەپک**

هەندێک لە رەنگەکانی شەل و شەپک ئەمانەن:

ئەسکۆیی. بادایی. بەکربەگی. بنەقشەیی. پشتپاز(شەکەری و خەزالی). بنەفشی. رەش ئاغایی. زەرد. سپی. سەماوی. سیس(لە نێوان زەرد و سپییە). سۆر. شەکری. شڕنەخی(سۆر و خەتی سپی) شین. کڕانی. کاچیتی.

نرخی دوورینی بەرگویز، بە مەکینەی دوورمانی، بەرگدووروەکان لە دهۆکێ سی هەزار دینارێک دەست هەق دەستێنن. بە دەستیش، لەبەر ئەوەی کارێکی وردە، تیارییەکان لە کۆمەڵگەی بیرسڤێ بە سەد هەزار دینار دەیدوورن.

شەل و شەپک، ئەو جارانەی کری مەڕەز دەست نەکەوێت یان کەسێک توانای کڕینی نەبێت لە قوماشی خاکی رەنگ مەیلەو سەوز یان بۆر دەیدورێت.

**کراس**

قۆڵەکانی کراس دوو جۆرە.

**ء. لەوەنـدیی ـ** لـە قوماشـی چاوپـان یـان خـەزنـە دەدورێـت. لـەوەنـدی، بـە گوێرەی پان و تـەسکی، دوو جۆرە: ١. مامـەشین ـ ئـەمـەیان پانـە. ٢. ئاسایی ـ پان نییە.

هـەنـدێ کـەس لـەوەنـدی لـە باسکی دەئـاڵێنێ. هـەنـدێکی دیکـە لـە قـۆڵی دەئاڵێنێ. هەندێکیش سەرەکانی لێک گرێدەدات و دەیخاتە پشت ملیەوە.

**ب. بوزمەیی ـ** وەکو بوزمەی هەر کراسێکی پیاوانە.

**دەرپێ ـ** لە قوماشی چاوپان یان خەزنە دەدورێت. بە گوێرەی رەنگ دوو جۆرە:

**ء. دەرپێی درێـژ ـ** ئـەمـەیان رەنگ سپی و بـێ خـەتـە. هـەنـدێ کـەس لـەژێر ئەوە دەرپێی کورت لە پێ دەکات.

**ب. بێجامە ـ** ئـەمەیان رەنگاو رەنگە و خـەتخـەتە. هەندێ کەس لـەژێر ئـەوە دەرپێی کورت لە پێ دەکات.

**ساقە (بەلەپێچ) ـ** هـەندێ پیاو، بۆ بـەلـەک پاراستن لـە سەرما، ساقـەی لـە پێ دەکـات. سـاقە شـلوخـەکی(چـل سـالێک لـەمـەوبـەر دووان) بیسـت سانتیمەترێک دریژ و سەر بە گیفکی، بۆ قایمکردن، پێوەیە.

**پێڵاو**

هەمان ئەو پێڵاوانەن کە لەگەڵ کورتەک و شەرواڵ لە پێدەکرێت.

هەندێک لەو پێڵاوانەی کە پەنجا ساڵێک بەر لە ئەورۆ لە پێ دەکران ئەمانە بوون: رەشک. کالک.

**٤. کەوا و سەڵتە**

ئـەمـەیان، تـاکو سـی سـاڵیک لـەمـەو بـەر، پۆشـاکی زۆرینـەی پیـاوانی گەرمییان بوو. ئەورۆ، تاکتاک لەبەر پیاوان دەبینـدرێت. بۆ روونکردنـەوە دەڵێم: پار(٢٩ ئەیلول ٢٠١٠) کاتژمێرێک لە ناو بازاری خانەقی چاوم گێرا تاکو پیاوێکی بە کەوا و سەڵتە(تەمەنی لە سەرووی شێست ساڵ) تێپەری

و وێنەیکەیم گرت(وێنەی ١٠٤). ئەوەندەی لە گەرمیان گەرام چاووم بە کەواو سەڵتە لەبەر گەنجێک نەکەوت. پۆشاکی پیاوێکی بە کەوا و سەڵتە لە سەر بۆ پێ، یەک بە دوای یەک، ئەمانەی خوارەوەن:

**کڵاو**

هەمان کڵاوی جەمەدانییە.

**هەوری**

هەمان جەمەدانییە. دەزووەکەی حەریرە و رەنگی رەشە.

**هەوری بەستان**

ئەمەیان بە قەدکراوی و کەمێک پان لەسەر دەئارندرێت. کلکەی بەسەر شۆڕ دەکرێتەوە.

**کەوا**

فۆرمێکی کراسێکی تاکو سەر گۆزینگانی هەیە. ئێقەی بیست سانتیمەترێکە و رۆخەکانی قەیتانی پێوە دووراوە. پشتملی، بۆ ئەوەی جوان رابوەستێت، کەمێک ئەستوورە و سفت دووراوە. قۆڵی بۆ ناکرێت، لەبەر ئەوەی سەڵتە یان چاکەتی لەگەڵ لەبەر دەکرێت.

**سەڵتە**

فۆرمێکی چاکەتی ئەوروپی هەیە. تاکو کەمەر درێژە. سەڵتە لە هەمان قوماش و ڕەنگی کەوا دەدورێت.

**قایش**

کەواو و سەڵتە وەکو کورتەک و شەرواڵ پشتێنی قوماشی لەسەر نابەسترێت. لە شوێنی ئەوە پشتێنێکی لە قایش بڕاو یان لە هەمان قوماشی کەوا و سەڵتە دووراو دەبەسترێت.

**کراس**

هەمان کراسی کورتەک و شەرواڵە.

کراسەکەی وەکو ئەوەیە کە لەگەڵ کورتەک و شەرواڵ لەبەر دەکرێت. دەرپێیەکە، کە رەنگی سپییە، درێژە.

**دەرپێ**

لە کەمەرەوە تاکو سەر گۆزینگان درێژە. لە چاوپانی یان شاخبازی ڕەنگ سپی دەدورێت.

**پێڵاو**

دوو جۆرە پێڵاو لە پێ دەکرێت.

**قایش** ـ هەمان ئەو پێڵاوانەی کە لەگەڵ کورتەک و شەرواڵ لە پێ دەکرێت.

**گیوە** ـ لە دەزووی سپی دەچندرێت.

**٥. چاکەت و زەبوون**

ژمارەیەک لە پیاوی کورد بە ئاین ئێزیدی لە قەزای شنگاڵ، بە تایبەتی لە ناو شار و ئەو گوندانەی کەوتوونەتە لای باشوور، چاکەت و زەبوونییان کردووتە پۆشاکی ڕۆژانەیان(وێنەی١٠٥) . بەو جلکەیان سیمای کورد بوونی خۆیان لە دەست داوە. کاتی چاوت پێیان دەکەوت پێت وایە عارەبن. وەلێ دوای ئاخەفتن دەزانی کوردن.

چاکەت و زەبوون لەبەرکردن بۆ هەندێ کورد جێگەی پرسیارە و بە چاوی سووک سەیر کردنە. بە نموونە، لە وەڵامی پرسیاری برادەرێکی من بۆ ناسیاوێکی خۆی لە ناو سەوزە فرۆشەکانی شارۆچکەی شنگاڵ لە١٧کانونی یەکەم٢٠١٠ ئەو جلە عارەبییە چییە لەبەرت کردووە؟ "بۆ عارەب ئەوەندە منبوذن". ئەویش" بۆ لە عارەب منبوذتر هەیە؟

پاساوی خەڵکەکە، وەکو گوێ بیست بووم، بۆ لەبەرکردنی چاکەت و زەبوون و لەسەرکردنی چەفیە و عەگال: تێبزربوون لە ناو نەتەوەکانی(عارەب. تورکمان) دەوروبەر. دووربوون لە غێچەڵی فەرمانبەرانی دەوڵەتی عێراق. هامشۆکردنی بازاڕی شاری موسڵ بە ئاسوودەیی. خۆنەگرتن بەرامبەر توانجە بەردەوامەکانی دەوروبەر.

پۆشاکی پیاوێکی بە چاکەت و زەبوون، لە سەر بۆ پێ، یەک بە دوای یەک، ئەمانەی خوارەوەن:

**چەفیە**

پۆشاکێکی چوار گۆشەی رەنگ سپی یان سوورە. بە سێ گۆشەیی (دوو لچک دەخرێتە سەر یەکتر) بەسەر دادەرێت.

**عەگال**

لە شێوەی کندرە و دوو قرفەیی و رەنگ رەشە. سەرەکانی گورینگێکی کلک درێژی پێوە کراوە. لەسەر چەفیە لەسەر دەندرێت.

**چاکەت**

هەمان چاکەتی چاکەت و پانتۆڵی ئەوروپییانییە.

**زەبوون**

کەواییێکی بێقۆڵی بە قەد بەژنی زەلام درێژە. کاتی لەبەرکردندا لای چەپی دەخرێتە سەر لای ڕاست. لە ناوەڕاستدا، بۆ ئەوەی نەکرێتەوە، قۆپچەی پێوەکراوە.

**کراس**

هەمان کراسی چاکەت و پانتۆڵی ئەوروپییانییە.

**قایش**

لە چەرم یان لە قوماش دروست دەکرێت. لە ناوقەد و لەسەر زەبوون، دەبەسترێت.

**دەرپێ**

هەمان دەرپێی کەوا و سەڵتەیە.

**پێڵاو**

هەمان پێڵاوی کەوا و سەڵتەیە.

**٦. چاکەت و کراس**

ئەمەیان پۆشاکی هەندێک لە کورد بە ئاین ئێزیدی شارۆچکەی شنگاڵ و دەوروبەرێتی (وێنەی ١٠٦). پۆشاکی پیاوێکی بە چاکەت و کراس لەسەر بۆ پێ و یەک بە دوای یەک ئەمانەی خوارەوەن:

**چەفیە**

هەمان چەفیەی چاکت و زەبوونە.

**عەگال**

هەمان عەگالی چاکەت و زەبوونە.

**چاکەت**

هەمان چاکەتی چاکەت و زەبوونە.

**کراس**

هەمان کراسی چاکەت و زەبوونە.

**حەورانی (فەروە)**

زستانان، بۆ خۆ پاراستن لە سەرما، لەسەر چاکەت و کراس بە خۆ دادەرێت. بەرەکەی پێستەی بەرخی یەک ساڵانە. رووەکەشی قوماشێکی رەشە.

**پێڵاو**

هەمان پێڵاوی چاکەت و زەبوونە.

**٧. دەمیر و زەبوون**

ئەمەیان، بە مۆتیڤی ئاینی، بۆ بابێ شێخ و بابێ چاویش و پێش ئیمام مەرگەه و پێش ئیمام بابێ شێخ و پێش ئیمام بابێ گاڤان(پێنج پایەیی یەکەم لە ئاینی ئێزیدیدا)، لە قوماشی رەنگ سپی و وەکو یەک دەدورێت.

ئەم ئێزیدینە
جلک سپینە
بە هەشتینە

پۆشاکی بابێ چاویش،(پیر شەرۆ پیر فرمان) کە خۆم لە پەرستگەی لالش ناوەکانییانم لێپرسی، لە سەر بۆ پێ، ئەوانەی خوارەوەن: (وێنەی١٠٧).

١. کولک(کڵاوی خوری)ـ لە لوا دروست دەکرێت. رەنگی رەش و قاوەییان هەیە.

٢. شاش (مەندیل) ـ حەوت کەڕەت (ئەم نمرە لەگەڵ نمرەی چوار لای ئێزیدییەکان پیرۆزە) بە دەوری کولک دەسوڕێتەوە.
٣. دەمیر
٤. زەبون
٥. بنتان
٦. کراس
٧. رستە
٨. دەرپێ

**٨. دەمیر و بنتان**

ئەمەیان پۆشاکی فەقیرە (پایەیی دووەم لە ئاینی ئێزیدیدا). پۆشاکی فەقیر حجی فەقیر شەمۆ، کە خۆم لە پەرستگەی لالش ناوەکانییانم لێپرسی، لەسەر بۆ پێ و یەک بە دوای یەک ئەمانەی خوارەوە بوون (وێنەی١٠٨). ئەو پۆشاکە لە قوماشی رەنگ رەش و مەیلەو کەسک دووراوە.

١. کولک (کڵاو) ـ لە لوا دروست دەکرێت. رەنگی رەشە.
٢. رەشک ـ دوو قەد بە دەورەی کولک دەسورێتەوە.
٣. دەمیر
٤. بنتان
٥. غەرگە ـ لە خوری دەچندرێت.
٦. شەرواڵ ـ کەمێک لە شەرواڵی کورتەک و شەرواڵ گورچترە و کورترە.
٧. دەرپێ ـ لە چاوپانی سپی یان هاوشێوەی دەدورێت.
٨. مەفتول ـ بەنێکی ڕەشە لە مل دەکرێت.

**دووەم. پۆشاکی ژنان**

مەبەست گشت ئەو پۆشاکانەیە کە ژنانی کورد رۆژانە یان ناوەناوە لە سەری دەنێت یان لەبەری دەکات یان لە پێی دەکات.

**١. کراس و ئێلەک**

یەکێکە لە باوترین پۆشاکی ژنان. لە قوماشی تەنکی رەنگاورەنگ دەدورێت (وێنەی ١٠٩).

**کراس** ـ بە قەدەر بەژنی ژن درێژە. لە قوماشی رەنگاو رەنگ دەدورێت. قۆڵەکانی تاکو سەر زەند درێژە.

**ئێلەک (سوخمە)** ـ لەسەر کراس لە بەر دەکرێت. بێ قۆڵە و تاکو بەر مەممکانیش درێژە. رەنگی سوخمە هەر دەم لە هی کراس جودایە. رەنگەکان بەو شێوە جۆت کراون: زەرد ـ رەش. پەمبە ـ کەسک.

**چەفیە** ـ پارچە قوماشێکی لاکێشەیی شلکە. بۆ پرچ (قژ) و مل داپۆشین بەسەر دادەرێت.

**ئەتەک** ـ تاکو چۆکان درێژە بۆ داپۆشینی لەش لە ژێرکراس لەبەر دەکرێت. رەنگ و قوماشی ئەتەک و ئاوەڵکراس هەردەم وەکو یەک بووە.

**ئاوەڵکراس** ـ لە ژێر کراس و ئەتەک، بۆ داپۆشینی قاچ و قول لە بەر دەکرێت. کۆتایی دەلینگەکان، بۆ تێهەلکێشانی تیلمە قوماشێکی باریک چەند کونیان تێدەکرێت.

**٢. کراس و کەوێ**

یەکێکە لە باوترین پۆشاکی ژنان. لە قوماشی تەنکی رەنگاورەنگ دەدورێت (وێنەی ١١٠).

**کراس** ـ بە قەدەر بەژنی ژن درێژە. قۆڵەکانی تاکو سەردەستانە. پارچەیەکی بە درێژی مەترێک، کە پێی دەڵێن ئەنگوچک، لە سەردەستە پێوە دووروواوە. ژنان هەردوو سەرەکان لێک گرێ دەدەن. ئینجا، بۆ ئەوەی لە پشتەوە لەسەر عەری نەخشێت، بەسەر شانییان دادەدەن.

ئێقەی، سێ قۆپچەی لە ڕاست پێوە دووروواوە. هەر قۆپچەیەک کونێکی لە لای چەپ بۆ کراوە. ژنان پارچە پەرۆکێکی لولدراوی بارێک لە سەر کراسەکە و لە ژێر پەراسوو، بۆ دەرخستنی مەمک، بەستووە.

**کەوێ** ـ بە قەد بەژنی ژن درێژە. قۆڵەکانیشی هەمان شت درێژن. ژنان

لەسەر کراس لە بەری دەکەن.
**چەفیە ـ** پارچە قوماشێکی لاکێشەیی شلکە. بۆ پرچ(قژ) و مل داپۆشین بەسەر دادەرێت.
**ئاوەلکراس ـ** لە دوو پارچە قوماشی رەنگ جودا دروست دەکرێت. لەژێر کراس لە پێ دەکرێت.

**٣. کراس و کورتەک**

یەکێکە لەو پۆشاکانەی کە هەندێ ژنی بەتەمەن، بە تایبەتی ئەوانەی باکگراوندیان دێ بووە. لەبەری دەکەن(وێنەی ١١١).

**کراس**

ئەمەیان دوو جۆرە

**کراسی بە باغەر ـ** ئەمەیان دوو کەرەت و نیو لە بالای ژن درێژترە. زیادەکەی، بۆ ئەوەی لە عەردی نەخشێت و جوانی ببەخشێت، لە ژێر پەرۆکی پشت (پشتێنۆکە؟) هەڵدەکێشرێت و بۆ سەرپێ شۆر دەکرێتەوە. کراسەکە لە ژێر مەمکەوە تاکو پێ سێ قەد لەسەر یەکە. قۆڵەکانی بە ئەنگوچکە. سەرەکانی، بۆ ئەوەی لەسەر عەردی نەخشێت، پێکەوە گرێ دەدرێن و دەخرێنە پشتەوە. ئێقەی بۆ ئەوەی بە هەردوو رووەوە لەبەر بکرێت، لە پێش و لە پاش، بۆ کراوە. ئێقەکان، پزدارن و دەزووێکی کەمێک ئەستووریان، بۆ سنگ و بەرۆک داپۆشین، تێهەڵکێشراوە. سەری دەرزووەکان، بۆ چاو و زار و نەفەسی پیس، دوو پیرۆزەی پێوەکراوە. کراسی بە باغەر، جاران، لە کودەری رەنگاو رەنگ دەکرا. ئێستا تەنیا لە چیتی هندی رەنگ رەش دەدورێت.

کراسی بە باغەر، لای هەندێ ژنی بە سالاچوانی کەندێناوە، باوی جارانی ماوە. هەندێ ژن، بە نموونە، سەبیحە لە دیبەگە و عەدلێ لە سەر گەڕان، جگە لە کراسی بە باغەر جۆرێکی دیکەی لە بەر ناکەن.
**کراسی بێ باغەر ـ** هەمان ئەو کراسەیە کە لەگەڵ کراس و کەوێ لەبەر دەکرێت.

**کورتەک** - پۆشاکێکی زستانەی تاکو ناو قەد درێژە. لەسەر کراس لەبەر دەکرێت. ئاتەکەکەی قوماشی قەدیفەی سیم و هی قەدیفەی ڕەش و ئەسفەنجی گوڵبەسیمە و سەفت دووراوە. وەلێ قۆپچەی پێوە نەکراوە. بەر و پشتی کورتەک و قۆڵەکانی لە قوماشی چیت و هی کودەرییە. دوو بەرکی بچووک بۆ لە بەری ئاتەکەکان کراوە. بەرکێکی دیکەشی وەلێ لە وان گەورەتر لە پشتەوە و لە خوارەوەی دامێنی لای دەستە ڕاست، بۆ کراوە. پشت و قەبرغەی کورتەک، بۆ گەرمی، پەمۆی تێدەکرێت. قۆڵی کورتەک تاکو نیوەی بە پەمۆیە. نیوەکەی دیکە پشتەکەی قەدیفەیە و بەرەکەشی قوماشی هەترەسە. ڕۆخی ئاتەک، بە قەیتانی سپی یان بەنی سوفی ڕەنگ سۆر و شین، نەخشێندراوە.

**چارۆگە** - پارچە قوماشێکی لاکێشەی ڕەنگ ڕەشە. ژنان لەسەر کراس و سەڵتە، بۆ داپۆشینی سنگ و قاچ و قول، بە خۆیان دادەدەن. دوو لچکی چارۆگە، ئەوەی چەپ لەسەر شان و ئەوەی ڕاست لە ژێر هەنگڵ لە پشت مل لێک گرێ دەدرێت. چارۆگەم لەبەر ژنێکی بەتەمەنی نێوچەی قادر کەرەم بێنیووە.

**بەرامپیل (بەرهەڵبێنە)** - پارچە قوماشێکی چوارگۆشە وەیا لاکێشی ڕەنگ ڕەشە. ژن ڕاست و چەپ، بۆ ئەوەی کراسی لە ئیشکردن(نانکردن. هەوێز ماڵین. شت بەباکردن و لە بێژینگدان) دا، بە تۆز نەبێت، لە ملی خۆی دەکات. ڕووەکەی بەسەر سینگەوە شۆڕ دەبێتەوە بۆ سەر پێیان.

**ئاوەڵکراس**

ئەمەیان لە دوو پارچە قوماشی جودا بە ڕەنگ و باش و خراپ دەدوورێت.

**کودەری** - بەشی سەرەوەی ئاوەلکراس، واتە لە چۆک بۆ کەمەرە، لەو قوماشە دەدورێت. سەرەکەی، بۆ تێهەڵکێشانی لاستیک، نیفۆی بۆ کراوە.

**ئەسفەنجی گوڵ بەسیم** - بەشی خوارەوەی ئاوەلکراس، واتە لە چۆکەوە بۆ گۆزینگ، لەو قوماشە دەدورێت. ڕەنگەکەی پەمبە و سۆر و کەس و مۆرە. دەلینگی ئاوەلکراس، بۆ تێهەڵکێشانی لاستیک، پزی بۆ کراوە.

**پێڵاو**
ئەمەیان، لە قایش و لاستیک و هاوشێوەکانی، دروست دەکرێت.
**پێڵاوی قایش** ـ مەبەست گشت ئەو پێڵاوانەی کە لە قاش و هاوشێوەکانی لە کارگەکانی پێڵاو دروست دەکرێت.
**پێڵاوی لاستیک** ـ ژنانی بەتەمەنی لادێ و دەست کورتەکانیان، لەبەر هەرزانی و نەرمی و خاوێنی و سوکی، لە جیاتی قۆندرەی قایش و بۆ ئیشوکار لە پێی دەکەن.
**سەرپێ** ـ هەمان سەرپێی پیاوانە. وەلێ فۆڕمەکەی، بۆ ئەوەی لەگەڵ رەوشتی مێینە بێتەوە، ناسکترە.

**٥. کراس و سەڵتە**

پۆشاکی تاکتاک ژنانی بەتەمەنی گەرمییان و سلێمانی و شوێنی دیکەیە. پۆشاکی ژنیک(پورە گوڵنار) ی، قادرکەرەم، بەو شێوە بوو (وێنەی ١١٢).
**سەرووبەست** ـ پارچە قوماشێکی تەنکی مەیلەو رەشە. ژنان لەسەر بن مل لە سەریان دەبەستن.
**بن مل (لەچک. چەفیە)** ـ پارچە قوماشێکی تەنکی مەیلەو رەشە. ژنان بۆ داپۆشینی پرچ، بەسەریان دادەدەن.
**سەڵتە** ـ رووی ئەو پۆشاکە قوماشی مەخمەلی رەنگ مۆرە. بەرەکەشی کودەری یان جورجێت یان شتێکی دیکەی لەو بابەتەیە. دوو قۆڵی درێژی پێوە دووروواوە. ئێقەی کراوەیە.
**کراس** ـ وەکو ئەو کراسەیە کە ژنان لەگەڵ ئێلەک و کەوێ لەبەری دەکەن. وەلێ قوماشەکەی جورجێت و هاوشێوەکانییە.
**کەوێ (کەوا)** ـ وەکو ئەو کەوێیەیە کە ژنان لەگەڵ کراس لەبەری دەکەن.

**٦. کراس و دەمیر**

پۆشاکی ژنانی کورد بە ئاین ئێزدی شێخان و شنگاڵ و شوێنی

دیکەیە. پۆشاکی ژنێک (دلڤین) ی، کۆمەڵگای شاریا، بەو شێوە بوو (وێنەی ١١٣).

**مێزەر -** پۆشاکێکی رەنگ سپی لە خوری چێندراوە. ژنان دوو لچکی لەسەر شانی ڕاست لێک گرێ دەدەن. ئەویدیکەی لە بن هەنگڵی چەپ بەردەدەنەوە.

**دەمیر-** چاکەتێکی رەنگ رەشی لە قوماشی قەدیفە دووروواوە.

**کراس -** پۆشاکێکی رەنگ سپی قۆڵ کورتی بە قەد بەژن درێژە. لە ژێر مێزەر لەبەر دەکرێت.

**شوتک -** قوماشێکی رەنگاو رەنگی کەمێک ئەستوورە و لە دەزوو چێندراوە. ژنانی بە تەمەن لەسەر کراس و لە ناو قەدیان دەبەستن.

**شەلەم -** تیلمە قوماشێکی رەنگاورەنگە. کچان، لە جیاتی شوتک، لەسەر کراسی و لە ناوقەدیان دەبەستن.

**ئاوەڵ کراس -** پۆشاکێکی لە ناو قەد بۆ پێ درێژە. لە ژێر کراس لە بەر دەکرێت.

**کۆمک -** دوو جۆری هەیە:

**کۆمێ سپی -** جۆرە کڵاوێکە لە قوماشی سپی دووروواوە. ژنانی بەتەمەن لەسەری دەنێن.

**کۆمێ دراڤێ -** جۆرە کڵاوێکە لە قوماشی رەنگ رەش دووروواوە. تەپڵەکەی بە پارە داپۆشراوە. پارەکە یەک بە دوای یەک و بە شێوەی بازنە لە کۆمەکە دووروواوە.

**رەشک -** چەفیەێکی رەنگ رەشی چوارگۆشەی یەک مەتریە. لولدەدرێت و لە کۆمک دەئاڵندرێت.

**دەرزیک -** سەرێکی زەنگیانەێکی خڕی رەنگاو رەنگ(سۆر، زەرد، کەسک، شین) ی پێوەیە. سەرەکەی دیکەی تێژە. قەفی رەشکی، بۆ ئەوەی خاو نەبێتەوە، پێ قایم دەکرێت.

**دەرزیا زێڕی -** زنجیرەیەکی درێژی پەپولەدارە. بە لای چەپی رەشک، بۆ جوانی، وەدەکرێت.

**گوڤگ**ـ شەش دانە گوڤگی کلک درێژی رەنگ رەشی لە دەزوو یان خوری هوندراوە، بۆ جوانی، بە رەشک وەدەکرێت. گوڤگەکان وەکو کەزی شۆڕ دەبنەوە.

**چەفیە** ـ پۆشاکێکی چوارگۆشەی رەنگ سپی لە خوری چێندراوە. ژنان بەسەری خۆیان دادەن و کۆمی لەسەر دەنێن

**پێڵاو**

هەمان ئەوانەی کە ژنانی کورد لە شوێنی دیکە لە پێیان دەکەن.

**ژێربابەتی ٢. پۆشاکی سەردەمیانە**

مەبەست ئەو پۆشاکانەیە کە بە بڕین و دوورین و تەسک و بەرین و گەورە و بچووکی لە هی ترادیسیۆنی جودایە. واتە گشت ئەو پۆشاکانەی کە ئەورۆ لە سەرانسەری جیهاندا لەبەر دەکرێن.

**یەکەم. پۆشاکی پیاوان**

هەندێک لە پۆشاکی پیاوان ئەمانەن.

**١. چاکەت و پانتۆڵ**

کارمەندانی دەوڵەت، بە حوکمی کارەکەیان، ساڵەهای ساڵە، ئەم پۆشاکەی لەبەردەکەن. وەلێ خەڵکی رەمەکی تاکو کۆتایی هەشتاکانی سەدەی (سەردەمی ڕاگوستن) بیستەم، لەبەر فیز لێدان لەبەریان نەدەکرد. ئەورۆ، کارەکە سەرەوبن بووە، ئەوەی لەبەری نەبێت بە دەشتەکی(بە مانای نیگەتیڤەکەی) لە قەڵەم دەدرێت. پۆشاکی پیاوێکی بە چاکەت و پانتۆڵ لەسەر بۆ پێ و یەک بە دوای یەک ئەمانەی خوارەوەن:

**چاکەت**

لەسەر کراس لەبەر دەکرێت ویەک جۆری هەیە. هاوینان، لەبەر گەرمی هەوا، کەمتر لەبەر دەکرێت.

**پانتۆڵ**

پۆشاکێکی دوو لنگییە و یەک جۆری هەیە. بە درێژایی ساڵ لەگەڵ چاکەت یان کراس لەبەر دەکرێت.

**کراس**

دوو جۆرە هەیە.

ء. **قۆڵ درێژ** ـ بەقەدەر قۆڵ درێژە. سەرەکەی بوزمەی بۆکراوە و بە قۆپچە قایم دەکرێت.

ب. **قۆڵ کورت** ـ قۆڵی تاکو هەنیشک درێژە. زۆرتر لە هاوینان، لەبەر گەرمی هەوا، لەگەڵ پانتۆڵ لەبەر دەکرێت.

**قەرەوێتە(بۆین باغ)**

قوماشێکی رەنگە و لەسەر پشتملی کراس دەبەسترێت.

**پێڵاو**

ئەمەیان بریتییە لە پێڵاو(قایش و لاستیک) و سەندەڵی(پێڵاوی پەنەجە رەدار) و کاڵە و سەرپێ و کڵاشی دەزووی چینی و گۆریە و شتی دیکەی لەو بابەتانەوە.

**دووەم. پۆشاکی ژنان**

مەبەست ئەو پۆشاکانەیە کە بە بڕین و دوورین و تەسک و بەرین و گەورە و بچووکی لە هی تراديسيۆنی جودایە. واتە گشت ئەو پۆشاکانەی کە ئەورۆ لە سەرانسەری جیهاندا لەبەر دەکرێن.

۱. **کۆستم**

جۆرەکانی کۆستم ئەمانەن:

ء. **چاکەت و پانتۆڵ**

ئەمەیان، دوای هاتنی ژنان بۆ ناو مەیدانی کارکردن لە دەرەوەی خیزان بە تایبەتی لە فەرمانگەکانی دەوڵەت وەکو قوتابخانە و نەخۆشخانە و نەساغخانە و کاروباری کارگێڕی و هەندێک شوێنی کاری

کەسی وەکو ئارایشگا و دیتنی ئەوروپا لە کەناڵەکانی تەلەڤزیۆندا، بوو بە پۆشاکی بەشی هەرە زۆری ژنانی کورد لە ماڵەوە و لە ئیش و بازاڕدا. پۆشاکی ژنێکی بە چاکت و پانتۆل لەسەر بۆ پێ و یەک بە دوای یەک ئەمانەن:

**کڵاوی بن رەفتە**

لە ژێر رەفتە لەسەر دەندرێت. رۆخەکەی بە زەنگیانە یان قەیتان نەخشێندراوە. قوماشەکەی سادەی یەک رەنگە. بە نموونە: سۆر و رەش و مۆر و هیدیکە.

**رەفتە (چەفیە. لەچکە)**

لە قوماشی حەریر یان سەتەن(سیرە) دچندرێت و قژی پێ دادەپۆشرێت. پێشەکەی بۆ ئەوەی رەق بوەستێت و بەر چاو نەگرێت ئیشاعەی رەفتەی دەخرێتە ناوەوە.

**جۆرەکانی رەفتە:** لاکێش و سی گۆشە.

**رەنگەکانی رەفتە:** دوو جۆری سەرەکی هەیە

**ء. رەفتەی سپی** ـ ژنانی بە تەمەن و ئەوانەی لە خەڵکی دیکە زیاتر خۆیان نوقمی ئاین کردووە، ئەو رەفتەی بەسەریان دادەن و بە هەموو لایێک شۆڕی دەکەنەوە و شان و بەرۆکییان پێ دادەپۆشن. لە ژێر چەنەگە بە قولابە(سنجاق. دەرزی دوولک) ، بۆ ئەوەی نەخزێت، لێکی دەبەستن.

**ب. رەفتەی رەنگاوڕەنگ** ـ ژنانی گەنج و کچان، رەفەی رەنگاو رەنگ دەبەستن.

**رەفتە بەستان**

بە دوو شێوە دەبەسترێت.

**عارەبانی** ـ لچکێکی رەفتەکە دەخرێتە سەر و لچکەکەی دیکە بە ژێر چەنەگە لە سەر دەئاڵێندرێت. ئەمەیان سیمایێکی عارەبی بە ژنی کورد

دەبەخشیت. هەر چەندی بە خەیاڵیش دادێت لە کولتووری کورد دوورە.
**تورکی** ـ رەفتەکە دەخرێتە سەر و لچکەکانی لە پشتمل گرێ دەدرێت. ئەمەیان، ئەگەر چی لە عارەبانی مۆدێرنترە، وەلێ سیمایێکی تورکی بە ژنی کورد دەدات
**ئاسایی** ـ رەفتەکە دەخرێتە سەر و لچکێکی شۆڕ دەکرێتەوە و لچکەکەی دیکە دەهاویشترێتە سەر پیلی چەپ. ئەمیان، ژنی کورد لە سیمای کوردی بە دوور ناگرێت.

ژنی کورد، وەکو ئەرکێکی نەتەوەیی، دەبێت رەفتە بە شێوەیەک ببەستێت لە هی ژنانی عارەب و تورک نەکات. هەروەها پێویستە لاسای ژنانی لادێ، لەبەر ئەوەی کوردانە دەیبەستن، بکرێتەوە.

**چاکەت**

لە چاکەتی پیاوان دەکات.

**پانتۆڵ**

لە پانتۆڵی پیاوان دەکات.

**ب. چاکەت و تەنوورە**

**چاکەت** ـ هەمان چاکەتی پانتۆڵە.
**تەنوورە** ـ کراسێکی لە کەمەرە بۆ پێیە و لەکەمەرە، بۆ ئەوەی نەکەوێت، قایم دەکرێت.

چاکەت و تەنوورە لە وڵاتەکانی تورکیا و سوریا و وڵاتی دیکە، بۆ بازاڕەکانی کوردستان دەهاوردرێت. چاکەت و تەنوورە، پۆشاکێکی زۆر نۆرمالە.

**پ. چاکەت و عەزیە**

چاکەت ـ هەمان چاکەتی پانتۆڵە
عەزیە ـ کراسێکی درێژە تاکو سەر گۆزنگان.

**کراس و ئاوەلکراس**

هەمان ئەو کراس و ئاوەلکراسانەیە کە لەگەڵ جل و بەرگی دیکەی ژنان لەبەر دەکرێت.

هەندێ ژنی کورد، ئەوانەی نوقمی کولتووری عارەب بووێنەیەی، لەسەر کۆستم، بۆ داپۆشینی لەشییان، پۆشاکی دیکە، وەکو ئەمانەی خوارەوە، لەبەر دەکەن:

**مانتۆ** ـ پۆشاکێکی تاکو چۆکان درێژە و، بۆ داپۆشینی لەش، لەسەر کۆستوم لەبەر دەکرێت.

**تابووت (جوبە)** ـ پۆشاکێکی بە قەد بەژن درێژە. ڕەنگی، وەلێ تەڵخ، جۆراوجۆری هەیە. هەندێ ژن، بۆ داپۆشینی سنگ و مەمک و قاچ و قوڵ، لەسەر کۆستم یان چاکەت و تەنوورە لە بەری دەکەن. تابووتی خەلیجی و سوری و تورکی لە بازاڕ دەست دەکەوێت. تابووت ئەوەندەی حەزبکەیت لەبەر دڵان گران و لە کولتووری کورد نامۆیە.

**گۆریە (گۆرەوی)**

جۆرەکانی گۆریە ئەمانەن:

**گۆریەی کورت** ـ بە قەدەر پێیە و تاکو بن گۆزینگان درێژە.

**گۆریەی درێژ**ـ بەقەدەر پێیە و تاکو کراوەی چۆکان درێژە. لە دەزووی ڕەش دەچندرێت. بێنەخش و بەنەخشییان هەیە.

**پێڵاو**

جۆرەکانی پێڵاو ئەمانەن:

**ئاسایی** ـ بەقونپانی ( بەرزی باریک. نزمی ئەستوور). بێقونپانی (تەخت. فلات). بەئاوەزینە. بێئاوەزینە. پێڵاوی بەقەیتان، بۆ ژنان، نەکراوە بە ڕەوشت. پێڵاوی ئاسایی لە قایش( ئاژەڵی و دەستکرد) و هاوشێوەکانی

دروست دەکرێت.

**بابووج** ـ بەسەر تاکو گۆزینگان ئەمەیان لەبەر ساردی، لە زستانان کەمتر لە پێ دەکرێت.

**نەعل (سەرپێ. سۆل)** ـ سەرەکەی تیلمی قیلنقاچ(ڕاست و چەپ) ە. لە هەموو وەرزان لە پێ دەکرێت.

هەندێک لەو پێڵاوانەی کە جاران بۆ گەرماو و سەرشۆر لە پێ دەکران و ئەوڕۆ لە مۆزەخانە نەبێت لە شوێنی دیکە ناکەونە بەر چاوان، قاپقاپی دار بوو.

**٢. ماکسی و خەلیجی**

لە خوارەوە باسی هەردووکییان دەکەم

**ماکسی**

پۆشاکێکی ئەوروپییانەی بە قەد بەژن درێژە. لە قوماشی جۆراوجۆر و رەنگاورەنگ دەدورێت. ژنانی کورد، بە پیروجاحێڵەوە، لە باتی کراسی کوردی لەبەری دەکەن.

**خەلیجی**

پۆشاکێکی بە قەد بەژن درێژە. رەنگ تازییەیە و لە قوماشی سرکە دەدورێت. سەردەستەکان و دامێنەکە و هەندێ کەڕەت پشتەکەشی، بە سیم نەخشێندراوە. ژنان، بۆ داپۆشینی لەش، لەسەر ماکسی لەبەری دەکەن. خەلیجی لە سوریا و تورکیا و وڵاتانی خەلیج، لە قوماشی تایبەتدەدورێت. خەلیجی، بۆ کولتووری کورد، لە خۆی ملەوەزتر پەیدا نابێت.

پۆشاکێکی کوردی بە ناوی کەوێ، کە سەدان ساڵە ژنانی کورد لەسەر کراس لەبەری دەکەن و هەموو لایێکمانیش پێی ئاشنایین و دەقاودەق لەگەڵ کولتووری کوردی دێتەوە، هەر بۆیەش پێویستە لە شوێنی خەلیجی لەبەر بکرێت.

# سەربابەتی حەوتەم
## خشڵ و ئارایش

**ژێربابەتی ١. خشڵ**

مەبەست گشت ئەو شتانەیە لە زێڕ و زیو و شوشە و باغە و دار و بەرد و کەلەشاخ و هاوشێوەکانییان لای زێڕنگر و لە فابریکان بۆ ژنان و پیاوان دروست دەکرێت. چەشن و فۆرم و بەهای خشڵەکان، جگە لەوەی کە بۆ جوانی بەخۆوە وەدەکرێت و لە دەست و پێ دەکرێت، توانای مادی و پایەیی کۆمەڵایەتی و شێوەی بیرکردنەوە و کولتووری کەسەکان دەردەخات. خشڵی بە گوێرەی جنس بۆ دوو بەش دابەش دەکەم و شییان دەکەمەوە.

**یەکەم. خشڵی ژنان**

ژنانی کورد، وەکو هاوجنسەکانی نەتەوەکانی دیکەی رۆژهەڵات، خووی خۆیان داوەتە خشڵ. کاتی شووکردن، پێش هەموو شتێک باس لە ئەوەندە زێڕەی دەکەن کە پیاو دەبێت بۆیان بکرێت.ماڵی کچە بە شانازییەوە باس لە موئەخرە(بە گوێرەی رێکەوتن) و موقەدیمە(نۆزدە میسقال) ی کچەکەیان دەکەن. هەر چەندی زۆرتر بێت ئەوەندە زیاتر خۆیان، گەورەتر دێتە بەرچاو. خشڵی ژنان، بۆ ئەوەی نەخشەییێکی گشتی بخەمە بەر چاو، بۆ سێ گروپ دابەش دەکەم.

**ء . سەر و مل**

خشڵەکانی سەر و مل، ئەوەندە زۆرن لە حساب نایەن. ناوی هەندێک لە خشڵەکان، لە هەموو نێوچەیەکدا وەکو یەک نییە. من باسی ئەوانەی لای ژنان و لای زێڕنگران دیومن دەکەم.

**گوارە**

نەرمکی گوێچک، بۆ ئەوەی گوارەی تێهەڵکێشرێت، بە دەرزی دورمان یان مەکینەی گوێ سمکردن دەسمدرێت. گوارە لە ئەڵماس و زێر و زیو و باقری زەرد دروست دەکرێت.

**جۆرەکانی گوارە**

قەبارە و فۆرمی گوارە یەک دەست نییە. بچووک و گەورە و درێژ و کورت هەیە.

**کرمۆکە** ـ جۆرە گوارەیێکی سێ گۆی بچووک و پیرۆزەیێکی شینی لە ناوەڕست قایمکراوە (وێنەی ١١٤). ئەمەیان بە گوێی ژنانی بەتەمەن دەبێندرێت.

هەندێک لەو جۆرە گوارانەی کە جاران بە گوێی ژنانەوە دەبێندران و ئەوڕۆ لە مۆزەخانە بۆ تەماشاکردن داندراون یان لە ماڵان لە قوتووان، بۆ یادگاری هەڵگیراون، ئەمانە بوو: گوارەی بە کاریتەی سێ گۆ. گوارەی بە کاریتەی پێنج گۆ.

**خەزێم (لوتەوانە)** ـ ژنانی بەتەمەن خەزێمێکی زێڕ یان زیو و گەنجەکانیش (ئەوانەی لە دوو مۆدەن) خەزێمێکی بچووک بە قەدەر دەنکە نیسکێک، لە کەپوویان (لوت) دەکەن.

**ددان** ـ کیفێکی زێڕ یان زیو یان کانزایێکی زەردی بریقەدارە. بۆ جوانی لە کەرپ هەڵدەکێشرێت. هەندێ کەس، تاخمی ددان لە زێر دەکات.

**ژێرچەنە** ـ زنجیرێکی درێژە. ئەم سەر و ئەو سەری، بۆ راگرتنی کڵاو، لە رۆخی کڵاو قایم دەکرێت. کاتی لەسەرنان دەخرێتە ژێر چەنەگەوە. ژێرچەنە لە زێڕ و لە زیو و قوماش دروست دەکرێت.

**حێل و مێخەک** ـ ملوانکەییێکی زنجیر ئەستووری درێژە. سەرەکانی ئاوەزینەیە، بۆ لەمل کردن، تێک هەڵدەکێشرێت. قاشەکەی بەردێکی روونی رەنگ رەش یان قاوەیی سپی پاتی مەیلەو درێژووکانییە و پشتەکەی لە زێڕ گیراوە پێنج دانە چاپالوی سەر بە لیرەی بچووکی پێوەکراوە. زنجیرەکە چەند باوی و قۆزاغەی پێوەکراو (وێنەی ١١٥).

**میگڵاد** ـ جیاوازی لەگەڵ حێل و مێخەکدا لە قاشەکە دایە. هی ئەمەیان هەمووی زێڕە و هی ئەویان ناوەکەی بەردێکی بەهادارە.

**گەردەنلغ** ـ پارچە زێڕێکی پارچە پارچەی بچووکی لێک قایمکراوە. شێوەکەی سێگۆشەییە. سەرەو ژێر (سەر بۆ خوارەوە و بن بۆ سەرەوە) لە مل دەکرێت. دوو زنجیر یەک لەم رۆخ و یەک لەو رۆخ قایمکراوە. سەری

زنجیرەکان، بۆ ئەوەی لە مل بخرێت، ئاوەزینەیە و تێک هەڵدەکێشرێت.
**جۆرەکانی گەردەنلخ ــ** هەندێک لە جۆرەکانی گەردەنلخ ئەمانەن: رواندزیانی (وێنەی ١١٦). کۆیەیانی (وێنەی ١١٧). خەلیجی (وێنەی ١١٨).
**گەردەنە ـ** ملوانکەیێکی زیڕە. حەفت دەنکە فرمێسکی بە ریز پێوەکراوە. دەنکەکان یاقوتی رەنگن و لە زێڕ گیراون.
**مەلوانکە ـ** مەبەست گشت ئەو خشڵانەیە، کە بۆ جوانی، ژنان بە گشتی و گەنج بە تایبەتی، لە ملییان دەکەن و بەسەر سنگیان شۆڕدەکەنەوە. ملوانکە لە ئەڵماس و زێڕ و زیو و کارەبا و مۆری باغە و شووشە و زەنگیانە و سۆتەک و قەنەفر(مێخەک) و هاوشێوەکانی دروست دەکرێت. هەندێک لە جۆرەکانی ملوانکە ئەمانەن.

**لەپکە**

لەپکەیێکی شینی لە زێرگیراوە و بە زنجیرێکی باریک، بۆ چاووزار، لە مل دەکرێت.

**ملوانکەی پێنج لیرەیی**

لیرەیێکی ئوسمانی(رەشادی) یە و بە زنجیرێکی زێڕ وەکراوە و لە مل دەکرێت و بەسەر مەمکان شۆڕدەکرێتەوە.

**زنجیر**

مەلوانکەیێکی باریک یان ئەستورە لە زێڕ یان زیو دروستکراوە. میدالیەیەکی ـ پیت، دڵ، ئالای کوردستان، نەخشەی کوردستان ـ بۆ جوانی پێوەکراوە.

**قۆردین**

زنجیرێکی دوو مەتر درێژە. سەرەکانی بە ئاوەزینە لێک قایم دەکرێت.

**شیلانە**

ملوانکەیێکی درێژە و پێنج قۆزاغەی بەقەدەر یەک گەورە و دوور لەیەک پێوەکراوە. قۆزاغەکان بەردێکی رەنگ سوورە و لە زێڕ گیراوە.

**ب . دەست و پێ**

مەبەست ئەو خشڵانەیە کە لە قۆڵ و پەنجە و گۆزینگ دەکرێن و لە زێڕ و زیو و پلاتین و باغە و مۆری دروست کراون. هەندێک لە خشڵی دەست و پێ ئەوانەی خوارەوەن.

**سەعات** ـ ئەمەیان بۆ زانینی کات، لە دەستی چەپ دەکرێت. سەعاتی ژنان کەمێک لە فۆرم و قەبارە لە هی پیاوان جودایە.

**ئەلقە** ـ ئەمەیان دوای شووکردن، بۆ ئەوەی لە کچان جودابکرێتەوە. لە پەنجەی مامەلینچک دەکرێت. ئەلقە بۆ ژنان نیشانەی بە شووبییە و بۆ پیاوان نیشانەی بە ژنییە.

**ئەنگوستیلە (ئەموستیلە)** ـ یەک دوو دانە لە پەنجەی مامەلینچکی (براتووتە) دەستی ڕاست و چەپ دەکرێت. ئەنگوستیلە، بۆ ئەوەی لەگەڵ ئارەزووی ژنان لێک بێت ، بە فۆرمی جۆراوجۆر دروست دەکرێت (وێنەی ١١٩).

**بازن** ـ ئەمەیان بازنەیی و دوو سانتیمەترێک ئەستوورە. لە باسک دەکرێت. جۆرەکانی بازن ئەمانەن:

زێڕ ـ سێ یان شەش دانە لە باسکی دەستی چەپ دەکرێت. بازنی ژنانی دەوڵەمەند لە هی ژنانی هەبوون، ئەستوورتر و پانترە (وێنەی ١٢٠).

زیو ـ هەندێ ژن لەبەر نەبوونی و ئارەزوو نەکردنی زێڕ، چەند دانە بازنی زیو لە شوێنی بازنی زێڕ لە دەست دەکات.

باغە ـ ژنانی کەم دەرامەت، لە شوێنی زێڕ و زیو، چەند دانە لە بازنی باغەی ڕەنگاوڕەنگ، ژنە بەتەمەنەکان ڕەش، و باریک لە شوێنی بازنی زێڕ یان زیو لە باسکی دەستی چەپییان دەکەن.

ژنان پەنجا ساڵێک بەر لە ئەوڕۆ ئەنگوستیلەی شاخیان لە پەنجە دەکرد و بازنی شاخ و شوشەیان لە دەست و قۆڵ دەکرد.

**پاوان** ـ ئەمەیان لە مەچەک دەستی چەپ دەکرێت و بەسەر پشتە دەست بۆ لای پەنجەکان شۆڕ دەکرێتەوە (وێنەی ١٢١).

**حەسیر** ـ ئەمەیان لە قۆڵی چەپ دەکرێت و بە ئاوەزینە قایم دەکرێت (وێنەی ١٢٢).

**سەباحیە ـ** چواردانە ئەنگوستیلەیە هەر یەکەیان لە پەنجەیێک دەکرێت و بە زنجیر لە دلمجی مەچەک قایم کراوەن.

**خرخـار(خڵخـاڵ. پاوانـە) ــ** ئەمـەیان بازنـەیی و پێـنج سـانتیمەترێک ئەستوورە. سەرەکانی، بۆ ئەوەی لە کاتی لە پێکردن و لە پێکردنەوە پێی ئەزیەت نەدات، لەسەر شێوەی گۆ کراوە. خڵخاڵ دوو تاکە، یەک لە گۆزنگی پێی ڕاست و یەک لە گۆزینگی پێی چەپ، دەکرێت(وێنەی ۱۲۳). خڵخاڵی پەنجا ساڵێک لە مەوبەر، بۆ ئەوەی لە کاتی رێکردندا، دەنگی بهاتایە، پلپلەی بچووکی سێ گۆشەیان پێوە دەکرد. ئەورۆ ئەو دەنگە لە خڵخاڵ نایەت.

#### پ . سنگ و کەمەرە

خشڵەکانی سنگ و بەرۆک، ئەگەر لەوانەی سەر و مل زیاتر نەبێت، کەمتر نییە. هەندێک لە خشڵەکان ئەوانەی خوارەوەن:

**پاشەسـەرە ــ** ئەمـەیان بـە ئەسڵ لـە مێزەر قـایم کـراوە و دواتـر بـە سـنگ وەکراوە. پاشەسەرە نەخشی جۆراوجۆری هەیە(وێنەی ١٢٤).

**ئاشـق بەنـد ــ** ئەمـەیان بەسـنگ وەدەکرێت. هەنـدێ زاوا بـۆ دەسـتگیرانە کانییان دەیکەن(وێنەی ١٢٥).

**قایش ـ** ئەمەیان لە کەمەرە دەبەسترێت. زۆربەی کچان کاتی شووکردنیان داوای قایش(وێنەی ١٢٦) لە زاوا دەکەن.

**لولەبەند (سلاحلخ) ـ** ئەمەیان وەکو رەختەی فیشەک وایە. وەلـێ لە ملـەوە بۆ پەراسووی چەپ بە خۆ وەدەکرێت (وێنەی١٢٧).

#### خشڵ خواستنەوە

ژنی کورد، هەر بۆ ئەوەی لە شایی و ئاهەنگ جوان بێتە بەر چاو و سەرنجی دەوروبەری بۆ خۆی رابکێشێت لە خواستنەوەی خشڵ لە کەسوکار و ناسیاو و دراوسی بۆ چەند کاتژمێران سڵ ناکات. بە نموونە، بەشی هەرە زۆری ئەو خشڵانەی خوێندکارانی پۆلی چواری کۆلێژەکان کە

لە ئاهەنگی دەرچوندا بە خۆیانەوە وەدەکەن لە دایک و پلک و بوک و دراوسێ خواستراونەتەوە.

**دووەم. خشڵی پیاوان**

ئەمەیان بە مەبەستی کات بەسەر بردن و جوانی و چاو نەترس و ئازا و قەبوڵ نەکردنی غەدر و پاراستنی سەروسامان، پیاوان بە دەست دەیگێڕن و لە پەنجان دەیکەن و لەبەر پشت رادەکەن و لە قەد دەبەستن و، بەو دوایانەش لە مل دەکەن. ئەمانەی خوارەوە هەندێک لەو خشڵانەن کە ئەمڕۆ پیاوانی کورد بەکاریان دێنیت.

**تەسبێح**

بەناوبانگترێن خشڵی پیاوی کوردە. تەسبێح ئەوڕۆ، بە مەبەستی تەزبێحات و خۆ غافراندن و جوانی، بە دەستی ژمارەێکی زۆر لە پیاوان و گەنجانی کوردەوەیە. تەسبێح، لە یەک ئیمام و دوو مەمک و چەند قلەتەسبێحک (سی و سێ. نۆهەت و نۆ. سەد و پەنجا) و هەندێ جار گوڵینگێک پێکهاتووە. تەسبێح دوو جۆرە:

**ء. مادە ـ** جۆرەکانی تەسبێحی مادە، جۆراوجۆرن. هەندێکییان ئەمانەن: کەهرەب (روسی و ئەڵمانی). کەرمان. توراب کەهرەب. سەندەلوس (نەجەفی ئەڵمانی). فایبەر. پۆلیستەر. پلاستیک. شەوە. پیرۆزە. ئەبەنووس. عاج. یوسر. جامی تەیارە و ..... هتد.

**ب. قەزوان** ـ جۆرەکانی تەسبێحی قەزوان، جۆراجۆرن. هەندێکییان ئەمانەن: ئەبڵەق(بەرزنجە). بەرەدار(پان. خرۆکی سۆر. خرۆکی قاوەیی). چامە. سادە. شێخ مەمەند. قەلەخۆرە. لاسۆرە( رەش. سۆر). نەرجیل و ..... هتد.

**ئەلقە**

ئەمەیان بە زۆری لە زێڕ دروستکراوە. کوڕ و کچی بە دەستگیران ئەلقەی لە پەنجەی مامەلینچکی(براتووتە) دەستەڕاست دەکەن. ژنی بە مێرد و پیاوی بە ژنیش لە پەنجەی مامەتووتەی دەستەچەپ دەکەن. لەو

ساڵانەی دواییدا، لە جیاتی تاقە ئەلقەیێک جۆتێکی پێک وەنووساو، لە مامەلینچکی دەستەچەپ دەکەن. ئەلقە، بۆ ژن و پیاو، نیشانەی خێزان دارییە.

**سەعات**

ئەمەیان بۆ زانینی کات هەڵدەگیرێت. دوو جۆرە سەعات هەیە.

**ء. سەعاتی دەستی** ـ ئەمەیان بە قایشی پێستە ومشەما و زنجیری ئەلەمنیۆم و زێڕ و شتی دیکەی لەو بابەتانەوە لە باسکی چەپ دەکرێت. تاکتاک خەڵک لە باسکی ڕاستییان دەکەن.

**ب. سەعاتی باخەڵ** ـ ئەمەیان خرە و قەپاغی بۆ کراوە. زنجیرێکی لە..... و هاوشێوەی لەگەڵدایە. سەرێکی زنجیرەکە لە کونی قۆپچەی کورتەک قایم دەکرێت. سەرەکەی دیکەی لە سەعاتەکە دەخرێت. سەعاتەکە دەخرێتە ناو کیفی سەعات کە لە مەخمەل و هاوشێوەی دووروواوە. ئینجا دەخرێتە بەرکی سەعات لە کورتەک و شەرواڵ و رانکوچۆغەردا.

**ئەنگوستیلەی پیاوان**

ئەمەیان لە زێڕ و زیو و ستیل و هاوشێوەکانی دروستکراوە و، لە پەنجەی مامەلینچکی دەستە چەپ یان ڕاست و چەپ بۆ جوانی لە پەنجە دەکرێت. گەنجەکان، بە چاو لە گەنجانی ئەوروپا کردن، لە سەرەتایی نۆهەتەکانەوە ئەنگوستیلەی بە فۆرم جۆراوجۆر و لە ستیل دروستکراو لە پەنجەکانییان دەکەن.

**کیسەی توتن**

ئەمەیان لە قوماشی چیت و شتی دیکەی لەو بابەتەوە دەدورێت. جغارەکێشەکانی بە تەمەن توتنی خۆمانی تێ دەکەن و لەبەر پشتێنی رادەکەن. کیسەی توتن، ئەگەر چی باوی نەماوە، لای هەندێ پیاوی گوندەکانی نێوچەشاخاویەکان وەکو گوندی هەرتەل (احمد ....) لە ناحیەی حاجیاوا و گوندی سولاخ لە ناحیەی شنگاڵ وشوێنی دیکە ماوە.

